غولامڕەزا ئیسماعیلی

# بکوژان دەگریێن



وەرگێڕانی لە فارسییەوە

ئاری سوبحی کۆیی

هەولێر ٢٠١٢

داستانە پۆلیسیەکانی تاوان

# بکوژان دەگریەن

نووسنی

غولامڕەزا ئیسماعیلی

وەرگێڕانی لە فارسیەوە

ئاری سوبحی کۆیی

بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

ناوی کتێب: بکوژان دەگریەن

نووسینی: غولامڕەزا ئیسماعیلی

وەرگێڕانی لەفارسییەوە: ئاری سوبحی کۆیی

نەخشەسازی ناوەڕۆك: نەورۆز جمال

نەخشەسازی بەرگ: ئامانج ئەمین

چاپی یەکەم، بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری - هەولێر/ ٢٠١٢

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٧٩٨) ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە

# پێرست

# پێشەکی نووسەر

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
للكتب (كوردى ، عربي ، فارسي)

خوایە سوپاسگوزارم کە لەگەڵ ڕووبەڕوو بوونەوەی گرفتە سەرسامهێن و نیگەرانیەکانی ژیان و گوزەران لە پەناو پێچی ڕۆژگار پاش ساڵانێك هەوڵ و کۆشش، سەبرو پایەداری و هۆگری بۆ فەرهەنگ و ئەدەبی دێرینەی وڵاتمان تەمەنێکت وەك خەڵات بە من بەخشی بۆ چاپی کتێبەکانی داستانی (مکافات وامشب دامادی میمیرد) قەڵەم بگرمە دەست و کتێبی داستانە پۆلیسیەکانی تاوان (بکوژان دەگریەن) بە چاپ بگەیەنم، هەڵبەتە ئەم نووسراوانە بەرهەمی ساڵانێکی درێژی شەوو ڕۆژانەمە کە بە تێپەڕینی کات نزیکەی سەد داستانی کورت و درێژ لە حیکایەتە واقعیەکان لەبارەی تێوەگلان لە تاوان و گوناه لە ڕووداوە چارەنوسسازە تاڵ و شیرینەکانی ژیاننامەی ئەو کەسانەی ویستبێتیان یان نا لە هەورازو نشێوی تۆفانی پڕ لە شەپۆلی شێتی ڕۆژگار دووچاری لادانی تاوانبارانە بوونەو ساڵانی تەمەنیان بەباداچووە و بێهوودە لە پشت شیشە پۆلایینە سارد و ئاسنینەکانی زیندان بەسەریان بردووە، هەموویانم کۆکردوونەتەوەو جارێکی دیکە نووسیومنەتەوە، بەداخەوە چەند زۆرن ئەو مرۆڤانەی کە بە نوقم بوون لە حەزی دەروونی شەیتانی و ئارەزووە چڵکەییەکان سواری سەر پشتی شەپۆلی هەستەکان دەبن تا لە کەناری بەدبەختی ژیانیان بووکەڵەیەك بگرنە دەست و بۆ تەفروتونابوون و دارمان پەلکێشیان بکەن، ئومێدەوارم لە چیرۆکی ژیانی ئەو کەسانەی کە داستانەکانیان لە کتێبەکانم دەخوێننەوە پەندو ئامۆژگاریان لێوەربگرن بۆ ئەوەی بتوانن بە بڕواو ئیرادەی پۆلایینەوە ڕێگای ژیانتان بدۆزنەوەو سەرمەشقێ لە ڕاستگۆیی و مرۆڤایەتی بن، باوەڕبکەن من لە سەردەمانی خزمەتم بە ئەنقەست کاری پۆلیسی و حەزی توێژینەوە لە ڕووداوو کارەسات و پێ

سپاردنی ئەم جۆرە ئەرکانەم هەڵبژاردو خستە ئەستۆی خۆم تا قووڵایی مەترسیەکان کە بووەتە هۆی بریندار بوون و بەدیلگیرانم لە میانی بازرگانانی مەرگ درك پێ بکەم و تام بکەم، هەمیشە لە شادی مرۆڤەکان منیش کامەران بوومەو لە غەمیشیان دڵتەنگ، لە چەندین دەیەی ساڵانی پێشوو کە دەستم بە پیشەی نووسەری کرد هەوڵمدا بتوانم جێ پەنجەیەکی بەردەوام بۆ ئێوەی ئازیز جێبێڵم و دابهێنم، من بایەخ بە کاریگەری نووسراەکانم و بۆچوونی خوێنەرانم دەدەم و پێمخۆشە کتێبەکانم بە چاوێکی رەخنەگرانەوە تەماشابکرێن، نزیکەی بیست ساڵ دەبێ لە چاپەمەنیەکانی وڵاتم وەکو گەنجانی ئەمڕۆ،گۆڤاری حەوت ڕۆژی ژیان، گۆڤاری رێگای ژیان و، ڕۆژنامەکانی (امین جامعه) و ئاسمانی کرمان و، داستانەکانم بەچاپ گەیشتوون و وەك نووسەرێك بەهۆی بەرهەمەکانمەوە پەیوەندییەکم لەگەڵ خوێنەرانم دروستکردووەو حەزو تامەزرۆیی خۆشەویستانم وایکردووە قەڵەم بگرمە دەست و بۆ هەوادارانم و ئێوەی ئازیزان داستان بنووسم،بەبیرهێنانەوەی ئەم خاڵە زۆر گرینگە کە داستانەکانی ئەم کتێبە چارەنووسی بەشێ لە تاکەکانی کۆمەڵگە دەبێت ئەوانەی ناهێڵن رێزو حورمەتی خەڵکان ئەتك بکرێ،هەڵبەتە شوێنی ڕوودانی تاوانەکانیشیان گۆڕاوە، جێگای وەبیرخستنەوەیە داستانی چل ڕۆژ لەنێو بازرگانانی مەرگ بیرەوەریەکە لە یاران و هاوسەنگەرانم بەتایبەت هاوکاری خۆشەویستم شەهید محەمەد رەسول سەدرەددینی کە لەو هەڵمەتەدا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتدا لەساڵی ۹۷۰ بە پلەی بەرزی شەهید گەیشت و هەردەم یادو یادگارو ئازایەتیەکەی بۆ هەتایە لەنێو دڵمدا هەر زیندووە، نابێ بڵاوکەرەوەی بەرێزو گشت ئەو ئازیزانەی ڕێنماییان کردم بیربچێ حورمەت و سوپاسی بێ پایانم هەیە بۆیان، حەزیشدەکەم بە چەند ڕستەیەکی ڕێ پیشاندەرو ئامۆژگاری مامۆستایان و ڕۆشنبیرانی وڵاتمان لە بارەی

(زمانی خەڵك) ەوە ئاماژەبکەم کە بیروڕای خۆیان خستۆتە ڕوو، کەسێك ئەگەر پێغەمبەربێت لە زمانی خەڵکی ئاسوودە نیە، ئەگەر زۆر کار بکات پێی دەڵێن گەمژەیە، ئەگەر کەم کار بکات پێی دەڵێن تەمەڵە، ئەگەر بەخۆڕایی شتێك ببەخشێ،پێی دەڵێن زێدەڕۆیی دەکات، ئەگەریش هەر کۆیکاتەوە پێی دەڵێن ڕەزیلە، ئەگەر بێدەنگ بێ پێی دەڵێن لاڵە، ئەگەر دەمەوەریش بێ پێی دەڵێن زۆربلێیە، ئەگەر ڕۆژوو بگرێ و شەو نوێژ بکات دەڵێن ڕیاکارە و ئەگەر هیچ کام لەم کارانەش نەکاتن پێی دەڵێن خوانەناسە، بۆیە هەرگیز نابێ گوێ بە ستایش و پیاهەڵدانی ڕووکەشی هەندێ خەڵك بدرێ و جگە لەخوداش نابێ لە کەسی دیکە بترسیت و هەموو کارێك تەنها دەبێ بۆ ڕازیبوونی خوای پەروەردگار ئەنجامیان بدەین.

لە کۆتاییدا بە ئومێدی ئەوەم ڕۆژێ بتوانین یارمەتی لێقەوماوو بێنەوایانێ بدەین کە خووی ئادەمی ئەوان دەرفەتی ئەوەی لێوەرگرتوون تا پێویستیەکانیان پیشانبدەن.

خودایە وابکە سەرەنجامی کار

تۆ دڵخۆشبیت و ئێمەش دەربازکار

# شەیتان ڕۆحی داگیرکردم

هەتاوی بێ تینی پاییزی بە تەواوی هێزەوە هەوڵی دەدا جەستەی ساردی زەوی بە تیشکە لاوازەکانی گەرم بکاتەوەو خۆی پیشان بداتن، بەلأم بە گوڕو تینی بای تورەکە بە گڤەگڤەوە بە نێو لقە بێ گەڵاکانی درەختان دا تێدەپەڕی و بە توانایەکی تەواوەوە سوکایەتی بەهەموو شتێك دەکرد نەدەگەیشت.

هەرلەوکاتەدا لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوکارانم بە ئوتومبێلی پۆلیسەوە گەڕەکی باغە ساردو بێ ڕۆحەکانمان تەی دەکرد، بیرم هێشتا گیرۆدەی ئەو پەیوەندییەیە کە وا ئێمەی بۆ داوێنی شار ڕاکێشابوو: ((سڵاو جەنابی ئەفسەر! خەڵکی یەکێك لە باغدارانی دەوروبەری شارم کە ئەزیەتتاندەدەم، چەند دەقیقەیەك پێش ئێستا بەمەبەستی کاری جوتیاری بۆ یەکێك لە باغەکانمان ڕۆیشتم، چاوم بە تارماییەکی ڕەش کەوت کە بە درەختێکەوە هەڵواسرابوو بە هەڵکردنی توندی با دەجووڵایەوە، کە بۆ پێشەوەتر ڕۆیشتم، بەتەواوی بێباوەڕییەوە وردبوومەوە تەرمی ژنێکە کە وا دەردەکەوت خۆی بەپەتەوە کردووە! لە ڕاستیدا جورئەتم نەکرد لە ترسان کە دەستی لێبدەم، هەر بۆیە بەپەلە پەیوەندیم بە ئێوەوە کرد،))

لە دەنگی لەرزیوی کابرا نیگەرانی و ترس شەپۆلیاندەدا، ناونیشانی باغەکەم وەرگرت و بەبێ وەستان بەڕێکەوتین دیت کە بە دڵە کوتێوە لەبەردەمی باغەکەی پیاسەی دەکردو بێ ئارامانە لە چاوەڕوانمان بوو، بە ڕێنماییەکەی ئەو بۆ ناو باغەکە چووین و بەرەو تەرمی هەڵواسراوی ژنەکە ڕۆیشتم، ژنێ بوو واپێدەچوو سی ساڵ بێت، بەهۆی فشاری گوریسەکەوە ڕەنگی ڕوخسارو دەستەکانی شین هەڵگەڕابوو،بەشێك لە قژی ئاڵتوونی پێشەوەی سەری لە ژێر لەچکە خورییە خۆڵەمیشیەکەی هاتبووە دەرو هیچ ڕوناکییەکی ژیان لە چاوانی قاوەیی و ماتی نە دەدرەوشایەوە، لە دووای هەماهەنگی یاساییەوە بە کۆمەکی هاوکارانم لاشەکمان داگرت و بۆ لێکۆڵینەوەی وردتری هۆکاری مردنەکە بەرەو پزیشکی یاسایی

گواستمانەوە، توێژینەوەی بەپەتەوە بوونی ژنەکە دەستی پێکرد، لەگەڵ کابرای باغدار قسەمانکرد تا سەرە داوی زیاترمان دەستبکەوێ، سەرەتا وای بۆدەچووم کە پیرەمێرد لە مەرگی ژنەکە دەستی هەیە، بەڵام بەدوواداچوونەکان منیان بە یەقین گەیاند کە ئەو هیچ زانیاریەکی لەوبارەیەوە نیە، هێشتاکەش تووشی کۆمەڵێك پرسیارو لێڵی جیاواز لە مێشکمدا بووم، یەکێك لە فەرمانبەران کە تا مەڵبەندی پزیشکی یاسایی لەگەڵ تەرمەکە بوو، خێرا خۆی گەیاندە من و کاغەزێکی قەدکراوی بۆ ڕاگرتم: ((جەنابی ئەفسەر! ئەم پەڕەیە لە یەکەمین ساتەکانی پشکنینی لەشی و گیرفانی لای ڕاستی مانتۆکەی کوژراو دۆزرایەوە و بە ڕاسپاردەی پزیشکی یاسایی بەپەلە بە ئێوەم گەیاند!)) منیش لێم وەرگرت و کردمەوە، نامەکە وا دەرکەوت کە بە خەتێکی شڕە خوێندەواری و ناشیانەو بە خێرایی نووسرابوو، بە جۆرێك کە لە جێ جێی ئەو خەتە داڕزاوییەك دەدیترا، ڕستەکانیشی کورت و سادەبوون: ((باوکی ئازیزم! لەوەی کە تەنها جێتان دەهێڵم زۆر نیگەرانم، بەڵام هەرچەندی بیرمکردەوە نەمتوانی لە بڕیاری یەکلاییکەرەوەی ئێوە بۆ ڕەتکردنەوەی خوازبێنیم سەردەربێنم، ئەو پیاوێکی چاك بوو دەیتوانی خۆشبەختم بکات، بەڵام ئێوە ڕێگری ئەم خۆشبەختیە بوون، هەر بۆیە بڕیارمدا بە خۆکوشتن تا زووتر هەنگاو بۆ لای دایکم و براکەم بنێم و بۆ لایان بڕۆم زیاتر لەمە ئازار نەکێشم، خواحافیز باوکە!)) کچت:سیما

لەبەرئەوەی هیچ ناونیشان و ژمارەیەکی تەلەفۆنی لەنامەکە تۆمارنەکرابوو لێڵی و ناڕوونییەکی زۆر بە دەوریدا دەخولایەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا سەرە دەزووی ڕیشەیی ڕووداوەکە هەبوو، بەبێ وەستان منیش نامەکەم بەمەبەستی پشکنینی پیشەیی بۆ بەڕێوەبەرایەتی هۆشیاری نارد بەڵام خاڵێك کە سەرنجی ڕاکێشام، ئەو گوریسەبوو کە سیما خۆی پێوە هەڵواسیبوو، گەورەیی و ئەستوری گوریسەکەو چۆنیەتی بە لقەوە بەستنی درەخت منی بەم ئەنجامە گەیاند،کە ئەم کارە نابێ ئیشی ژنێ بێ، دەستە ناسکەکانی ژنێك قەد ناتوانێ گوریسێك بەو گەورەییەوە وەها شارەزایانەو وەستایانە بە لقێکی بەهێزی درەختێکەوە کە مابەینێکی زۆری

لەگەڵ زەویدا هەبوو گرێبدات، سیما دەبووایە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە یا کورسییەك لە ژێر پێی خۆی دابنێت، یا ئەوەتا بەسەر دارەکە هەڵگەڕێ و پەتەکە وەها بە وردی ببەستێ، ئەم گریمانەیەش بۆ ژنێك ئێجگار نامەنتیقی و ڕەتکراو بوو

لە لایەکی دیکەوە بە سەرنجی وردترەوە ڕووی زەمینی داپۆشراو بە گەڵا، دەبوو بە پلیشانەوەی ڕێژەیەك لە گەڵا وشکەکان و ئەگەری هەڵکشاوبوونی تەرم بەسەریانەوە پەی ببرێت، وردە وردە خەریکبوو بەم ئەنجامە دەگەیشتم کە ئەم ڕووداوە شتێکی زیاترە لەمەسەلەی خۆکوژیەك و لە کوشتن زۆرتر نزیکە، هەر لەم بیرو خەیاڵانەدابووم کە بێتەلی گەڕۆك زەنگی لێداو یەکێك لە یەکەکان ڕایگەیاند، پیاوێك لەدەوری شەست ساڵەو پەیوەندی بە ئاسایشەوە کردووە و هەواڵی بزربوونی کچەکەی بەناوی سیما ڕاگەیاندووە، بە بیستنی ئەمە بە خۆم و پوختەی نوسراوی بینین و تێڕوانینەکانم بەرەو ئاسایش بەڕێکەوتم، لە نوسینگەی ئاسایش لەگەڵ پیرەمێردی ڕیش سپی ڕووبەڕوو بوومەوە کە پەشۆکان و نیگەرانی لە باڵای داچەکاوو ماندووی دەباری، چاوە بەقووڵداچوو فرمێسکاوییەکانی پەردەیان لەسەر خەم وخەفەتی ناخی لادەبرد، هەر کە داوام لێکرد لەبارەی ونبوونی کچەکەیەوە ڕوونکردنەوەی زیاتر بدات، لێوە بێڕەنگەکانی لەرزین ولە بارەی قینی پەنگخواردووی دەرونیەوە هێدی هێدی کەوتە قسەکردن:

_ ئەمڕۆ بەیانی کە سیما بۆ دەرەوە چوو، نەیگووت بۆ کوێ دەڕواو چ کارێکی هەیە، منیش هیچم لێنەپرسی، لەبەر ئەوەی دەمزانی وەك هەموو ڕۆژانی دیکە بۆ سەر کار دەڕوات و نیوەڕۆش بۆ ماڵێ دەگەڕێتەوە، لەوڕۆژەوەی کە هاوسەرو کوڕەکەم بەهۆی ڕووداوێکەوە تەمەنی درێژیان بۆ ئێوە جێهێشتووە، هەموو ئومێدی ژیانم لە بوونی سیمای کچمدا دەبینیەوە، هەردووکمان گەلێك وابەستەی یەکتربووین، چونکە کچەکەم کارمەند بوو ناچاربووم چەند سەعاتێك لە ڕۆژدا تەنهابم، بەڵام سێ ژەمەی خواردن پێکەوە لەسەر یەك سفرە دادەنیشتین، ئەمڕۆکەش وەك هەمیشە چاوەڕوانیبووم کەچی سەعات لە سێی دوای نیوەڕۆش تێپەڕی و هیچ هەواڵێکی نەبوو، دڵم کەوتە شێوان و خرت و پرت، خێرا پەیوەندیم

به شوێنی کارەکەیەوە کرد؛ بەڵام هاوکارەکەی خانم حسینی گووتی ئەمڕۆ سیما هەر نەهاتۆتە سەر ئیش، بەم قسانە نیگەرانی و ڕاڕاییەکانم دوو ئەوەندەی دی بوون و نەمدەزانی چیبکەم، ژمارەی مۆبایلەکەشیم ونکردبوو، دووبارە زەنگم بۆ شوێنی کارەکەی لێدایەوە و داوام لە خانم حسینی کرد پەیوەندی بە مۆبایلی سیماوە بکات و وەڵامیشم بداتەوە، بەڵام ئەو زۆر بە بێتاقەتیەوە گووتی کەوا چەندین جار پەیوەندیم پێوەکردووە کەچی هەر داخرابوو، ئینجا پێشنیاری بۆ کردم کە بۆ خزمەتی ئێوە بێم و هەواڵی ونبوونی کچە خۆشەویستەکەمتانپێبگەیەنم، فرمێسکەکانی پیرەمێرد تەواو نەدەبوو ڕووخساری پڕ چرچ و لۆچی تەڕ کردبوو، بە دەستە لەرزۆکەکانی دەستەکانی گرتم و تکاکارانە گووتی:

_جەنابی پۆلیس! سوێندتان بە منداڵەکانتان دەدەم کە کچی ئازیزم بۆ بگەڕێننەوە! چونکە تاکە ئومێدی منە بۆ درێژە دانم بە ژیان، ئەگەر شتێکی بەسەر هاتبێ،،،،

فینگە فینگی گریان لێنەگەڕا قسەکەی تەواو بکات، بە سەبرو پشوودرێژییەوە کە لە تەواوی ماوەی خزمەتم بە کۆمەڵگا بە جلی پۆلیسیەوە فێرببووم، دڵی ئەو پیرەمێردە دڵشکاوەم دایەوەو بەڵێنم پێدا کە هەموو هەوڵی خۆم بخەمە گەڕ تا هاوکاری بکەم و بگەمە ئەنجام،دووایی داوام لێکرد بیر لە پرسیارەکانم بکاتەوە ئینجا وەڵامم بداتەوە:

– مام حاجی! کچەکەتان دوژمنایەتی لەگەڵ کەسێ نەبووە ئەوەندەی ئێوە ئاگادار بن؟!

پیرەمێرد پاش کەمێك بیرکردنەوە گووتی:

– نا، هێندەی من ئاگادارم و دەزانم، ڕەووشت و ڕەفتاری جوانی سیما وایکردبوو کە هەموو لێی ڕازیبن،ئەگەر دوژمنایەتی یا ناکۆکییەکیشی لەگەڵ کەسێ هەبووایە، هیچ شتێکی بە من نەدەگووت،

دووبارە پرسیارم کردەوە:

ئەی باشە کچەکەتان مەبەستی شووکردنی لەگەڵ کەسێکی دیاریکراو هەبووە کە ئێوە لەگەڵ ئەو کەسە ناساز بن، بۆ نموونە خوازبێنییەکی باش و دەوڵەمەند کە زۆر پەیوەست بێ بەو؟!

پیرەمێرد دووبارە کەوتەوە بیرکردنەوە و دووای چەند ساتێك ڕاستگۆیانە گێڕایەوە:

–سیمای بێچارە! لەو ڕۆژەوەی کە بە ڕووداوێکی ترسناك، دایك و براکەی مردن، ئەو تەنهاییەم بە هەموو بوونمەوە درك پێکردو ئەمیش بەڵێنی پێدام کە هەرگیز بیر لە هاوسەرگیری نەکاتەوە، من لەگەڵ بڕیارەکەی ئەو ناکۆك بووم، بەڵام ئەو خۆی ئەمەی دەویست، تێپەڕی، تا ئەو کاتەی ماوەیەك پێش ئێستا تێگەیشتم گەنجێك بەناوی مەنسور بۆ ناو ژیانی کچەکەم هاتووە!کە کرێکارێکی ئاسایی بوو لە تەلارێکی تەواو نەکراوی خوار ماڵەکەمان کاریدەکرد، بە ڕووکەش سیمای دیتبوو، ڕۆژێکیان کە بۆ ئەوەی هەوایەکی تازە هەڵمژم بۆ دەرەوە چووم، مەنسور سەرە ڕێی پێگرتم و بە ئەدەبەوە قسەی لەگەڵ کردم، سەرەتا خۆی گووتی کە باوك و دایکی مردوون و دوو خوشکی گەورەتری هەیە و شوویان کردووە بەڵام لەبەر مەسەلەی میراتی پەیوەندییەکی ساردیان لەگەڵ یەك هەیە، ئەوەندەشی گووت کە جارێك بێوەژنێکی گەنجی مارە بڕیوە بەڵام دووای ماوەیەك بەهۆی جیاوازی سەلیقە و نەگونجانیانەوە لەیەك جودابوونەوە، پاشان لە بارەی پەیوەندییەکەیەوە لەگەڵ سیما قسەیکردو دانی بەوە دانا کە زیاتر لەهەر شتێ ڕەفتارو ڕەووشتی جوان و تۆکمەی سیما سەرنجی ڕاکێشاوەو دەیەوێت بۆ خوازبێنی بێتە پێش و هەنگاو بنێ، بەڵام سیما بەمە ڕازی نیەو هەرگیز بەچاوی پیاوی داهاتووەوە لێی نەدەڕوانی، لە کۆتاییدا داوای لێکردم قسە لەگەڵ سیما بکەم و سەرنجی بۆ ئەم کارە خێرە ڕابکێشم، منیش پێمگووت کە وا بڕیاری کۆتایی لەم بارەیەوە بە دەست کچەکەمە و ناتوانم کۆمەکێکی پێبکەم، هەستمکرد بەم وەڵامەم مەنسور کەمێك بێتاقەت و ناڕەحەتبوو، بەڵام گرینگیم پێنەدا، چونکە هەرچۆنێ بوو من قسەی خۆمم کرد، شەو کە سیما هاتەوە ئەم مەسەلەیەم لەگەڵدا

باسکرد، بەڵام ئەو بە توندی گووتی کە هیچ پەیوەندییەکم بە مەنسورەوە نیە و بەیانیش خۆم وەڵامی نەخێری دەدەمەوە، هەستێك لە ناخمدا پێی دەگووتم کە سیما پێشتر ئەم کوڕەی ناسیوە بۆیە بەمجۆرە پەشۆکاو تێکچوو، بەڵام لەبەر ئەوەی متمانەی تەواوم پێی هەبوو، هەموو شتێکم بەخوی سپارد، لەو ڕۆژە بەدوواوە ئیدی مەنسورم نەدیتەوەو هیچ هەواڵێکیشم لەبارەیەوە نەزانی، ناونیشانی شوێنی کاری مەنسورم لە پیرەمێرد وەرگرت و پێکەوە بۆ شوێنی ساردخانەی نەخۆشخانە بۆ دیتنی جەستەکەی بەڕێکەوتین، بە بینینی تەرمی کچەکەی ئاهو ناڵەی بەرزبۆوەو دەستی بە گریان کرد، بۆیە ئارامیمان کردەوەو لاشەکەمان لە دووای پشکنینی پزیشکی یاسایی بەمەبەستی کفن و شاردنەوەی بە پیرەمێردی دڵشکاوو جەرگ سوتاو دایەوە، سەرەنجام پاش هەفتەیەك لێکۆڵینەوەی شارەزایانەو پشکنینی هەست پێنەکراوی هاتووچۆکانی مەنسور بۆ تەلاری شوێنی کارەکەی، لە خانۆچکەی یەکێ لە گەڕەکە هەژارنشینەکانی شار دەستگیرمانکرد، لە کاتێك دا هەوڵیدەدا جگەرەی گۆشەی لێوی تا کۆتایی بکێشێ، بۆ ئاسایش ڕێنماییمان کردو بردمان، مەنسور وەك هەر گومانلێکراوێکی دیکە لەسەرەتای لێکۆڵینەوەکان تۆمەتی کوشتنەکەی بە توندی ڕەتکردەوە تەنانەت وەهاشی پیشاندا کە ژنێکی بەناوی سیما نەدەناسی، بەڵام کاتێ دۆسیەی بەدوواداچوون وپشکنینم لەلایەن پسپۆڕو هاوکارانەوە لەبەردەمی دانا، ڕەنگی پەڕی:

– بزانە جەنابی مەنسور تەواوی ناوەڕۆکی ئەم دۆسیەیە ئەوە دەسەلمێنێ کە ئێوە لەم ڕووداوەدا دەستتان هەبووە، یەکەمیان: توانای زۆری جەستەیی و ڕوکاری زبریت وەڵامی گەلێك لە پرسیارەکانمان دەداتەوە، بۆ نمونە ئەو گوریسەی کە کوژراوی پێ هەڵواسراوە، هێندە قایم و شارەزایانە بە درەختەوە بەند ببوو کە بە دڵنیاییەوە ئەم کارە تەنها پیاوێکی بە ئەزموون و بەهێز دەرەقەتی دێت، نەوەکو دەستە ناسك و نەرمەکانی سیما کە بەکاری ماڵداری و چێشتخانە ڕاهاتووە، دووەمیان: پزیشکی یاسایی ڕایگەیاندووە کە وا کوژراو بەهۆی

کاریگەری لێدانێکی توندەوە کە بەر پشتی سەری کەوتووە دووچاری خوێن بەربوونی مێشک بووە هەر بەمەش مردووە، پاشان هەڵواسینی سیما بە درەختەوە تەنها سیناریۆیەك بووەو هیچی دی، سێیەمیان: ئەو نامەیەی کە لە گیرفانی مانتۆی کوژراو دۆزراوەتەوە، بە دەست و خەتی یەکێك دەچێت کە شرە خوێندەوارییەکی سەرەتایی هەبێ، لە کاتێکدا سیما خوێندنی بەرزی تەواوکردووە و نوسینی نامەیەکی وەها زۆر دوور بووە لەو، بەهۆی دەرخستنی هاوکارانی سیما و پسپۆرانی لێهاتوو لەم بوارەدا، خەتی نامەکە بەهیچ شێوەیەك بە خەتی سیما ناچێت، چوارەمیان: سیما جگە لە تۆ خوازبێنی دیکەی نەبووە تا ببێتە جێی گومانی ئێمە و تاوانباری بکەین، لەولایەشەوە بەهیچ جۆرێ ئەو ڕازی نەبووە کە لێت نزیك ببێتەوە، ئینجا بە چ شێوەیەك دەتوانرێ داواکاری نامەکە لەگەڵ حەقیقەتی ژیانی وێکبێتەوە و قبوڵبکرێ کە ئەو لەگەڵ تۆ پەیوەندی هەبووە، هەر بەردەوام بم دیسانەکە؟ مەنسور سەری لە نێوانی دەستە زبرو پانەکانی شاردەوەو چەند خولەکێك بە بێدەنگی تێپەڕی، دەتگووت لە خەیاڵی پەرش و بڵاوی نائومێدانە بە دووای ڕێگایەك بۆ ڕاکردن دەگەڕێ، بەڵام وەختێك پەی بە بێهوودە بوونی کارەکەی برد، سەری هەڵبڕی لە کاتێکدا هەوڵیدەدا هێمنیەکەی ڕوخساری بپارێزێ، لێوی بۆ دانپیانان کردەوە:

– گشتی کەمتەرخەمی خۆم بوو، بڕیار نەبوو عاشق بم، چونکە جارێك لە مەیدانی عەشق شکستم خواردبوو یادەوەرییەکی تاڵم لەم بارەیەوە هەبوو، بەڵام کاتێك سیمام دیت، نەمتوانی جڵەوی ترپەی توندی دڵم بکەم، هەموو ڕۆژ بە بەردەم شوێنی کارمدا تێدەپەڕی و منیش چەندین جار بە بیانووە جیاوازەکان سەرە ڕێگام لێدەگرت و چەند قسەیەکم لەگەڵ دەکرد،شێتی ڕەفتاری بە ویقارو لەسەرەخۆو باڵای دڵڕفێنی ببووم؛ چەند هەفتەیەك دوواتر بڕیارمدا مەسەلەی خۆشەویستییەکەم بەبێ پەردە لەگەڵی باسکەم و سەرەتا مۆڵەتی خوازبێنی لە خۆیەوە وەربگرم، بەڵام ئەو زۆر بە توندی بەرهەڵستی پیشاندا و بەوپەڕی تووڕەییەوە داواکارییەکەمی ڕەتکردەوە و نەخوازراوانە هەندێ قسەیکرد بەجۆرێ وەك بڵێی سوکایەتی پێکردنی من بوو،منیش لەلایەکەوە مرۆڤێکی بوغزن و

تۆڵەسێن و نەفام بووم، لەلایەکی دیکەشەوە چاوەڕوانی ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی وەها ساردو سڕم لەلایەن سیماوە نەدەکرد، بۆیە بڕیارمدا بەهەر جۆرێك بێ بە ئامانجم واتە ڕازیکردنی سیما بۆ هاوسەرگیری بگەم، هەربۆیەش مەسەلەی خوازبێنییەکەم لەگەڵ باوکی دا باسکرد ئەمیش بڕیاری کۆتایی لەم بارەیەوە بە دەستی کچەکەی سپارد، سیما دووبارە بۆ سۆراغم هاتەوە، ئەمجارەیان زۆر لە جارەکەی پێشوو توڕەو پەشۆکاوتر بوو، بە دەنگێکی بەرز ڕایگەیاند کە وەڵامەکەی هەر بەمجۆرە نەرێیەو هەڕەشەشی لێکردم ئەگەر ئەمجارە دیسان بەم بیانوەوە خۆی یا باوکی بێزارکەمەوە ئەوا شکایەتم لە پۆلیس لێدەکات، بەڵێ لێرەوە بوو کە پلانی شەیتانی لە بیرو هۆشم دا چەکەرەی کرد،نەخشەی تۆڵەیەکی سەخت تا ئاگری دەروونم دابمرکێنێتەو، سەرەتا هەوڵمدا هەموو شتێك لەبیربکەم، بەڵام شەیتان ڕۆحمی داگیر کردبوو هەموو ساتێك پەنجەی ئەفسوناوی زیاتر بەسەر دڵی زامدارم دادەهێنا، بەیانی ڕۆژی ڕووداوەکە کە بۆ تەلاری شوێنی کارەکەم ڕۆیشتم هێشتا کەس نەهاتبوو، خەریکبوو بیرم لە پلانەکەم دەکردەوە، سیمام بینی لە ماڵ دەرچوو تا بۆ شوێنی کارەکەی بڕوات، لەش و لارە بێگوناهەکەیم توند گرت و سەرە ڕێگام پێگرت،بە تکاو پاڕانەوە داوام لێکرد بۆ ناو تەلارەکە بێت تاکو دووا قسەمان پێکەوە بکەین، ئەگەردیسانەکە ڕازی نەبوو من بۆ هەمیشە لە ژیانی بڕۆمە دەر، سەرەتا بە توندی بەرگری لەخۆیکرد، بەڵام سەرەنجام سەری دانەواندو ڕازیبوو بێت، کاتێ دڵنیابووم کەس نەیدەبینێن بە چەقۆ هەڕەشەم لێکرد تا یەکێ لەم دوو ڕێگایە هەڵبژێرێ، یا مەرگ یا شووکردن بەمن، زۆر ترسابوو بەڵام هەوڵیدا بەسەر خۆیدازاڵبێت، بە توڕەییەوە گووتی وەڵامەکەم هەر بەو جۆرەی پێشوو نەخێرە، لەڕاستیدا ئەم ڕەفتارە پتر جوڵاندمی، هێرشم بۆکردو دەستم لەسەر دەمی دانا تا دەنگی بەرز نەبێتەوە، وە زۆریش سەرسەختانە بەرگری دەکرد و بە هەوڵ و تەقەللا دەیویست هەرچی لە دەستیدێت بەرامبەرمی بکات، بۆیە دەستەویەخەی یەکتر بووین و لەناکاو گازێکی لە دەستم گرت و قیژەیەکی بڵندی لێدا، من کە دیتم بارودۆخەکە خەریکە خراپ دەبێت ئەوەندە توڕەبووم خۆشم نەمزانی چیدەکەم، بۆیە بەرزمکردەوەو بە توندی سەریم بە دیواری چیمەنتۆ داداو دەنگێکی ئەوەندە زۆری لێوەهات

سەداکەی لە ئاسمانی تەلارەکە دەنگی دایەوەو منی ترساند، جەستەی بێ هەستی سیما لەو گۆڕە کەوتبوو هیچ دەنگێك لەلایەن ئەوەوە بەر گوێم نەدەکەوت، لەوساتەدا ترسێکم لێنیشت، ترس لە مەرگی سیماو کوشتنی نەویستراو کە تازە تێوەی گلارابووم، بۆ لای ڕامکردو چەند جارێك بانگم کرد، بەلاّم تەنها وەلاّمی بێدەنگییەکی تالّ بەسەر ژوورەکەدا زالّبوو، غیرەتمدایە بەرخۆم و جەستەییم بۆ لای خۆم هەلّگەڕاندەوە، بەلاّم بە دیتنی ڕوخساری بێ جوولّەو چاوە مات و بێ پرشنگەکانی لە خۆمەوە هاتمە لەرزین، وەختێ دلّنیابووم کار لە کار ترازاوە و لەبەرامبەر تەرمی ژنێکدام و دەکرێ ببێتە جێگای دەردە سەری بۆم، بیرۆکەی پەیداکردنی ڕێگا چارەیەك بۆ دەربازبوون لەم گێچەلّە کەوتە سەرم، یەکەمین شوێن کە بە خەیالّمدا هات، باغەکانی دەوروبەری شار بوو،لاشەکەم لە بەتانیەکدا شاردەوەو بە ئوتومبێل بەرەو یەکێ لە باغاتە دوورە دەستەکانم برد و، ئەوەی ماوە لە ڕووداوەکەش ئیدی ڕوون و ئاشکرایە، مەنسور لە دووای کۆتایی قسەکانی هەناسەیەکی تازەی هەلّکێشاو چاوەکانی لەسەریەك دانا، وەك بلّێی دەنگی زەنگی مەرگ لە ماوەیەکی نزیکدا دەبیستێ، پێدەچوو لەوساتەدا حەز بکا کات بۆ دوواوە بگەڕێتەوە تاکو بتوانێت پێش لە ڕوودانی ڕووداوێکی تالّی لەم جۆرە بگرێت، کەچی بەداخەوە تازە بۆ باش بیرکردنەوەی عاقلاّنە بڕیاردان زۆر درەنگ ببوو، ئێستا ئاسمانی ساردو وەهم ئالّوودی زیندان چاوەڕوانی دەکرد تا بۆ ماوەیەکی کورت مەرگی دووابخات، دنیا لێلّ و ئاسمان تەماوی بوو،خۆر، ڕەنگێکی پەڕیوو بە ژانی هەبوو،داوێنی زەردی لە سیمای شارو مرۆڤەکانی دا کۆدەکردەوە و لە پشت کێوە دوورە دەستەکان پەنهان دەبوو،گۆڕستان وردە وردە خەریکبوو لە ئامادەبوونی خەلّکان خالّی دەبۆوە، بەلاّم پیرەمێردی پشت چەماوە هیچ پەلەیەکی بۆ ڕۆیشتن نەبوو،جەستەی لاوازو گەرمداهاتووی لە پالّتۆی کالّبۆوەو کۆندا پێچرابوو ئێستا لەسەر گۆڕی ڕۆلّە ئازیزەکەی شیوەنی دەکرد، دەستە لەرزیوو بەستووەکانی بەسەر ئەو تاجە گولّینەی کەخاکی گۆڕەکەی داپۆشیبوو دادەهێناو بارانی فرمێسکی بێ پشوو لە ئاسمانی هەوری چاوەکانیەوە دادەباری،

# خوێنمژ

لەیەکێ لە نیوە شەوە تاریدەیەك فێنکەکانی بەهار کە ئاسمان بە سفرەیەکی خاڵی لە مانگ و ئەستێرە خەجاڵەتی بەسەر ڕووی زەوییەوە دەکێشا، پیاوێکی ژیکەڵە لە پەنا تاریکی چڕی شەودا، بە جووڵەیەکی چاپووك و بوێرانە لە دیواری بەرزی خانەی باغەوە بە شکۆوە سەرکەوت و لەسەرەخۆ و پشیلە ئاسا بەولای دیوار لە حەوشەی پڕ دارو درەختی ماڵەکە دابەزی و بۆ چەند ساتێ هەروەکو پەیکەرێکی بەردین لە بێدەنگی ترسهێنی ماڵ وەستاو گوێی هەڵخست، جگە لە سەدای هەڵکردنی هێواشی شەماڵی بەهار و ئاوازی هەماهەنگی سیسرکەکان دەنگێکی دیکە نەدەهاتە بەر گوێ، چاوانی درێژو هەڵۆیی کابرا حەوشەی فراوانی ماڵ و تەلاری بەرزی سەرووی خانەی باغی بە وردی پشکنی، وەختێك لە هێمنی و ئاسایشی جێگاکەیی و بێ مەترسیبوونی بارودۆخەکە دڵنیابوو، هێدی هێدی لە پەنا دیوارەوە خۆی بە تەلارەکە گەیاندو بە هونەرێکی تایبەتەوە کە لە بڕینی سالآنێکی زۆرەوە ئەزموونی کردبوو،بێ دەنگە دەنگ دەرگای چوونە ژوورەوەی کردەوەو بۆ ناوەوەی تەلار ڕۆیشت، بێدەنگی و خامۆشی، کەشێکی وەهم ئەنگێزو نهێنی ئامێزی هێنابووە ئاراوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو کەوتە بیرکردنەوە:

((تاکو ئێرە هەموو شتێك بەپێی نەخشەکەیە،،،هیچ هەواڵێك لە بارەی موراداغا(بازرگانی ناسراوی فەرش) ەوە نیە، هەر بەو جۆرەی کە بیستبووم بۆ سەفەر چووەو ئێستا دەبێ ژن و منداڵی بەتەنهابن، زۆرباشە نە من کارم بەوانە نە ئەوانیش کارێکیان بە منە،،چاترواپە تا درەنگ نەبووە بڕۆم ئیشەکەم ئەنجام بدەم)) جهانگیر بەم خەیاڵە خۆپارێزانەی خۆیەوە خۆی بە هۆڵەکە گەیاند و بە دیتنی پێویستیە گرانبەها و قەشەنگەکان کە ڕوناکیان لەم تاریکییەشدا سەرنجی ڕادەکێشا، زەردەخەنەیەکی شەیتانی نیشتە سەر لێوانی و بێ خۆ دوواخستن بۆلایان چوو، سەعاتی دیواری ماڵەکە سێ جار لێیدا، بۆیە جهانگیر هاتەوە هۆشخۆیی و سەرنجی دا کە زیاتر لە دوو سەعاتە هاتووچۆیەتی بۆ کۆکردنەوەی شتە پێویست و گرانبەهاکان، لەبەر خۆیەوە گووتی: ((ئیدی بەسە! پێویستە

تێتەقێنم تا کێشەیەك نەهاتۆتە پێش،)) ئینجا ویستی بە وریاییەوە لەبەردەم ژووری خەوتن کە پردیس خانم هاوسەری گەنجی موراداغا منداڵە شیرەخۆرەکەی لەباوەشگرتبوو کەوتبوونە خەوێکی قووڵەوە تێپەڕێ کە دەنگی گریانی ساواکە لەرزینی خستە گیانیەوەو وەها سەری لێشێوا بوو تا قاچی بەر گوڵدانێکی کریستاڵ کەوت و سەدای شکانی گوڵدان لە هەموو ماڵەکە دەنگی دایەوە و پردیس کە تازە بە دەنگی گریانی منداڵەکە لەخەو بەئاگاهاتبۆوە لە جێگاکەی ڕاپەڕی، پردیس لەوکاتەدا هەموو گیانی بوو بە گوێ، دڵنیابوو لەوەی کە سەهوو نیە و دەنگی شکانی شتێکی بە ئاشکرا بیستووە، ئا لەو ساتەدا ترس و تۆقین وەکو چزووی دووپشکێك بەسەر دڵیەوە دەدا، منداڵەکەی هەر بەوجۆرەی کە دەگریا هەڵیگرت و بە سینگی خۆیەوە نووساند، وەختێ منداڵەکە نووست، لە نێو نوێنەکەی هاتەدەرو بە هەنگاوە لەرزۆکەکانیەوە بۆ لای دەرگای ژوورەکە چوو، هێشتاکە تۆزێکی مابوو بگاتە دەرگاکە کە سێبەری ترسناکی تارماییەکی زل لە چوارچێوەی دەرگاکە دەرکەوت، لە ترسا زمانی بەسترابوو، هەستیکرد منداڵەکە لە ئامێزی سەنگینی دەکات، چەند هەنگاوێك بۆ دوواوە ڕۆیشت و منداڵەکەی قایمتر لە پێشوو بە سنگیەوە نووساند، بە زەحمەت توانی بپرسێت: ((ت،،،تۆ کێی،،،کێی؟!)) بەلأم تارماییەکە بەبێ سەرنجدان لە دەنگی لەرزۆکی پردیس بۆ لای هات، پردیس بە دیتنی بریسکەی شتێکی بڕەر لە دەستەکانی کابرا بۆنی مەترسییەکی هەست پێکردبوو،بڕیاری کۆتایی خۆیداو لەناکاو بە دەنگێك کە لە قوولأیی بوونیەوە هەڵدەستا قیژاندی و داوای کۆمەکی کرد،تارماییەکە خێرا خۆی گەیاندێ و شتێکی نووك تیژی لە سینەی ژنی بێچارە ڕاکرد، سەدای قیژەی یەك لە دووای یەکی پردیس سات بە سات بەرزترو دڵ ڕووشێنتر دەبوو لەگەڵ دەنگی گریانە پڕ کرووزانەوەکانی وەکو منداڵەکەی کە لە شیر مژین وەستابوو، دەبوو بە یەك، بەلأم پاش چەند ساتێك کابرای نەناس بە مەبەستی مردن ئەم شتە نوك تیژەی چەند جارێك لە جەستەی دایك و ڕۆڵەکەدا، هاوارە پڕ پاڕانەوەکان خامۆشبوون و لاشەی نوقمی خوێنی پردیس و منداڵە بێ گوناهەکەی لە پێخەفدا

گەوزین، جهانگیر لە ناکاو هاتەوە سەر هۆش و خەیاڵ، سەرەتا نیگایەکی تۆقیوو حەپەساوی بە تەرمی بێ گیانی دایك و ڕۆڵەی لە خوێندا گلاراودا گێڕا و پاش ساتێ تەماشایەکی بێباوەڕانەی لە هەردوو دەست و لەشی خوێناوی خۆی کردو سەرێکی وەك هێمایەك بۆ پەشیمانی بادا، وەك بڵێی تازە پەی بە قووڵی تاوانێکی ترسناك دەبرد کە بۆ مەبەستی سەرکەوتن لە دزیەکەی ئاوێتەی ببوو، یەکەمین بیرۆکە کە بە خەیاڵی داهات، ڕاکردن لەم شوێنە مەترسیدارە بوو، بەپەلە کیسەی پڕ ئاڵتون و گەوهەرە گرانبەهاکانی بە کۆڵی داداو لە کاتێکدا کە هەزاران بیرو خەیالات هێرشیان بۆ مێشکی هێنابوو ماڵەکەی بەجێهێشت، ئەو تاوانەی بەمن و هاوکارانم ڕاگەیەنرابوو دڵتەزێن ترو ورووژێنەرتر بوو لەوەی کە وێنام دەکرد، لە ماڵێك دا بە هەموو جوانیەکەوە غەم و پەژارە لە دارو دیوارەوە دەباری، منداڵی شیرە خۆرە بەبێ هیچ دەنگێك لە باوەشی خوێنینی دایکی بۆ خەوێکی هەمیشەیی ڕۆیشتبوو،دیمەنی دڵ پووشێنی کوشتن، دڵی هەموو کەسێك بەژان دەهێنێ و نەخوازراوانە فرمێسکی دەکردە میوانی چاوەکان و ئەم پرسیارە لاڵ و بێ وەلامەی دەهێنا کایەوە کە کامە بکوژی دڵڕەق و خوێنمژ جورئەتی کردووە دەست لە تاوانێکی وەها بدات، وە ئایا دایك و ڕۆڵەکەی بە کام گوناهە کوشتونەو بەم ڕۆژەی گەیاندوون؟

بەگوێرەی ئەرکی یاسایی پشکنین و لێکۆڵینەوەی وردمان لە ماڵی مورادئاغا ئەنجامدا، لە یەکەم هەنگاودا پرسیارو گەڕان و توێژینەوەمان لەگەڵ دراوسێکاندا کرد چونکە بەخێرایی خۆیان بە شوێنی ڕووداوەکە گەیاندبوو، ئەوان وایان دەرخست کە بە مەبەستی بیستنی قیژەیەکی جەرگبڕو هاوارەکانی ((کۆمەك کۆمەك)) ی هاوسەری مورادئاغا، بە مەترسیەکە وریابوونەتەوەو لە ماڵەکانیان دەرپەڕیون، بەڵام جێی داخە دەرگای چوونە ژوورەوەی خانەی باغەکە داخرابووەو بە هاوکاری هێزی زێرەڤانیەوە کردوویانەتەوەو بە سۆراغی پردیس خانمەوە چوون، بەس هیچ پاشماوەیەکیان لە بکوژەوە نەدیوە بەڵکو ڕووبەڕووی تەرمی دایکێك و منداڵەکەی بوونەتەوە، لە هەمان کاتدا دراوسێکان لە پەیوەندی

عاشقانەی مورداداغا و پردیسەوە قسەیان دەکرد و هەموو جۆرە ناکۆکیەکیان لە بارەیانەوە ڕەتدەکردەوە، بەڵام لە دوژمنان و بەدخوازانێ کە ڕەنگە بۆ مەبەستی کینە و تۆڵە دەستیان بە خوێنی ئەم کوشتنە سووربێ بێئاگایی خۆیان ڕادەگەیاند، لەساتی دوواتر مورداداغا بە بیستنی هەواڵی مەرگی هاوسەرو منداڵەکەی، بێ وەستان خۆی بە ماڵێ گەیاندەوە و فرمێسکی بێوچانی دەڕشت و بە سەروچاوی خۆیدا دەکێشا، داوامليکرد هێمنی خۆی بپارێزێ و لە دۆزینەوەی بکوژان هاوکاریمان بکات، بەڵام مورداد لە دۆخێکی ڕۆحی ئێجگار بزواردا بوو بە کەڵکی ئەوە نەدەهات داوای یارمەتی لێبکرێ، لەهەمان کاتدا کە بۆ دۆزینەوەی سەرە داوێ لە ڕووداوەکە مابوومەوە، یەکێ لە کارمەندان لێم نزیك بۆوەو قونچکی جگەرەیەکی کە لە ڕاڕەوی کۆتایی بۆ ژووری خەوی پردیس دۆزیبۆوە پێ نیشاندام، بوونی فلتەری جگەرە ئەم گومان و خەیاڵەی کە پیاوکوژ لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکە خەریکی جگەرە کێشان بووە،بیرو هۆشمی بەهێزکرد بە تایبەتی لە بارەی مورادەوە چونکە ئەو پەیوەندییەکی بە جگەرەو کەرەسەی بێهۆشکەرەوە نەبوو، بەبێ دوواخستن فلتەری جگەرەکەمان بۆ شیکردنەوەو تاقیکردنەوەی لیکی دەم و دوواییش بۆ بەشی تاقیگای تاوان نارد و لەگەڵ سەرنجدان بە دڵ ڕووشان بوونی تاوانەکە لێکۆڵینەوەی بەربلاو ئەنجام وەردەگرێت، بکوژ یا بکوژان سەرەڕای کوشتن، بە پشت بەستن بە قسەکانی مورداداغا تاوانی دزیشیان ئەنجام دابوو، لە ڕێی زانیاری بەدەستهاتووی سەر دەسکی دەرگای ژوورەکان، مێزو کورسیەکان ئەوە سەلمێنرا بوو کە هەردوو تاوانی کوشتن و دزی یەك کەس ئەنجامی دابوون، وە بە ئاشکرا کردنی بەڵگەی پزیشکی یاسایی بکوژ بۆ کوشتنەکە لە تەنێکی برەری وەك چەقۆ یان تیغی ڕایەخ برین کەڵکی وەرگرتبوو، نزیکەی بیست و یەك ڕۆژ لەم ڕووداوە تاڵ و نهێنی ئامێزە تێپەڕی و لێکۆڵینەوە و سانسۆرە ئاشکراو نائاشکراکانی کارمەندانی پڕ هەوڵی فەرمانگەی هۆشیاری و بەشی تاوان هەربەم جۆرە بەردەوام بوو، ڕۆژێکیان لە ڕێگەی چەند پەیوەندییەکی تەلەفۆنی ئاگادار کراینەوە کەسێ بە ناوی جهانگیر

ناسراو بە کوللە لەو دزانەیە کە پێشینەی لەم بارەیەوە هەیە و ئاشنایەتیەکی باشی لەگەڵ دادگایی کردن و چەند جار گیران و شیشە پۆلاینەکانی ساردی زیندان دا هەبووە، ماوەیەکە بە جۆرێکی باش لەبارەی سامانیەوە سوودمەند بووە کارەکانی زۆر بە شك و نهێنیەوە ئەنجام دەدات، بۆیە ئێمەش خستمانە ژێر چاودێرییەوە و سەرەنجام درکمان بەوە کرد کە جهانگیری کوللە برێکی شیاوی جێی گومان لە ئاڵتون و گەوهەرە گرانبەهاکانی بۆ لای زەڕنگەرێکی شاری بردووە بۆ فرۆشتنیان لەم ڕێگایەشەوە پارەیەکی زۆری قازانج کردووە و چەند پارچەیەك لە ئاڵتوونەکان بەهۆی یەکێ لەو کڕیارانەی کەماڵی دزی دەکرێ و دەفرۆشێتەوەو لە جهانگیری کڕیوە ئاشکرا دەکەین، داوامان لە مورادئاغا کرد بۆ ناسینەوەی ئاڵتون و گەوهەرەکان لەگەڵمان بێت و ئەمیش لەگەڵ ئەوەی تازیەبارە بەلام قبوڵی دەکات، بە یەکەمین تەماشا دەیانناسێتەوە و لە کاتێ کە فرمێسك لە چاوانی قەتیسمابوو بەمنی دەگووت: ((ئەم ئاڵتون و گەوهەرانە هی پردیسن جەنابی ئەفسەر! وە دڵنیاشم لە ناسینەوەی ئاڵتونەکانی ژنەکەم سەهووم نەکردووە! خۆزگە ئەم بکوژە خوێنمژە تەواوی سەروەتمی بە تالان دەبرد بەلام خوێنی هاوسەرو منداڵەکەمی نەدەڕشت،)) کڕیار بەپێی یاسا دەستگیر دەکەین و دەیخەینە ژێر چاودێرییەوە، لە ڕووەوە موراد سەرە داوێکی چاکی بۆ سەرەتای توێژینەوەی تازە بە ئێمە دا خۆشحاڵیش دەبین بە هاوکاری کڕیارەکە جهانگیری کوللە بناسێتەوەوئینجا بە قۆڵبەسراوی بۆ بەڕێوەبەرێتی هۆشیاری دەهێنین، جهانگیری کوللە لە سەرەتادا هەموو جۆرە پەیوەندییەکی نێوان خۆیی و تاوان و دزیەکەی ڕوویداووە لە ماڵی موراد بەدرۆ دەخستەوە کاتێکیش لەبارەی زێڕو گەوهەرەکانەوە لێماندەپرسی، لەسەرەخۆ دەیگووت: ((خۆتان لە پێشینەی زیندانی بوونم ئاگادارن! لە ڕۆژگاری دیل بوونم لەوێدا بە غولام گول ناوێك ئاشنا بووم کە لە ناوەوە کاری دەلاڵی گەوهەرەکان بوو لە پاش ڕزگاربوونم، ئەم ئاڵتون و گەوهەرانەی لەوم وەرگرت فرۆشتم، بەلام تا ئەو جێگایەی من ئاگادارم ئێستاکە

ئیدی ئەم پیاوە ئەفغانیە لە ناوەوەی ئێران دا نیە و بۆ ئەفغانستان گەڕاوەتەوە،هیچ قسەیەکی دیکەشم نیە !))

جهانگیر بەجۆرێکی کاتی و تا ڕوونبوونەوەی وەڵامی تاقیگای تاوان بە هەماهەنگی داوەری، قۆڵبەستی دەکەین و چەند ڕۆژێ دوواتر کە لێکۆڵینەوە ئامادە دەبێ و بکوژمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە بە ڕاستی جهانگیرە، دووبارە لە ژووری لێپرسینەوە لەگەڵی ڕووبەڕوو بوومەوە و لە کاتێکدا کە بەڵگەی وەڵامی تاقیگەی لیکی دەمم لە بەردەمدانا بە زەبرو زەنگیەوە گووتم: (( تەواوی بەڵگە بەدەست هاتووەکان ئەوە دەسەلمێنن کە تۆ لەم تاوانە گەورەیەدا تۆمەتباری پلە یەکی! بۆ نموونە ئەو لیکەی کە بەسەر فلتەری جگەرەکەوە بە جێمابوو لەگەڵ گروپی خوێنی تۆ پیشانی دەدا، بۆیە لەمە زیاتر لاساری و بێ ئاگایی مەکە و دەرمەبڕە و دانیپێدابنێ،)) جهانگیر کە هەموو ڕێگاکانی بە داخراوی لە بەردەمی خۆیدا دەدیت،سەری داگرت و بە توڕەییەوە دەیگووت: (( نەمدەویست کارێکی وەها ترسناك ئەنجام بدەم و دەستم بە خوێنی مرۆڤێکی بێگوناه سوور بکەم، ئەو ژن و منداڵەشیرە خۆرەیەی کە توانای بەرگریشیان نەبوو، بەڵام کاتێ دەنگی گریانی کۆرپەکە هەموو ئارامیەکی لێشێواندم و وەکو ئاژێرێکی ترس لەرزاندمی، بۆ بەدبەختی ئەو تۆزە جگەرەیەی کە ئێستا کەوتۆتە بەردەستی ئێوە، لە زارم دەرپەڕی لەو ترسەی کە بزانن من لە ماڵەکەیانم، نەمدەزانی چیبکەم، یەکەمجار بڕیارمدا بێ سەرنجدانیان لە ماڵەکەیان بڕۆمە دەر، بەڵام بریسکەی ئاڵتون و گەوهەرەکان بە جۆرێك لە بەرچاوم دەدرەوشانەوە دوودڵیان کردم و ئیدی عەقڵم فەرمانی نەدەدا، وەختێکیش دەنگی پێی ژنەکەم بیست زانیم ئێستاش درەنگ نیە بۆیە بێوچان تیغی ڕایەخ بڕینم کە لەگەڵ خۆمم بردبوو هەڵمگرت، مەبەستم تەنها ترساندنی ژنەکە بوو، بەڵام کاتێ دەستی بە قیژە لێدان کرد چیدیکە نەمتوانی خۆڕابگرم و بەداخەوە ژنی بێ دەربەست کە منداڵەکەی لەباوەش بوو ئازاد نەبوو، تیغەکە لە یەك ساتدا دڵی میهرەبانی دایك و کۆرپەکەی بڕی و خوێن فوارەی کردو مرۆڤە بێگوناهەکان لە خوێندا گەوزین، ئەفسوس کە من لە شێتیەکی ئێستادا

ئاوێتەی کوشتنێکی مەترسیدار بووم، بڕوابکەن هەرگیز مەبەستی کوشتنم نەبوو بەلاّم بێبەختی زۆری بۆ هێنام تا لەناکاو نازناوی خوێنمژم بۆ جهانگیری کوللە زیادبوو))

جهانگیری کولله ئاهێکی قووڵی هەڵکێشاو بە چاوانی تەڕی فرمێسکەوە بە دەوری دەستەکانی واقی وڕمابوو، وەك بڵێی بۆ خۆیشی بڕوا نەکات تێکەڵی تاوانێکی لەم جۆرە بووە، ئەو دەزانیّ زیندان و سێدارە چاوەڕوانیەتی، دۆسیەکەی تەواوو بووەو ئەمیش بۆ زیندان دەگوێزرێتەوە، بەڕاستی تاوانبارانی خوێنمژ دەبیّ بزانن هەرگیز خوێنی بە ناحەق ڕێژراو بە هەدەر ناچیّ بکوژ لەدووای تێوەگلانی کوشتن درەنگ یا زوو گرفتاری چەنگی یاسا دەبیّ و بە سزای کاری تاوانکارانەی خۆی دەگات،،،،،،،،،،،،!! وە تووڕەیی خوای پەروەردگاریش لە ڕۆژی دووایيدا داوێن گیریان دەبێت،

# ئاگری ڕق و کینە

هەتاوی بێ تینی پاییزی دوواهەمین تیشکەکانی خۆی وردە وردە لە ڕوخساری شاردا کۆدەکردەوەو هاوشێوەی تۆپێکی ئاگرین لە دەریای خوێنینی ئاسۆ دەچووە خوارەوە، بای ساردو موچڕکهێن لە پەنجەرە نیوە کراوەکانەوە بۆ ناوەوە سەرەتاتکێی دەکردو هەواڵی لە گەیشتنی ئێوارەی ساردو دڵگیر دەدا، ئیبراهیم پیاوێکی53ساڵەیی بوو ناڵەباری ڕۆژگار پیرترو داچەکاو تری کردبوو، چاوانی ماندوو بەقووڵداچووی لە کاتژمێری تۆز گرتووی دیواری ژووری قاوە و چا لێنانەکەی کۆمپانیا کردو لە دڵی خۆیدا گووتی: (( هێشتا زۆری ماوە تا،،،،))

ئەو بیرۆکە شەیتانیە وەك برینێك دووبارە لەسەر دڵی بچووزێتەوە بوونی لاوازی بە لەرزە خست، بە هێواشی لەسەر کورسی هەستاو بە لۆژە لۆژ بەرەو دەرگای دەرچوون کەوتە ڕێ، بێدەنگیەکی سەیرو نهێنی ئامێز لە ئاسمانی ئەو کۆمپانیا گەورەیەی بەرهەمهێنانی قوماش کە تا کاتژمێرێك پێشوو نوقمی دەنگە دەنگی ئامێرو مرۆڤەکان بوو، هێند زاڵبوو بەدەست خۆت نەبوو ئازاری دەدای، بەڵام ئیبراهیم ساڵانێك بوو بەم خامۆشی یە سامناکە ڕاهاتبوو ئولفەتی پێوە گرتبوو، کەناری دەرگای دەرچوونی ژووری قاوە و چا لێنانەکە بە حەسارێکی فراوانی کۆمپانیاوە دەلکا، ئاوێنەیەکی نیوە شکاوو تاڕاددەیەك پاك چەسپێنرابوو،ئیبراهیم لە بەرامبەری وەستاو بۆ چەندەهەمین جار سەیری باڵای خۆی کرد، قژی کەمی پشتە سەرو ڕوخساری بەتەواوی سپی ببوون، نێوچەوان و ڕوومەتە قوپاوەکانی پڕ لە چرچ و لۆچە قووڵەکان بوون و چاوە گەورەکانی کە سەردەمانێك لە ڕۆژانی گەنجی دا بە جوانیەکەیان دەنازی، ئێستا بە قووڵداچوونە و کەمێك ڕووناکیان لێ دەدەرەوشێتەوە: ((بەڵێ من پیر بووم، خۆشم ئەمە دەزانم بە پێست و ئێسقان هەست پێدەکەم، بەڵام، هێشتاکەش مەرگ زووە بۆم، چونکە دەست و بازووم هێزیان تێداماوە، هێشتا دەتوانم کەسێکی ملەستووری بێ ویژدانیان پێ بخنکێنم،))

دەستە زبرو قڵەشیوو ئێسقانەکانی کە کەوتبوونە لەرزین، بە ڕوخساری داهێناو چاوی تێبڕین، چ یادگارییەکی تاڵی بەم دەستانە هەبوو، چونکە جگەرگۆشەکەی بێ شووشتبوو کفنیشی هەر بەم دەستانە کردبوو لە ژێر خەروارەکانی خاکیش دا شاردبوویەوە، لە ساتێك دا ڕوخساری گەش و دەم بە پێکەنینی کوڕە گەنجەکەی دیت کە لەرزەی خستە تەواوی بوونیەوە و پەردەیەکی فرمێسك بەردەم نیگای لێگرت، بە ئارامی لە خوار دەرگاوە دانیشت و هەر بەو جۆرەی کە چاوی لە خاڵێکی نادیار بڕیبوو فرمێسکی دەڕشت، بیری لە ساڵەکانی پێشوو کردەوە، بیست و حەوت ساڵ پێش ئێستا لە تەمەنی ٢٥ ساڵی کە پڕ لە کەف و کوڵ و گەرمەی گەنجیدا بوو لەگەڵ فەخری هاوسەری میهرەبانی چاوەڕوانی لەدایکبوونی یەکەمین منداڵیان بوون، بەهۆی یەکێ لە دۆستانیەوە وەك پاسەوان لە کۆمپانیای بەرهەم هێنانی لاستیکدا سەرقاڵی کاربوو، ((سیروس خان)) ی خاوەنی کۆمپانیا بە یەکێ لە دەوڵەمەندترین خاوەندارانی شار دەژمێردرا، بەڵام ئەم ناوبانگ و سەروەتە ڕێگر نەدەبوو لە سەرنجی ئەو لەبارەی ژێر دەستەکانیەوە، وە هەر ئەو میهرەبانی و سەرنجانەی بوو کە تۆزقاڵێکیش لە فیزو لەخۆبایی بوونیان تێدا نەبوو ببووە جێی خۆشەویستی گشت کرێکارانی کۆمپانیاو دوعایان بۆ دەکرد، وە (جەواد) ی کوڕی ئیبراهیمی بە موچەیەکی بەرزەوە وەکو بەرپرسی ئەنباری کۆمپانیا دامەزراند، ڕۆژگار بەکامی ئیبراهیم و خێزانەکەی تێدەپەڕی تا لە پڕ ئەو ڕووداوە ناخۆشەی لێکەوتەوە، فەخری ماوەیەکی زۆر لەگەڵ نەخۆشی شێرپەنجە ململانێی دەکرد، سەرەنجام خۆیدا بەدەست چارەنووسی خواییەوەو بە مەرگی ناوەخت غەمێکی قورس و قووڵی لەسەر دڵی ئیبراهیم و کوڕەکەی دانا، هێشتا چل ڕۆژ بەسەر مەرگی هاوسەرەکەیدا تێنەپەڕیبوو کە مردنی لەناکاوی سیروس خان،دووەمین لێدانی کوشندەی لەسەر ژیانی ئیبراهیم و هەموو کرێکارانی کۆمپانیا دانا، مەرگی سیروس خان وەکو شۆکێکی لەناکاو بۆ ماوەیەك ئیش و کارەکانی کۆمپانیای شڵەژاند و هەمووی تازیەبارو لە هەمانکاتدا نیگەرانی ئاینده کرد،وەك بڵێی بۆنی مەترسیەکیان هەست پێکردبێ و لەدڵەوە حەزیاندەکرد

ئەوەی لەبارەی جێنشینی سیروس خانەوە بە مێشکیاندا هاتووە، دروست ئەمە نەبێ، بەڵام هەواڵێ لە پاش چلەکەیەوە زارەو زار کەیشت،گشتی نائومێد کردن، ((بهادر،کوڕە گەورەی سیروس خان لە جێگای باوکی، بوو بە سەرۆکی کۆمپانیا !))

هەموو ئەو کەسانەی کە چەندین ساڵ بوو تەمەنی خۆیان لەو کۆمپانیایە گوزەراندبوو، بهادریان چاك دەناسی، گەنجێکی تازە پێگەیشتووی خۆشگوزەران وپێچەوانەی باوکی بوو، جار هەبوو بۆ کۆمپانیا دەهات،هەموو هەوڵیاندەدا لێی دوورکەونەوە، عاشقێکی دەسبلاوبوو، لەگەڵ ئەوەی خاوەنی هاوسەرو دوو منداڵیش بوو، بەلام شەو بێرییە درێژەکانی بە دانیشتنە پڕ یاری و هەوەسبازیەکان لەگەڵ هاوڕێیانی وەکو خۆی بەڕێدەکرد، حەزو تامەزرۆیی زۆرتری پیشان دەداو تەنها ئەو کاتانەی کە بۆ سەفەرەکانی دەرەوەی وڵات دەڕۆیشت، خەیاڵی کرێکارەکان ئارام بوو چونکە بۆ ماوەیەك لە شەڕی گاڵتەو سوکایەتیە بێشەرمەکانی ئەو دوور بوون، سیروس خان،لە ڕۆژانی ژیانی دا چەندین جار لە دەست بهادر وەڕز ببوو ئامۆژگاری کردبوو، کەچی ئەو گوێی بۆ ڕێنماییە دڵسۆزەکانی باوکی نەگرتبوو، لەگەڵ مەرگی باوکی و جێنشینی بهادر،ئاییندەیەکی تاریك و نادیار چاوەڕوانی کرێکارانی کۆمپانیا بوو، بهادر هەر لەو ساڵانەی یەکەم، بە بیانووە جیاوازەکانەوە کارمەندێکی زۆری لە کۆمپانیا دەرکرد و بە کەم کردنەوەی دەسحەق و موچەی کاری زیادە ئەوانی دیکەشی خستە ژێر فشارەوە، بەلام لەگەڵ هەموو ئەم گرفتانە ئەندامانی کارخانە هەوڵیاندەدا بەهانەیەك بەدەستەوە نەدەن، تا ئەو کاتەی ئەو شەوە شوومە هات، ئیبراهیم و جەواد بە میوانی بۆ ماڵی خزمەکانیان ڕۆیشتبوون، کاتێ گەڕانەوە، سەرنجی قوفڵە شکاوو دەرگا کراوەکانی ئەنباری کۆمپانیایان دا، بینینی ئەنباری بەسەر یەکدا کەوتوو دزراو،کوڕەو باوکەی تووشی شۆکێکی وەها کوشندە کرد کە توانای هیچ جۆرە قسەیەکیان نەبوو تەنها چاویان لە یەکتر بریبوو، وەك بڵێی هەردووکیان بە زمانێکی بێ زمان لە یەکتر حاڵی ببوون کە چیدیکە ڕۆژی خۆشیان

لە ژیاندا نەدەبینی، هەڵبەتە هەر بەم جۆرەش بوو، بهادر  بێ بیرکردنەوە جەوادی بـە کەمتەرخـەم لەقەڵەمـدا، کـە بەرپرسـیاری ئـەنبار بووتەنانـەت گومـانی لـە هاورێکانیشی بوو بۆیە وەکو دزی کۆمپانیا شکایەتی لێکرد، گریان و پاڕانەوەکانی ئیبراهیم تەنها توانی جەواد لـە پـشتی شیـشە پۆڵایینـەکانی زینـدان ڕزگـار بکـات، بەڵام بهادر بێ وچان جەوادی لەسەر کارەکەی لابرد، ئەگـەر ئـەم و ئـەو نەهاتبانـە نـاوەوە ئـەوا ئیبراهیمیـشی دەردەکـردو ئـاوارەی کوچـە و شـەقامەکانی دەکـرد، ئەمەش دەبـووە هۆکاری بـێ ئـابڕوویی بنەماڵەکـەی ئیـبراهیم، ئـەم ڕووداوە تاڵـە کاریگەرییەکی تەواوی لە ڕۆح و ژیانی باوك و کوڕەکەی کرد و بێتاقـەتی کـردن بـە تایبەتی جەواد  لە نەزانی و داماوییەوە پاش دەربازبوونی لـە زینـدان کەوتـە داوی تلیاك و بێکارییەوە، ئیـبراهیم وەهـا لـە غـەم و گرفتارییـەکانی خۆیدا نوقـوم بـوو تەنانـەت سـەرنجی حاڵـەت و ڕەفتـارە گوماناوییـەکانی جەوادیـشی نـەدەدا، ئـەو ڕۆژەی کە هەواڵی مەرگی جەوادیان بە باوکی گەیاند، خـراپترین ڕۆژی ژیـانی بـوو، هەواڵەکە ئەوەندە بزوێنەرو جێی بـاوەڕ نـەکردن بـوو، تـا کـاتێ بـە وڕو گێژییـەوە لەسەر سەری جەواد ئامادە نەبوو بە چاوی تەڕەوە تەرمی ساردو بێ ڕۆحی کوڕی ئازیزی نەدیت بڕوای نەکرد، وەختێ پزیشکی یاسایی ڕایگەیاند کـە جـەواد بـەهۆی کاریگەری دەرزی ماددەی بێهۆشکەرەوە خۆکوژی کـردووەو تـەرمی سـاردو سـڕی چەند سەعاتێ پاش گیان دەرچوونی،لەنێو گوفەك و سەگە بەڕەڵاکانی وێرانەیەکدا دۆزرایەوە، ئیبراهیم تـازە ڕووبـەڕووی گـەورەترین بـەڵا ببـۆوەو کوژانـەوەی تـەنها ئەستێرەیەکی ئومێدی ژیانی بە تەواوی بوونیەوە باوەڕ کرد،،،،

دەنگی بەریەککەوتنی پەنجەرەیەك ئیبراهیمی لە دنیـای بـیرو خـەیاڵات هێنایـە دەرەوە، نەیدەزانی چەند لە شەو تێپەڕیوەو ئەو هەر بەمجۆرە ماوەتـەوە، ڕیـشی سپی بە فرمێسکی تەڕ بوو، غەمی سەختی جەوادی دووبارە لێ تازەببۆوە و ئاگری سووتێنەری کینە و تۆڵە لە ساتی بەخاك سپاردنی جەواد لە ڕۆحیدا بێدار ببـۆوە، ئێستا لە جاران زۆرتر بڵێسەی دەدا و بـۆ ئەنجامـدانی کارێك ماوەیـەکی زۆر بـوو سـەرقاڵی کردبـوو، دەیجووڵانـد: (( هـەموو ئـەم بەدبەختیانـە بـەهۆی بهـادری

ناپیاوەوە بوو بەسەرمدا هات، ئەگەر ئەو بێ ویژدانە تۆمەتی دزی نەدابا پاڵ جەواد و بە سووك و ڕیسواییەوە لە كۆمپانیا دەرینەكربایە، كوڕەكەم گیرۆدەی ئەم داوە نەدەبوو بەرەو ئاقاری ونبوون و نەمان خۆی ڕانەدەكێشا، پێویستە هەر ئەمشەو مافی خۆی لە دەستی دابنێم و تۆڵەی هەموو ئەم ساڵە سەختانەی لێوەرگرمەوە))

هەستی تۆڵە لە بوونی دا دزەی كردوو لە جێگاكەی بڵندی كرد: (( ئیدی دەبێ بكەومە ڕێ،،،هەر ئەمشەو بهادر لە نێو ماڵەكەیدا تەنهایە، پێویستە كاری تەواو بكەم،)) ئیبراهیم لەگەڵ ئەم خەیاڵەی لە ژووری قاوە و چا لێنانەكە هاتە دەرو بۆ سوچێكی كۆمپانیا ڕۆیشت و تەبەرێكی تیژی برەری كە لەوەو پێش ئامادە كردبوو هەڵگرت و لە ژێر جلەكانیدا شاردیەوەو لەكۆمپانیا دەرچوو، ئیبراهیم بەرامبەر ڤێللای شكۆداری بهادر، تەماشایەكی میلەكانی كاتژمێری كرد كە لە سنووری نیوە شەو نزیك دەبۆوە، زۆرترین گڵۆپەكانی ناو كۆشك و تەلارەكەی كوژابوونەوە، ئیبراهیم جارێكی دی دەستی بە لێواری تیژی تەبەرەكەدا هێناو بۆ لای ماڵەكە چوو، میلەكانی كاتژمێری مەچەكم یەك و چارەگی پاشنیوەڕۆی پیشاندەدا كە دووای بانگی نوێژ بۆ ژوورەكەم گەڕامەوە هێشتا بە تەواوی لە پشت مێزەكەم دانەنیشتبووم كە سەربازێك بۆ ژوورەوە هات و گووتی یەكێكم هێناوە،ئینجا بۆ دەرەوە چوو من خەریكی دۆزینەوەی شتێك بووم لە چەكمەجەی قەرەباڵغی مێزەكەم كە دەنگێكی كزم بەر گوێ كەوت: ((سلاو جەنابی ئەفسەر، دەتوانم ئەو شتەی كە دەمەوێ پێت بڵێم، كەمێك سەیرە بەلام تازە قەوما من كەسێكم كوشت !))

پیرەمێردێك كە بەرەوڕووم وەستابوو، وەها گورج و بە زەبرو زەنگ ئەم قسەیەی كرد ڕێگای هەموو جۆرە پرسیارێكی لێ داخستم، بۆ چەند ساتێك بە حەپەساوییەوە تەماشایەكم كردو خەریكبوو قسەیەك بكەم، بەلام خۆی دەسپێشخەری كرد: ((مۆڵەتم بدە بەشێوەیەكی كورت بۆت باسكەم، من دوێنێ شەو بهادری خاوەندارم بە تەبەر كوشت، ئەمەشە بەڵگەی تاوانەكە !))

ئیبراهیم دەستی بۆ ژێر قەمسەڵەکەی بردو تەبەری خوێناوی دەرهێناو لەسەر مێزەکەمی دانا، خەیاڵم پڕ لە پرسیارە جۆراوجۆرەکان بوو،بۆیە بە ڕووخۆشیەوە فەرمووی دانیشتنم لێکردو داوام لێکرد بە ئارامیەوە مەسەلەکە بگێڕێتەوە :

پیرەمێرد گووتی: ((ڕقی کۆنم لە دڵدابوو ئاگری کینەم بە ڕشتنی خوێنی بهادر دامرکاندەوە، دەمزانی کە چیدیکە ناتوانم بۆ سەر گۆڕی ئازیزانم بێم و بە ئاوی زولاڵی چاوانم گۆڕەکەیان بشۆمەوە، لە کاتێك کە کوڕەکەمی بە نامەردی لە کۆمپانیا دەرکردو جەوادی خۆشەویستم غەم تینی زۆری بۆ هێناو گیرۆدەی تلیاکی کرد و ماوەیەك دوواتر بە دەرزی ماددەی بێهۆشکەر بە دەستی خۆی گۆڕی بۆخۆی هەڵکەند، ئاگری تۆڵەسەندنەوە لە نێو دڵمدا کڵپەی سەندو ساتێکیش چیە نەیهێشت ئاسوودە بم، چاوەڕوانی دەرفەتێکی گونجاو بووم تا بە خراپترین شێوە تۆڵەم بسێنمەوە کە هۆکاری ئەم هەموو بەڵاو ئافاتە بوو، تا ئەو کاتەی زانیم ئەمشەو ئەم مۆڵەتە هاتۆتە بەردەستم! دەمزانی ژن و منداڵەکانی بۆ دەرەوە ناردووەو هەر خۆی تەنهایە، کاتێك بۆ ناو ماڵەکەیان چووم، هەموو جێگایەك تاریك بوو، هێواش هێواش ڕۆیشتم بەرەو لای ژوورەکەی، بەڵام دیتم لە نێو ژوورەکەیدا نیە،خێرا لە پشت پەردە خۆم شاردەوە و بە تەبەری دەستمەوە لە چاوەڕوانیدا وەستام، ئا لەو ساتەدا لە هیچ شتێ حاڵی نەدەبووم و هەموو هێزو توانام لە بازووەکانم دا کۆکردبۆوە تاکو بیکوژم، هەر کە دەرگاکە کرایەوەو باڵای قەڵەوی دەرکەوت، دەرپەڕیمە دەرەوە، بۆیە پشتاوپشت گەڕایەوەو منی دیت، بەڵام من مۆڵەتم پێنەداو تەبەرێکی وەها قایمم لە سەری دا تەنانەت نەمهێشت هاوارێکیش بکات، هەربەم جۆرە خوێن بەسەرو چاوی دا هاتە خوارو لەو گۆڕە کەوت و یەکسەر گیانی دەرچوو، ئیدی خۆم دووانەخست، بۆ سەر گۆڕی هاوسەرەکەم چووم و دوواییش بۆ خزمەت جەنابتان، بە مەرگی ئازیزانم من هەموو شتێکم لەدەستدا،ئیدی زیندوو بوون یا نەبوون چ جیاوازییەکی بۆمن هەیە؟ ئێستاش تکادەکەم جەنابی ئەفسەر لەگەڵم وەرە تا تەرمی نوقمی خوێنی بهادرت پێ

پیشان بدەم،)) بەبێ وەستان بەرەو شوێنی ڕوودانی تاوانەکە بەڕێکەوتین تا لە ڕاستی و نا ڕاستی مەسەلەکە دڵنیابین، بۆیە تەرمی بهادری لە خوێندا گەوزیومان چاو پێکەوت،ئایا بەڕاستی ئاگری ڕق و کینە بە ڕشتنی خوێنی سووری مرۆڤێك کۆتایی پێدێ؟ ئایا نرخی تەمەنێکی ژیان هەر ئەمە بوو؟ ئەفسوس! هەزاران ئەفسوس؟

# ئارەزووە خۆڵەمێشیەکان

ئاسمانی ڕەنگ پەڕیوی پاییزی خانەخوێی هەورە ڕەش و تورەکان بوو کە هاوشێوەی لەشکرێکی بەزیو لە کۆتایی ئاسۆوە دەهاتنە پێش تا سەر بە شانی یەکتر بکەن و فرمێسکە شاراوەکانی ناخیان بە فیدای مرۆڤەکان بکەن، زۆر زوو ئاسمان بە هەور داپۆشرا و گرژی سەنگینی هەورەکان شکا، لە بارانێکی وەها ترسناکدا هیچ کەس سەرنجی لە پیاوێکی جل و بەرگ شڕ نەدەدا کە جەستەی بێ هەستی خۆی لە پەنای دیوارە ساردو باراناوییەکان شاردبۆوەو بە هێواشی هەنگاوی دەنا، دیمەن و ڕوخساری بە پاڵتۆیەکی کۆنە داپۆشاندبوو، دەستە ڕەق و تەقەکانی بۆ ناو قووڵایی گیرفانەکانی پاڵتۆکەی بردبوو تەنها قژە خۆڵەمێشی و تێکئاڵاوەکانی لە بەرامبەر با و باران ئارامیان گرتبوو، بە بێ ئەوەی سەرنج لە گرمە گرمی ئاسمان بدات کە خەریکبوو مرۆڤی کەڕ دەکرد ئەو هەر بەم هێمنیەوە درێژەی بە ڕێگاکەی دا تا ئەو کاتەی خۆی لە ناوچەیەکی هەژارنشینی شار و بەرامبەر تەلارێکی نیوە ڕووخاودا دۆزییەوە کە ساڵانێك بوو جێگای نیشتەجێ و تێدا ژیانی ئەو بوو، خۆی بە گۆشەی خامۆشی ژوورەکەی گەیاندوو بەتانی کۆنەو ناسکی کە قامچی باران بەزەیی پێدانەهاتبۆوەو چەند جێگایەکی تەڕکردبوو بەسەر خۆیدادا، چاوانی سوورو کەم بینی لە سەمای بارانی پەنجەرەی بێ شووشەی بەرامبەرییەوە بڕی و کەوتە بیرکردنەوە، خەیاڵی ماندووی لە دنیای ساردو تەڕەوە بۆ ساڵانی دوورو ڕابردوو بردە دەرەوە، یەکەمین وێنە کە بیری تاریکی ڕووناك کردەوە، هەمیشە دەم بە پێکەنینی ڕووخساری هاوسەری میهرەبانی (شیرین) بوو کە لە تەواوی ساڵانی پێکەوە بوونیان سەقامگیریان کردبوو کە عەشق و ئەوینی دەبەخشیە ژیانیان، شیرین کە لە پایەی مامۆستایەتی کۆڵەپشتێکی لە ئەزموون و زانیاری هەبوو، هەر لەو کاتەوەی کە هەستی بە بوونی گیرۆدەیی ماددەی بێهۆشکەر لە نێو جەرگەی خێزانەکەیدا کرد،تێگەیشت ئەگەر درەنگ بەخۆکەوێ ژیانی لە بڵێسە سووتێنەرەکانی ئەم کارە دەبێتە خۆڵەمێش، ئەوەبوو کە بە تەنها بۆ نێو گۆڕەپانی ململانێ هات و بە گیان و دڵ

ویستی شەهرامی هاوسەری دووبارە بۆ ژیانی بگەڕێنێتەوە، چەندین جار بۆ دەرمانگاکانی تلیاك ڕۆیشت و ڕاوێژی لەگەڵ کەسانی پسپۆڕ کرد تاکو شەهرام لەم گەرداوی تلیاکە ڕزگار بکاتن، بەڵام بەداخەوە توانای شەهرام لەوە لاوازتربوو کە ڕزگاربوون کۆمەکی پێ بکات، شەهرام هەموو ئەمەی لە لەخۆبردوویی و ڕاوەڕاوو دڵسۆزییەکان دا دەدیتەوە، کەچی جادووگەری خۆش ڕەنگ و بۆی تلیاك هەڵیخەڵەتاندبوو چاوی بە ڕووی ڕاستیەکاندا داخستبوو، تازە لەوە دەرچووبوو بۆیە بەم هۆیەوە لە شوێنی کارەکەی دەرکرا و وەکو مشەخۆرێك چاوی لە خەرجیەکی کەمی هاوسەرەکەی بڕی، شیرین تەواوی ماندووبوونەکانی وەها دەدیت کە بەهەوادا بڕوات، بە جارێك تاقەتی چوو ناکۆکی لەنێوانیاندا دەستی پێکرد، داوای لێکرد لە نێوان ژیان لەگەڵ ئەم و ژیان لەگەڵ ماددەی بیهۆشکەر یەکێکیان هەڵبژێرێ، بەڵام شەهرام ژیانی لە دووکەڵی ئەم ماددانە کورتکردبۆوە و هاوسەرو کچەکانی هیچ بایەخێکیان بۆی نەبوو، کچەکانی، بیرەوەری و یادگاری ڕۆڵەکانی، شەپۆلێکی ترسناك بوو کە کەناری وشکی چاوانی تۆفانی کردوو دەنگی گریانی لەگەڵ سەدای پێ کوتانی شادمانەی باران هاوڕێ بوو، ئیلهام گەورەترین منداڵی بوو لە لووتکەی فیزو جوانی هەژدەساڵی خۆیدابوو لە بوونی باوکێکی وەهادا هەستی بە شەرمەزاری دەکرد، بەڵام بەسەر خۆی نەدەهێنا و هەوڵی دەدا بەباشی هەست بە دایکی ڕەنجاوی بکات و شانبەشانی ئەو لەگەڵ گرفت و پێکدادانەکانی ژیان ڕووبەڕوو ببێتەوە، ئەلناز کچی دووەمی بوو لەگەڵ ئەوەی هێشتاکە پانزە ساڵی تەواو نەکردبوو، بەڵام بە ئەندازەی دایك و خوشکە گەورەکەی پاشماوەی ئەفیون بە پێست و گۆشتی خۆی هەست پێدەکردو ئازاری دەچەشت، بەڵام یادگاری هیچ کامێکیان بە قەد ئارەزووی دە ساڵەی کچی بچووکی دڵی شەهرامی نەهێنایە ژان، کچۆڵەیەکی بێگوناه و شیرین زمان کە هەردەم لەگەڵ زۆر قسەکردنە منداڵانیەکانیدا، باوکی بە پێکەنینە دورو درێژەکان ناچار دەکرد، لەو ڕۆژە شوم و تاریکانە کە دەنگی دەمەقاڵی باوك و دایك ببووە کارتیخی ڕۆحی منداڵەکان، بێدەنگ و بێ سەدا لە سوچێکدا ماتی دەکردو

هاوشێوەی فریشتەیەکی باڵشکاو کە دڵی بچووکی بۆ بەهەشت تەنگ بووبێ، فرمێسکی دەڕشت و زمانی دەبەسرا، ئەم گۆشەگیریە بەردەوامانە لە خۆشی و شادی منداڵی دووریان خستبۆوە و هەمیشە خەرمانەیەك لە غەم و ژان بە دەوری ڕوخساری پەژموردەو بێگوناهیەوە دیار بوو، ئێستا سێ ساڵ بەسەر دواهەمین بینینی ژن ومنداڵەکانی دا تێدەپەڕی، هێشتاش بیرەوەرییەکی تاڵی دووا ڕۆژی دیدار لە تاریکخانەی خەیاڵیدا مابۆوە کە لەپاش شەڕێکی ڕاستەقینەو درێژ لەماڵ دەرچووبوو لە نێوان ئاهو نەفرەتەکانی شیرین و گریانی کچەکانی هاواری کردبوو:

((ئەمە ئێوەو ئەمەش  ژیان بەبێ من، ماڵئاوا! دیدار بۆ قیامەت!)) هەتا فرمێسکەکانی ئارەزووش لەو بڕیارە گەمژانەیەی پاشگەزی نەکردبۆوە،ژیانی لە گوزەراندنی دێوی تلیاکی بێ ئامانجدا بەسەر دەبرد،،،

دەنگی هەنگاوە خێراکان کە تا دەهات نزیکتر دەبۆوە، شەهرامی لە دنیای ئاڵۆزی بیرو هۆش ڕاکێشایە دەرەوە، کەسێ بە ژێر باران ڕایدەکردو دەهاتە پێش هەر بەم حاڵەشەوە بە تووڕەییەوە جنێوەکانی ئاڕاستەی زەوی و ڕۆژگار دەکرد، چەند ساتێ دوایی دەنگەکە ڕوونتر بۆوەو دیمەنی تەڕبووی جەلال لە بەردەم چاوانی نیگەرانی شەهرام دەرکەوت، شەهرام ساڵێك پێش ئێستا جەلالی دەناسی، کە چەند ساڵێك لە شەهرام بچووکتر بوو، لە گەراجێك وەك پاسەوان کاریدەکردو هاو وێنەی شەهرام دیلی ماددەی بێهۆشکەر بوو، بەم دواییانە ڕووی لە بەکارهێنانی هیرۆیین کردبوو، بە دیتنی شەهرام لە پڕ حەپەسا بەلاّم زوو بەسەر خۆیدا زاڵبوو بە خۆشحاڵیەکی تێکەڵ بە سەرسامیەوە گووتی:

_ وەی وەی، مام شەهرامی خۆمان! دەمێك بوو هیچ هەواڵێکتم نەدەزانی، لەم ماوە زۆرە تۆ لە کوێ بووی؟!

شەهرام فرمێسکەکانی سڕی و بەهێزی خۆی پیشانداو بە پێکەنینێکی ساختەوە گووتی:

_ چۆنی جەلال گیان؟ وەرە ئێرە لە نزیکمەوە دانیشە!

جەلالیش هێدی هێدی بۆ پێشەوە چوو لە تەنیشتیەوە پانبۆوەو سوچێ لە بەتانیەکەی بەسەر خۆیدادا:

_ سەیرە بارانێکی ناوەختە! خەڵکان لەئیش و کاری ژیان بێبەشدەکا!

شەهرام بە ماناوە گووتی:

_ کام کارو ژیان؟! بەڕەلایی نێو شەقامەکان و گەدایی و دەربەدەری و بە دووای ماددەی بێهۆشکەردا گەڕانیش دەبێتە ژیان؟!

جەلال وەك بڵێی چاوەڕوانی بیستنی ئەم ڕاستیە تاڵەی لە زمانی شەهرامەوە نەبوو،بە سیمایەکی ئازاردراوو غەمبارەوە گووتی:

_ دەستت خۆشبێ هاوڕێ! تەنها هەر مەبەستم ئەوەبوو کە گاڵتە لەگەڵ جەنابی پایە بەرزتان بکەم! بێگومان هەر خۆت بارودۆخی خۆت لەمن باشتر دەزانی بۆیە ئەم قسانە دەکەی؟!

بێدەنگیەکی تاڵ و درێژ بەسەریاندا زاڵبوو، بۆ چەند ساتێ گوێیان بۆ دەنگە دەنگی دەرەوە هەڵخست،

_ بزانە شەهرام گیان! چەند کاتژمێرێکە هیچم دەسنەکەوتووە تا لە دەمارمی بدەم، وەختە لە مەستیدا دەمرم، تێدەگەی؟! شتێکت هەیە تۆ بە فریام بکەوی؟!

سەدای ناقۆڵای شەهرام لە نێو بۆشایی سارد دا بەسەر ئەو وێرانەیەدا زاڵبوو دەنگی دایەوە:

_ نا، دەبینی کە خۆشم لە دۆخێکی هێندە چاك و باش دا نیم، ئەم بارانە نەعلەتیەش لێیناکاتەوە تا بە لانیکەمەوە بۆ دەرەوە بڕۆین شتێك پەیدا بکەین، دەزانی جەلال گیان! ئادەم،،،،،،،

شەهرام بێ ئەوەی سەرنج لە جەلال بدات، هەر بەم شێوەیە خەریکی قسە بوو،غافڵ بوو لەوەی دەستی جەلال بۆ لای شت ومەکە کەمەکانی ژیانی کە لە سووچێکدا بەسەر یەکدا کەوتبوون درێژبووەو بە پارێزەوە لە نێویاندا دەگەڕێ، هەستانە سەرپێی لەناکاوی شەهرام بووە هۆی ئەوەی جەلال دەست لە کارەکەی

بکێشێتەوە، شەهرام گووتی کە دەیەوێ بۆ دەستشۆرین بڕوات، ڕووخساری ڕەق و تەقی جەلال بەم قسەیە گەشایەوە، هەر بۆیە شەهرام بۆ دەرەوە چوو، لە کاتێکدا کە قسەی لەگەڵ خۆیدا دەکرد، بۆ لای وردەواڵەکانی شەهرام هێرشی برد، جەلال بە خۆشحاڵیەوەپرێسکەیەکی بچووکی حەشاردراوی هیرۆیینی دۆزیەوەو بە چێژێکی قووڵەوە تەماشایکرد، بەڵام لەوە زیاتر نەیتوانی بەرگە بگرێ، مەستی بڕستی لێبڕیبوو، خێرا هەستا تا دوور لە چاوی شەهرام بە کارەکەیەوە خەریك بێ، لەناکاو لێدانێکی قایمی بەر تەختی سینەی کەوت و بەسەر شت ومەکەکان دا داکەوت:

– بۆ کوێ بەم پەلەپرووزێیە ناپیاوی بێ چاوو ڕوو؟

دەنگی تێکەڵ بە تووڕەیی شەهرام لە مابەینی ددانە داخراوەکانیەوە دەهاتە دەر، ترس و دڵەکوتەی جەلالی دوو هێندە کردو کەوتە تەتە و پەتە:

– تۆ،،،تۆ کەی گەڕایەوە کەی،،،من سەرنجم نەدا شەهرام گیان؟! هەرگیز،،،هەرگیز هیچ، خەریکبوو بە دووای بەدبەختی خۆمدا دەچووم!

شەهرام چەند هەنگاوێ بۆ پێشەوەتر هات و جەلالیش هەربەم جۆرە بۆ پشتەوە دەگەڕاوە،سەرەنجام لە کونجێکی دیوار جێگەی گرت،شەهرام هەر بەو سیما تورەو ئاوازە ترسهێنەیەوە هاواریکرد:

– ئەوە چیە لەنێو دەستت ناپیاو؟! ئێستا ئیدی دزی لە هاوڕێ نزیکەکانیشت دەکەی؟! زووبە بمدەوە!

جەلال هیچ کاتێ شەهرامی بەو جۆرە دوور لە گاڵتەو زبرو تووڕە نەدیتبوو، لە دڵەوەش حەزینەدەکرد کورتی بهێنێ و زوو خۆی بە دەستەوە بدات، چونکە ((ماددەی ڕەنگ سپی )) لە نێو چەنگیدا بوو، هەر بۆیە بیرۆکەیەکی بەخەیاڵداهات و لە ساتێکدا پێلەقەیەکی توندی لە دەموچاوی شەهرام دا تا بۆ خۆی تێتەقێنێ، لە سووچێکدا ڕایکرد،شەهرام بەم کارەی جەلال تووڕەتر ببوو، خێرا گەڕایەوەو هێرشی بۆ کرد، لەناکاو دەنگی هاوارێکی بە ژان لە پەنجەرەیەکی وێرانەوە ئاوێتەی فەزای مۆنی باران بوو، هێشتا ئاوازی یەکەم زایەڵەدار بوو کە هاوارێکی

دیکە هەستاو چەند دلۆپێك خوێن بۆ سەر زەوی شێداری کاوولەکە تکا و،،،،،،بێدەنگ بوو بێدەنگ!

_ ئەلو،پۆلیس ۰؟! سلاو،من یەکێکم لە دانیشتوانی شەقامی،،،،،چەند خولەکێك بەر لە ئێستا دەنگی هات وهاوارێکم لە یەکێ لە ماڵە نا نیشتەجێکانی ناوچەکەمانەوە بیست، کاتێ بۆ وێ ڕۆیشتم تابزانم مەسەلە چیە،جەستەیەکی مردووم دیت کە،،،،،،،

لە دووای ئەم پەیوەندیە تەلەفۆنیە بێ خۆ دوواخستن من و هاوکارانم خۆمان لە نێو بارانێك کە لافاوئاسا دەباری، بە شوێنی ڕووداوەکە گەیاند و بە تەرمی پیاوێکی لاواز ڕووبەڕوو بووینەوە، شێواوی و تێکچرژاوی ژوورەکە یەکەمین شتێ بوو کە سەرنجی ڕادەکێشای، یەخەی دڕاوی کراسی چڵك گرتوو قاچە ڕووتەکانی کابرا نیشانەی پێکهەڵشاخانی نێوان ئەوو بکوژ یا بکوژان بوو، چاوە مات و بێ ڕووناکیەکەی ڕووەو بنمیچ ئەبڵەق ببوون و کەفێکی زەرد بە سووچێکی لێوە ڕەشەکانی داهاتبووە خوار، تەواوی نیشانە ڕووکەشیەکانی هاواریان دەکرد کە ڕاهاتوو بە تلیاکە، یەکەمین هەنگاوی خێرا، ناردنی تاقمێك لە کارمەندان بۆ کوچەو شوێنە نزیکەکان بوو، چونکە وا گومانمان کرد کە بکوژ یا بکوژان نابێ زۆر دوور کەوتبێتنەوە، لەگەڵ گەیشتنی تیمی پشکنینی نمایشی تاوان، بێ وەستان لێکۆڵینەوەو سانسۆرە تایبەتەکانمان دەست پێکرد و لە یەکەمین هەنگاو بە گەڕانمان لە نێو گیرفانی جلەکانی کوژراو توانیمان پسوولەیەکی میللی چڵکاوی لە باخەڵی پانتۆڵی دا بدۆزینەوە کە کوژراوی بەناوی شەهرام، ج ٤٥ ساڵە دەناساند،چەند هەنگاوێ دوورتر لە تەرمەکە کێردێکی میوەخۆری خوێناوی دەبینرا کە خوێنێکی تازە بەسەریەوە سەرنجی ڕاکێشام، بێوچان کێردەکەمان بۆ دیاریکردنی گرووپی خوێن و بەرەو ناردنی تاقیگای تاوان سەرپەرشتی کرد، کارمەندان لاشەکەیان بە مەبەستی پشکنین و توێژینەوەی زیاتر بۆ مەڵبەندی پزیشکی یاسایی گواستەوە، قۆناغی دووایی دۆزینەوەی ماڵێك بوو لەگەڵ نوسراوی کۆدی پۆستێ لە پشتی پسوولە میللیەکە کە پاش چەند کاتژمێرێك گەڕان،

ماڵەکەمان لە یەکێ لە گەڕەکە کۆنەکان دۆزییەوە کە گەلێك لە شوێنی ڕوودانی کارەساتەکە دوورتر بوو، وەختێك لە زمانی ژنێکەوە کە دەرگای لێکردینەوە، بیستم کە ماوەی سێ ساڵە مێردەکەی بەناوی شەهرام بزرە، دڵنیابووم کە کابرای کوژراو هەمان کەسە کە ئەم ژن و منداڵانەی لە چاوەڕوانیدان، وردبوونەوەکانی ژنەکە ناچاری کردین ڕاستیەکەی بۆ ڕوون بکەینەوە، کاتێ هەواڵی بیستنی مەرگی مێردەکەی بیست ڕاچەنی و لە هەمان جێگای خوار دەرگا دانیشت و لەژێر لێوەوە بە دەنگێکی ماندوو تەم گرتووەوە ورتەیەکی لێوەهات:

_ سەرەنجام تلیاك بووبە بەڵای گیانی،،،،،،،

بکوژی شەهرام زۆر زوو ئاشکرابوو، پرسیارو وێکەوتن لە خزم و خوێشانی شەهرام و خەڵکی گەڕەك، بەتایبەتی ئەوانەی کە ڕاهاتوو بە تلیاکەکانی ناوچەکەیان زۆر بە باشی دەناسی و لە پەناوپەسیوەکانیان بە ئاگابوون، کارمەندانیان بە ژێر زەمینی تاریك و نمناکی ماڵێکی کۆنە گەیاند کە پیاوێکی گەنج لە داوی هیرۆیین دەست وپێی دەکوتا و جارجارەش بە هاوار هاوار ڕۆحی پیسی لەخۆی دوور دەخستەوە:

_ نا،،،من نەمکوشتوە،،،کەمتەرخەمی و ناپیاوەتی خۆی بوو،،،من هیچم نەکردووە!

وەختێك گەنجەکەم ڕووبەڕوو دیت، لە حاڵ و ڕۆژی پەشۆکاوو دڵسۆزبوونی منیش تێکچووم و ناچار بووم چەند ساتێك بێدەنگ بم، خەریکبوو لەگەڵ خۆم بیرم دەکردەوە کە ئەم دیمەنە یەکێکە لە هەزاران دەمامکی ترسناك کە تلیاك بۆ ڕووخساری قوربانیەکانی دەیکاتە دیاری، دەنگی گڕی کابرا منی بەخۆ هێنایەوە:

_جەنابی ئەفسەر! باوەڕبکەن من بێگوناهم،،،ئاخر چۆن بارودۆخ و حاڵی من بەکەڵکی ئەوە دێت ببمە مرۆڤێکی بکوژ؟! من بەدبەختترم لەوەی کە بتوانم مێروولەیەك لەخۆم دووربخەمەوە، چ جای ئەوەی پیاوێك بکوژم!

سەرێکم بۆ باداو دوور لە گاڵتەوە گووتم:

_ خەڵکانێکی زۆر دەناسم لە پێناوی برێکی کەم ماددەی بێهۆشکەر ئامادەن دەست لە گیان و ماڵ و ئابڕوشیان هەڵگرن تەنانەت شەرەفیشیان هەڕاج بکەن، کوشتن و برین ئاسانە! ئێستا بە وردی سەرنج لە پرسیارەکانم بدەو وەڵامم بدەوە، بۆچی شەهرامت کوشت؟! لەبەر تلیاك؟! بە ترس و دەسەپاچەییەوە لە ناوەڕاستی قسەکەم ڕایکرد: من ئەوم نەکوشتووە جەنابی پۆلیس! ئێمە تەنها پێکەوە هاوڕێ بووین و هەر ئەوەندە!

– بەڵام هەموو شایەت و بەڵگەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە تۆی، حەزدەکەم بزانم ئەو برینە قووڵەی سەر ڕوومەتت چیە و بۆچی واتلێهاتووە؟!

جەلال کەمێك جێگای برینەکەی دەست پێداهێناو بە سیمایەکەوە کە حەق بە خۆیەتی گووتی:

– بە ئازایەتی نەبێ جەنابی ئەفسەر! ئەم برینە هی دەمەقاڵێ شەقامێ بوو کە وەك یادگاری بەسەر ڕوومەوە جێماوە،

کاتێ بینیم جەلال لەژێر کاریگەری هیچ هەل و مەرجێك ئامادە بە دانپیانان نیە، بە لێپرسینەوەی هونەری و شارەزایانە ڕووم لێنا، بۆیە زۆر زوو دانی بە هەموو شتێك دانا:

– بەدەست خۆم نەبوو جەنابی ئەفسەر! وەخت بوو لە مەستیدا دەمردم، دوو ڕۆژ بوو پارەیەکم بەچەنگ نەکەوتبوو تا کەمێکی پێ ئامادەکەم،ئەو ڕۆژەش هەر بۆیە بە سۆراغی شەهرام ڕۆیشتم چونکە دەمناسی و زۆریش پێکەوە هاوڕێ بووین، ڕەنگە هەر ئەو هاوڕێیەتیە نزیکە بووبێ کە ئەو هێندە متمانەی بەمن بوو، ئەو منی بۆ گەڕانی ماددە بێهۆشکەرە شاردراوەکانی نێو کونی سنبەکانی ئەو ماڵە کاوولە جێهێشتبوو،بەکورتی سەرەتا بە زەبوونی و خۆشیەوە داوام لێکرد، کەچی ئەو بە تاڵی و گرژییەوە وەڵامی نەخێری دامەوە، بڕیارمدا خۆم دەست بەکاربم بۆ دۆزینەوەی، بەڵام گەلێك بێبەخت بووم کە دروست لەکاتی خۆی شەهرام گەیشت و خوێنی لەم کارەم بەجۆش هات و دەسەویەخەی یەکتر بووین، بەڵام هەر چۆنێ بوو ئەو لەمن بەهێزتر بوو، بە لێدانێك منی بۆ سوچێك کە شت ومەکەکانی ژیانە

نەگبەتەکەی لێبوو فرێدا، هەر لەو کاتەدا دەستم بۆ کێردی میوەخۆری درێژکردو بۆ ئەم مەبەستە دیسانەکە شەهرام هێرشی بۆ هێنامەوە،منیش پەلاماریم دا بەڵام ئەو زرنگتر بوو لەمن لەم بارەیەوە کێردەکەی لەدەستم ڕفاند و بە دەموچاومی داهێنا و بوو بە برینێك کە ئێستا ئێوە دەیبینن، ئیدی نەمتوانی چیدیکە جڵەوی خۆم بگرم، تەواوی هێزی بازووەکانم کۆکردەوەو بۆ پشتەوە فڕێمدا،هێشتا دەرفەتی هەستانەوەی پەیدا نەکردبوو کە بە شیشەیەکی ئاسنی ئەستوور بۆ لای ڕویشتم و دووجار زۆر بەتوندی بەسەریم دا کێشا، ئەوەندە قایم و بەدڵ پێم داکێشا خۆشم ترسام، ئینجا خۆم بە پرێسکە هیرۆیینەکە گەیاندو ئەفیونی بەدەسهاتووم لە دەمارم دا، بەڵام باوەڕیکەن تا چەند ڕۆژێك بۆخۆشم تووشی حەپەسان ببووم و لە دەستەکانم دەڕوانی،باوەڕم نەدەکرد مرۆڤم کوشتووە، شەوانە مێردەزمەیەکی زۆر دەبینم!

ئاهێکی قووڵم هەڵکێشاو بە دەنگێکی درکە ئامێزەوە گووتم:

– ئەو ڕۆژەی کە بۆ یەکەم جار تلیاکت بەکارهێنا هەرگیز بیرت لەوەدەکردەوە بەو ئاستە بگەی کە مرۆڤێکی بۆ بکوژی و خێزانەکەی تازیەبار بکەیی و قوڕیان بەسەردا بکەی؟!

جەلال بێدەنگ بوو، بە بێدەنگیەکەی وەڵامی پرسیارەکەی دامەوە، پاشنیوەڕۆی دووایی، کاتێ بۆ گۆڕستان ڕۆیشتم و هاوسەری دڵ بە غەمی شەهرام و سێ کچەکەیم چاو بە فرمێسك و بێ هێز بە دەوری گۆڕی شەهرامەوە دیت، بە تەواوی بوونەوە حەزمکرد ڕۆژێ بێت کە ئارەزووەکانی هیچ مرۆڤێ لە ئاگری بێ بەزەیی تلیاکدا نەبێتە خۆڵەمێش .

# بۆنی خوێن

شەهرامی ٢٧ساڵەی پێست ڕەشی لەڕولاواز لە کاتی شوفێری لە پشت سوکانی ئوتومبێلێکی مۆدێل کۆنەوە تەماشای تابلۆی شینی کەنار جاددەی دەکرد کەماوەی ٦٠کیلۆمەتری بۆ شار نیشاندەدا، لەبەر خۆیەوە دەیگووت: (( سەیرە ڕیگایەکی درێژە، بەم لەم کارکەوتووە ئەگەر شاکاریێ بنوێنم؛ ئەوا کاتژمێرێکی دیکە دەتوانم بەشداری لە مەراسیمی بوکێنی شکۆی خوشکم بکەم،)) بۆیە بە توندی قاچی لەسەر پایدەری گازەکە دادەناو سەرنجی لە کیلۆمەتر ژمێرەکە نەدەدا، لەناکاو دەنگێکی سامناك بێدەنگی شەو دەشکێنێ و لە جێگای خۆی ڕایدەتەکێنێ، بەرچاوانی تاریکبوو خوێن بە سەرو چاویدا فوارەی دەکردو بێهۆش دەبێ، ساتێ دوواتر شوفێری ئوتومبێلە تێپەڕەکان، شەهرامی نیوە گیانیان لە نێو پارچە ئاسنە وردەکان دەرهێناوە کە ئوتومبێلەکەی سەرەوبن ببوو، بێ وەستان بەرەو نەخۆشخانەی شار دەیگوێزنەوە، بەهۆی برینەکانیەوە لەژێر چاودێری پزیشکە تایبەتەکان دەمێنێتەوە و پاش چەند کاتژمێرێ کەس و کاری بە سەرسامیەوە بۆ نەخۆشخانە دێن، بە دیاریکردنی پزیشکی برینکار بۆ حاڵەتەکەی شەهرام دەکەوێتە ژێر نەشتەرگەرییەوە، تا سێ ڕۆژان توانای قسەکردنی نەبوو، بەڵام لە ئێوارەی یەکێ لە ڕۆژەکان شەهرام بە هێواشی چاوانی کردەوەو بە دەنگێکی پچڕاو ڕوو لە کەس و کارانی دەکاو دەڵێت: (( من لە کوێدام؟ منداڵەکانم ئیلهام و ئارەزوو لە کوێن؟ چی ڕوویداوە؟)) شەهێن بە خۆشحاڵیەوە ڕوو لە باوك و دایك و مێردەکەی دەکات و دەڵێت: ((شەهرام خەریکە قسان دەکات!)) بابانیعمەت بەپەلە دەستانی ساردی شەهرام لە نێو دەستانی خۆیدا دەگوشێ: ((کوڕم نیگەرانی منداڵەکانت مەبە؛ پورە شکۆ ئاگای لێیان دەبێ،)) دایکی ڕوو لە شەهرام دەکا: ((کوڕم دکتۆرەکان گوتیان نابێ زۆر قسەبکەی، دەبێ پشوو بدەیت،)) چەند ساتێ دوواتر شەهرام چاوانی دەنووقێنێ و دەخەوێ، دووای پانزە ڕۆژ شەهرام لە نەخۆشخانە دەردەچێت، ڕۆژەکان بە دووای یەکدا تێدەپەڕن و شەهرام لە ژێر چاودێرییە دڵسۆزییەکانی خانەوادەکەی دەمێنێتەوە، لە

هاوسێیەتی شەهرام گەنجێکی ٢٥ ساڵە بەناوی فەرهاد لەگەڵ فەریدەی هاوسەرو ڕۆڵەیەکی منداڵکارە بەناوی کێوان ژیان بەسەر دەبەن، بە تێپەڕینی ڕۆژگار دۆستی و هاوڕێیەتی لە نێوان هەردوو خێزانی شەهرام و فەرهاد بەرقەرار دەبێ و لە غەم و شادیەکان یارو یاوەری یەکتر دەبن، لەگەڵ بەسەرچوونی کات کاریگەری ڕوودانی نەخۆشی ڕۆحی و دەروونی شەهرام زیاد دەبێ و هیچ دەرمانێ چارەی ناکات و وردە وردە بۆ مرۆڤێکی غەمگین و تورە دەگۆڕێت و هەمیشە بەبێ هۆ بەتوندی لە ژن و منداڵەکانی دەدات و زامداریان دەکات، بۆیە هەر لەبەر ئەم هۆیەشە لە شوێنی کارەکەی دەریدەکەن، بابانیعمەت ناچار دەبێ خەرجی ژیانی شەهرام و ژن و منداڵەکانی دابین بکات، مانگەکانی دوایی شەهرام لە نەخۆشخانەی دەروونی دەخەوێنرێ و لە دووای تێپەڕینی سێ مانگ لە نەخۆشخانە دەردەچێت، بەڵام لە یەکێ لە ڕۆژەکانی کۆتایی مانگی ڕەشەمێ لە پڕ دەمەقاڵێیەك لە نێوان شەهرام و فەرهاد دروست دەبێ و دەسەویەخەی یەکتر دەبن و شەهرام هەر لەو کاتەدا ئاسنێك لەسەر زەوی هەڵدەگرێت و چەندین جار بەسەری فەرهادی دادەکێشێت، لە دەنگی دڵ ڕووشێنی فەرهاد خانەوادەی هەردوولایان بە ترسەوە هێرش بۆ دەرەوە دێنن و بە دیتنی فەرهادی لەخوێندا گەوزیو دەتۆقن، تەماشایەکی شەهرام دەکەن کە ئاسنێکی خوێناوی بەدەستەوەیەو بێباوەڕانە لە نێو هاواری ڕێبواران لە شوێنی تاوانەکە ڕادەکات، لە ڕێی مەڵبەندە بەپەلەکانی پۆلیسی· لە قەومانی تاوانێك ئاگادار دەکرێینەوە و ئێمەش بێ دوواکەوتن بەرەو شوێنی ڕووداوەکە بەڕێدەکەوین،بۆنی تازەی خوێنی مرۆڤێك لەسەر لەپی زەوی بە لووت دەگات، بەخێرایی بەهۆی خەڵکی ناوچەکەوە فەرهاد بە ئوتومبێلی فریاگوزاری بۆ نەخۆشخانە دەگوێزرێتەوە، بە پشت بەستنی قسەی خەڵکەکە تاوانبار گەنجێك بووە بەناوی شەهرام کە وادەرکەوتووە نەخۆشی دەروونی هەبووبێ و هۆکاری کێشمەکێش و دەمەدەمی بووە لە نێوانیاندا، ئەگەرنا لەمەو پێش هیچ جۆرە دوژمنی و ناکۆکیەك لە بەینیاندا نەبووە، ئێمەش بە پوختی ڕاپۆرتێکمان لەم بارەیەوە ئامادەکرد، لە شوێنی ڕوودانەکە بەهۆی

گرووپی کارمەندی تایبەتی پشکنینی شانۆی تاوانەوە، وێنەی ئاسن و بەڵگەکانی دیکەی تاوانەکەمان گرت و سەرپەرشتیمان کرد، بەڵام درەنگ بۆ نەخۆشخانە ڕۆیشتین، بەداخەوە بەهۆی برینە سەختەکانیەوە فەرهاد توانای قسەکردنی نەبوو، هەر بۆیە لەژێر چاودێری بەردەوامی دکتۆر دەمێنێتەوە، هاوسەرو خانەوادەکەی داوای دەستگیرکردنی تاوانبارو سزاکەی دەکەن، دۆسیەی ئامادە بە بەرچاوی لێکۆڵینەوەی داوەری دەگات، شەهرام هەر بەمشێوەیە هەڵوەدایە و فەرهادیش ڕۆژ دووای ڕۆژ حاڵی نالەبارتر دەبوو لە نێوان مەرگ و ژیاندا جۆلانێی دەکرد، چەند ڕۆژێك تێدەپەڕێ، وەختێ کە خانەوادەکەی لە چاوەڕوانی گۆڕانی ساڵی تازەدانە و لە دەوری سفرەی حەوت سین بە خۆشحاڵیەوە کۆبوونەتەوەو لەناکاو دڵی فەرهاد لە لێدان دەکەوێ و خێزانەکەی جگەر سووتاو دەبن، جەژن و شادی خانەوادەی بکوژو کوژراو دەگۆڕێتە سەر غەم وپەژارە و لە یەکەمین ڕۆژی ساڵی نوێدا تەرمی فەرهاد بەهۆی خزم و خوێشانیەوە بە خاك دەسپێردرێت، لە سەرپەرشتانی نزیکی کوژراوەوە توێژینەوەو لێپرسینەوە دەست پێدەکەین، ئەوان خوازیاری کوشتنەوەی بکوژ بوون، بەڵام هەر چەند جاری بەمەبەستی دەسگیرکردنی شەهرام بەرەو شوێنی نیشتەجێبوونی دەڕۆیشتین بەبینینی ئێمە خۆی دەشاردەوەو خانەوادەکەشی بێ ئاگایی خۆیان لە جێگا حەشاردراوەکەی پیشاندەدا، بەڵام پاش توێژینەوە بە ئاکام گەیشتووەکان دڵنیاییەك بە دەستدێنین لەگەڵ سەرنجدان لە حاڵەتی ڕۆحی و دەروونی شەهرام چونکە پێمان وابوو کە خانەوادەکەی لە حەشارگاکەی ئەو بێ ئاگابن، لە نیوەڕۆی یەکێ لە ڕۆژەکانی جەژنی نەورۆز لەگەڵ هاوکارانم بۆ سەردانی ماڵی باوکی شەهرام دەچین، بابانیعمەت بە ڕووخۆشیەوە دەرگامان بەڕوودا دەکاتەوەو دەڵێت: ((جەنابی ئەفسەر ئێوە لە ڕۆژانی پشووی جەژنیش هەر وازمان لێناهێنن،)) دەڵێم: ((ئێمە فەرمانبەرین و ببەخشن، تا ئەو ڕۆژەی شەهرام دەسگیر نەکەین دڵنیابن لەوەی هەمیشە ئۆخەی لەگەڵ ئێمە لەخۆتان ناکەن،)) مەهشید خانم (دایکی شەهرام) یش دەڵێت: ((جەنابی ئەفسەر بڕوابکەن ئێمەش لە مەرگی فەرهاد تازیەبارو

نیگەرانین، بەس چیبکەین؟)) منیش ڕوویان تێدەکەم و دەڵێم: ((ئەی بۆچی دەتانەوێ دەست لەسەر دەستان دانێن و لێگەڕێن کە شەهرام ڕابکات و کارەکە لەدەست بداو بارودۆخەکە لەمە خراپتر بێ؟ بڕوابکەن ئەگەر نەخۆشی شێتی شەهرام بۆ یاسا بسەلمێ حاڵەتی دۆسیەکەی جیاواز دەبێ، ئێوە پێویستە جێگای خۆ حەشاردانیمان پێ بڵێن،)) باوك و دایکی کەمێ ئارام دەبنەوەو نیگایەکی پڕ مانا لەیەك دەکەن و ئینجا باوکی دەڵێت: ((من دڵنیام وەختێ شەهرام ڕووبەڕووی ململانێ لەگەڵ فەرهاد بۆتەوە، لە حاڵەتێکی ئاسایی دا نەبووەو نەیویستووە دەستی بە خوێنی مرۆڤێك سوور بکات و لە کردارەکەی پەشیمان بۆتەوە،ئێوە بەڵێن دەدەن ئەوە بە دادگا بگەیەنن کە شەهرام نەخۆشی دەروونی هەیە؟))

ڕوویان تێدەکەم و دەڵێم: ((ئێوە هاوکاریمان بکەن تا هەرچی زووترە دەسگیری بکەین، من بەڵێن دەدەم هەر کارێکم لەدەست بێ بۆی ئەنجام بدەم،پشتتان بەخوا قایم بێ و منیش هەوڵی خۆم دەدەم، ئێستا هەستن با بەیەکەوە بۆ سۆراغی شەهرام بڕۆین تا ویژدانمان ئازارمان نەدات،)) باوکی دەڵێت: (( جەنابی ئەفسەر بۆ کوێ بەم پەلە پەلیە؟ ئێمە نازانین کە شەهرام لە کام گۆڕستانە خۆی شاردۆتەوە، خۆتان تەشریف ببەن،سبەی بەیانی پەیوەندیتان پێدەکەینەوە)) ئەوان دەڵێن: ((بەو مەرجەی بە جل و بەرگ و ئۆتومبێلی ئاساییەوە بێن و بیر لە ئابڕووی خێزانەکەمان بکەنەوە))

دەڵێم: (( باشە من چاوەڕوانی هەواڵی ئێوەم )) ئینجا لە دووای خواحافیزی شوێنەکە جێدێڵم، شەو تا بەیانی خەو لە چاوانم نەدەکەوت، هەموو ساتێ چاوەڕوانی زەنگی خانەوادەکەی بکوژبووم، لە کاتەکانی سەرەتای سپێدە زەنگی تەلەفۆنێك لێیداو دەنگێك گووتی: ((ئەلو، جەنابی ئەفسەر خۆتانن؟)) دەڵێم: ((سلاو بابانیعمەت،بەڵێ خۆمم بفەرموون،)) ئەمیش بە سەدایەکی خەیاڵاوییەوە دەڵێت: ((جەنابی ئەفسەر هەر ئێستا تەشریف بۆ بەردەم ماڵی ئێمە بهێنن،)) تەلەفۆنەکە دادەخەمەوەو خێرا لەگەڵ یەکێ لە پلەدارەکان بە جلی ئاساییەوە بۆ جێگای نیشتەجێبوونی بابانیعمەت دەڕۆین، بابانیعمەت دەڵێت: ((جەنابی ئەفسەر دایکی شەهرام لەگەڵتان دێت، من دڵم تەواو نیە و ناشمەوێ کوڕەکەم وا هەستبکا

کەمتەرخەمیم بەرامبەری کردووە؛ شەهرام لە گەڕەکی تەنیشتمان لە ماڵی براکەم خۆی شاردۆتەوە)) بۆیە بە ئوتومبێلی تایبەتمەوە و بە ڕێنمایی ئەو سوکانەکەم بۆ بەردەمی یەکێ لە گەڕەکە ناسەرەکیەکان دەسوڕێنمەوەو ئەو دەڵێت: ((جەنابی ئەفسەر هەر لێرەوە ئاگاداربن و بە هێواشی بەدووامدا وەرن، تەنها لێگەڕێن تا شەهرام بۆ بەردەمی ماڵەکە دێت ئەوکات دەسگیری بکەن؛)) مەهشید خانم چەند مەترێك دوورمان لێدەگرێت ولەبەردەم ڤێللایەکی ڕەنگ مشکی هەڵوەستەیەك دەکاو وردە بەرد لەسەر زەوی هەڵدەگرێتەوە و سێ جاران بە شووشەی پەنجەرەی چێشتخانەی کەنار دەرگای ئاسنی دادەدات، چەند ساتێ دوواتر دەرگای ماڵەکە ئاوەڵا دەبێ و پێش هەر جۆرە جووڵەیەك لەلایەنی شەهرامەوە کەلەپچەی ئاسنینی لەدەست دەکەن، ئەمیش بێ ئاگابوو ڕووی لە دایکی دەکا: ((بۆچی ئەم کارەتان لەگەڵ کردم ومنتان فرۆشت؟)) مەشهید خانم لە کاتێکدا فرمێسکەکانی دەهاتنە خوار، دەیگووت: ((ئازیزم من ئاگام لێنەبووە هەڵبەتە ئەمان لە ڕێگا دووام کەوتوون تا تۆ بدۆزنەوە،ئێستاش خوات لەگەڵ بێ و تەواو، نیگەرانی شەهێن و منداڵەکانیش مەبە،)) دایك و ڕۆڵە یەکتریان لە باوەش گرت و وەکو هەوری بەهار فرمێسکیان دەڕشت، شەهرام دەیگووت: ((دایە بڕوابکە نەمدەویست فەرهاد بکوژم،ئێمە هاوڕێ بووین،بەداخەوە،،،،،،)) شەهرام سوار ئوتومبێل دەکەین و خواحافیزیش لە دایکی بە ڕووخسەت دەخوازین و بەرەو ئاسایش بەڕێدەکەوین، لەوێش دەست بە لێپرسینەوە دەکەین لەگەڵی، ئەویش لە کارەکەی پەشیمانەو ئاشکرای دەکات: ((من و فەرهاد نان و نمەکی یەکترمان کردبوو، بەهۆی لێدانێکەوە کە لە ڕێگای تووش بوون بە ڕووداوێك بەر سەرم کەوتبوو، هەمیشە دەرمانی هێور بوونەوەم بەکاردەهێنا، چەندین جار لە خەستەخانەی دەروونی خەوتووم، ئەو ڕۆژە لە یەك ساتدا بێ هیچ جۆرە ناکۆکیەك دەسەویەخەی فەرهاد بووم، نازانم چ بوو وا کوشتم، فرمێسکەکانی دەهاتنە خوار و دڵنەواییم دەکرد، ڕۆژی دووایی دۆسیەی کوشتنی فەرهاد بە پوختەکراوی بە پلەی دادگاییکردن دەگەیەنین و شەهرامیش بەرامبەر یاسا بەرەو زیندان دەگوێزرێتەوە تا چاوەڕوانی بڕیارێك بێ کە یاسا بۆی دەردەکات، ئومێدەوارم هەرگیز خوێنی مرۆڤێ نەڕژێتە سەر زەوی و خانەوادەکەی جگەر سووتاو نەبن، ئینشائەڵلا،،،،،،،،

# پزیشکی مەرگ

باڵندەی شەو باڵە ڕەشەکانی بە ئارامی بەسەر ڕووی شار بڵاودەکردەوە، بەڵام کەف و کوڵی ژیان وەك هەمیشە لە کوچەو شەقامەکان بەرچاودەکەوت، ((شاهپور)) لەسەر قەنەفە بە هێواشی هەستاو بەرەو دۆڵابی جلەکانی ڕۆیشت، یەکێ لە جلەکانی پۆشی و بەرەو ڕووی ئاوێنەی قەدی هۆڵەکە وەستا، قژە ماش و برنجی و لۆچەکانی نێوچەوانی ئەوەیان ڕادەگەیاند کە سەردەمانی گەنجی تێپەڕاندووەو بۆ سەرەو لێژی ناوەڕاستی تەمەن ژیان دەگوزەرەێنێ، بەڵام ئەم پیرییە ناوەخت و زووە جگە لە بەڵگەیەك لەبارەی ڕووداوە تاڵەکانی ساڵانی گەنجی شتێکی دیکە نەبوو، بەتایبەتی مەرگی زووی هاوسەری، دوو ساڵ پاش هاوسەرگیرییان لە ساتەوەختی منداڵ بوون لە ژووری کار بەهۆی هۆکاری خوێنبەربوونی زۆرو لاوازی پێکهاتەی جەستەیی و لەگەڵ منداڵی تازە لە دایکبوو مردن، کارەساتێکی هێند بەژان بوو کەمەری شاهپوری شکاندو ژیانی فەوتاند .

لە دووای ئەو ڕووداوە بوو کە شاهپور لە بەرامبەر هەمووان سوێندی خوارد کە ئیدی تا کۆتایی تەمەنی هاوسەرگیری نەکاتەوە و جلی ڕەشی ماتەمینی دانەکەنێ،سەیر بوو ئێستا لەگەڵ ئەوەی تەمەنی ٤٥ ساڵە هێشتاکەش وەفادار بەرامبەر سوێندەکەی مابۆوە،کەچی ئەم ڕووداوە تاڵ و ناخۆشە ئەمە بۆ دە ساڵ دەڕۆیی، بەڵام کاریگەرییە ڕۆحی و جەستەییەکان ئازادیان نەدەکرد، هەمیشە ڕەشپۆش بوو شاهپورە ڕەشیان پێدەگووت، شاهپور دەستی بە ڕوخساری داهێنا، بەڵام لە یەك ساتدا دەستی بەر برینێکی کۆن و قووڵی ڕوومەتی ڕاستی کەوت کە دەمی لێك کردبۆوە، لەوکاتەدا شتێ ئاگری لە دڵی بەردا، لەگەڵ ئەوەی زامەکەی وردە وردە گۆشتەوزوون ببوو، بەڵام هەر کاتێکی دەستی پێدا دێنا وەك بڵێی برینی ڕقێك بەسەر دڵیەوە دانیشتبێ و خوێی پێدادەکەن، دەمارەکانی ملی ئەستور دەبوون و دەموچاوی لە تورەییان تێکدەچوو، یادەوەری چەند ساڵەی پێشوو زۆر ئازاری دەدا، ئەم یادگارییە وەك پەلەپیتکەیەك بوو لە هەر کاتێك هۆشیاری دەکردەوەو بیرۆکەی تۆڵەسەندنەوەی بە مێشکی دادێن، ڕەنگە ئەمشەو

بتوانێ ئەوشتەی کە لە ماوەی ئەم چەند ساڵە ئازاری دابوو کۆتایی پێ بێنێ، ساڵانی پێشوو یەکێ لە ڕۆژەکانی سەرەتای پاییز بوو شاهپور بەپەلە لە فەرمانگەوە بۆ ماڵێ دەگەڕایەوە تا هاوسەرەکەی لەوە زیاتر تەنها نەبێ، بەڵام لەناکاو ڕەسولە مشکە و مەهرانی برا بچووکی و چەند کەسێك لە بەردەستانیان لەسەر ڕێگای قووت بوونەوە، ڕەسول لەبەر جەستە و جووڵەکانی بە مشك ناسرا بوو، بە شەڕانگێزی گەڕەکەکە دەژمێردراو بەهۆی دارو دەستەکەیەوە هەر کارێکی دەیەویست دەیکرد، لە دەستدرێژی کردنە سەر بچووك و لاوازەکانەوە بیگرە تا چەقۆکێشی و گاڵە گاڵ، بەم هۆیەوە ببووە جێی ترسی خەڵکی ناوچەکە و کەس لێی ڕازی نەبوو هەموویان بێزار بوون لە دەستی، شاهپوریش یەکێ لە کەسە بەڕێزەکانی ناوچەکەبوو خەریکی ئیش و کاری خۆی بوو، ڕەسولە مشکە چاوی بەرایی نەدەدا لەو، بۆیە هەردەم لە وەڕزکردنی چێژی وەردەگرت، ڕەسولە مشکە بەهەمان دەنگی گاڵتەئامێزو سوك پێکردنە هەمیشەییەکەیەوە ڕووی لە شاهپور کردو گووتی: ((وەی وەی، کاکی ئەندازیار! حاڵ و وەزعتان چۆنە؟! پێدەچێ ئەمڕۆکە زۆر سەرقاڵبی، چونکە هیچتان بۆ ئێمەی خەڵکی گەڕەك نەهێشتۆتەوە،،،،،)) ڕەسول تا توانی پلارو قسەی بێمانای پێگووت و بەردەستانی ناچار بە پێکەنین کرد، شاهپوریش هەرگیز نەیدەویست دەسەویەخەیان بێ، بۆیە جگە لە بێدەنگی چارەیەکی دیکەی نەبوو، بەڵام لە ساتێکدا ڕەسول قسەیەکی کرد شاهپور گەرمداهات: ((تۆ کە ئەوەندە سەرگەرمی کارو ژیانتی، بۆچی لە ناوچەکە ئادەم فرۆشی دەکەیت و دەتەوێ ڕۆڵی سەرکردە دەربهێنی؟! دەستت بە جنێوفرۆشی کردووە؟)) ئیدی نەیتوانی لە بەرامبەر ئەم هەموو بێ ئابڕوویی و بێ ڕەوشتیە بێدەنگ بێ، بە تەواوی هێزەوە هاواریکرد: ((ونبە زبلێ و زاڵێ!)) بە گووتنی ئەم قسەیە ڕەسول و بەردەستەکانی گڕیان گرت! بۆیە ڕەسول فەرمانی پێدان تا دەتوانن تێیهەڵدەن تا جارێکی دی فێرە سووکایەتی پێکردن نەبێ، شاهپوریش بەتەنها نەیدەتوانی دەرەقەتی ئەم هەمووە بێت، بڕیاریدا ڕابکات، بەڵام پێش هەموو شتێ لەپڕ چاوی بە بریسکەی تیغی

چەقۆی ڕەسول کەوت و ڕووخساری ئاگری گرت و ڕوومەتی ڕاستی هەڵزڕاند،،،،خوێن فیچقەی کرد،بۆیە خێرا هەڵاتن وشاهپوریش بۆ خەستەخانە گوێزرایەوە، میلەکانی کاتژمێری دیوار هەشتی شەویان پیشانداو شاهپوری لە دنیای بیرەوەرییەکانی ڕابردووی ڕاکێشایە دەر، کاتی ڕۆیشتن بوو بەرەو گەڕەك،شاهپور هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو لە ژێر لێوەوە گووتی: (( ئێستاش سەرەی منە کە تۆڵەی ڕابردووم بکەمەوە ڕەسولە مشکەی بەدفەڕ! وادەزانی وەڵامی تۆمەت و قسە ناخۆش و گاڵتە ئامێزەکانت ناتوانم بدەمەوە؟! ئێنجا تەماشاکەو ببینە چ بەڵایەکت بەسەردا دێنم تا هەموو گەڕەك لە شەڕت ڕزگار بن!)) هەر لەم کاتەدا زەنگی مۆبایلەکەی لێیداو ئەمیش تەماشایەکی کردو ناوی چنگیز پلنگی بەسەرەوە دیت و ئینجا بە گوێچکەیەوە نوساند: ((بەڵێ؟،،،وەی وەی، سڵاو کاك چنگیزی خۆمان! حاڵ و ئەحواڵ؟!،،،چی؟ خەریکە دێم،پەلە مەکە! بەڵێ، هەر بەو جۆرەی کە بەڵێنم دابوو نیوەی پارەکەم لەلایە،،،لەڕاستیدا قودرەتی کەللە شەقیشت لەگەڵە؟!،،،زۆر باشە، بزانە چنگیز خان! من،،،گوێبگرە،چەند خولەکێکی دیکە لەسەر بەڵێنی خۆمم،،،ئەگەر کارێکت نیە؟! لەگەڵ ڕێزی زۆرم،،،،))

شاهپور مۆبایلەکەی داخست و جانتایەکی بچووکی پارە کە لەسەر مێزەکە بوو هەڵیگرت و لە ماڵەوە ڕۆیشتە دەر، لە ڕۆژێکی ساردی زستاندا هەواڵێك بە ئاسایش درابوو کە دوو تەرمی خوێناوی لە تەلارێکی کاوولی تەنیشت کۆمەڵگایەکی مانگاداری لە دووری پێنج کیلۆمەتری دەرەوەی شار دۆزراوەتەوە، زۆر زوو لەگەڵ تیمێك لە کارمەندان بەرەو شوێنی ڕووداوەکە کەوتینە ڕێ، جێگاکەمان گەمارۆداو کەوتینە پشکنین، سەرەتا بەرەو لاشەکان کە ڕووخساریان خوێناوی بوو هی ئەوە نەبوو بناسرێنەوە چووین، دوو گاوان کە یەکەمین بینەری ڕووداوەکە بوون بانگمان کردن و ڕاڤەی مەسەلەکەمان لە زمانی ئەوانەوە بیست: (( لە ڕاستیدا دوێنێ شەو کە سەرەی کاری ئێمەبوو، نزیکەی کاتژمێر یانزەی شەو دەنگە دەنگێکمان لە نێو تەلاری ڕووخاوەوە گوێ لێبوو کە سەرەتا ترساین، چونکە حیکایەتێکی زۆرمان

لەسەر بوونی جن و پەری لە خانوو کۆشکە کۆنەکاندا بیستبوو،هەر بۆیە لەگەڵ ئەوەی دەنگە دەنگەکان ڕوون و ئاشکرابوو کە چەند کەسێك دەسەویەخەی یەکتر ببوون، بەڵام لە ترسان جورئەتی هیچ شتێکمان نەبوو، پاش چەند کاتژمێرێ هەراهەراکە دامرکایەوەو هەموو جێگا بێدەنگ و خەیاڵی ئێمەش ئاسوودە بوو،))

ڕووداوەکانی دووایی یەکێ لە پاسەوانەکان بە ناوی عەباس گێڕایەوە: ((سەعاتێك دووایی کە ئەکبەری هاوکارم خەوت و نەوبەی ئێشك گرتنی من بوو، بۆ خۆم خەریکی گۆرانی گووتن بووم کە لەناکاو دەنگە دەنگێکی سەیر لە نێو خانووی ڕووخاوەوە سەرنجمی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، سەرەتا هەر وامزانی وڕێنەو خەیالاتی خۆم بووە، بەڵام کاتێ چووم ئاوێکم بە دەموچاوم داکرد و وردبوومەوە، بینیم مەسەلەکە ڕاستیە، دووبارە ترس و تۆقین بۆ سۆراغم هاتەوە کە ناکا پێی ئەجندەو ڕۆحەکان لەوێدابن، خێرا ئەکبەرم بەئاگا هێنا، ئێمە بە خەیاڵی ئەوەی ئەجندە دەنگی دێت و ئازارماندەدەن ترساین و شڵەژاین، هەردووکمان نیگەران و هەراسان بووین و نەماندەزانی کە پێویستە چیبکەین، لەپڕ من دوو تارماییم بینی کە بەپەلە لە تەلارەکە دەرچوون و لە تاریکی شەودا ون بوون، تێگەیشتم ئەم ماستە موویەکی تێدایە و شتێ ڕوویداوە، لەگەڵ ئەکبەر بەپەلە بۆ ناوەوەی تەلارەکە چووین و دوو تەرمی نوقمی خوێنمان بینی، کە دوو گەنج بوون و لەو گۆڕە بە پاڵکەوتوویی کەوتبوون، بەهەر بەدبەختیەك بوو بەسەر ترس و تۆقینماندا زاڵبووین و بێ وەستان زەنگمان بۆ پۆلیسی· لێدا،،،))

لە دووای لێپرسینەوە لە شایەتحاڵەکان، لاشەکانمان بەرەو ساردخانە گواستەوە تا قۆناغە یاساییەکان کاری خۆیان جێبەجێ بکەن، ڕۆژی پاشان هەواڵم پێدرا کە پیاوێك بە ناوی ((اسدا،،،)) پەیوەندی بە ئاسایشەوە کردووە و گووتویەتی کە دوو کوڕی بە ناوەکانی ڕەسول و مەهران بزر بوون،لە یەکەمین دەرفەت کە چاوم بە اسدا،،،کەوت،بۆ ساردخانەمان بردو تەرمەکانمان پیشاندا،بە بینینیان کوڕەکانی ناسیەوەو بە گریانەوە وەریگرتنەوە، نووسراوو ڕاپۆرتی پزیشکی یاسایی جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە کوژراوەکان بە ئامێرە بڕەرەکان

کوژراون، لێکۆڵینەوەکانی پۆلیس هەر بەردەوام بوو، باوکیان لەگەڵ ئەوەی لە دۆخێکی ڕۆحی و هەل و مەرجێکی باش دا نەبوو، بەڵام هەوڵی لەگەڵ دەدایین بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا سەرە داوێ بدۆزینەوە و زووتر بە بکوژ یا بکوژانی کوڕەکانی بگەین، بۆیە هەر بیری لە یادەوەرییەکانی ڕابردوو دەکردەوەو بیرو هزری خۆی دەپشکنی، تا ئەمەی بیرکەوتەوە یەکێ بە ناوی شاهپور کە لە هەمان گەڕەکدا ژیانی بەسەر دەبرد،ماوەیەك بوو کە پەیوەندی لەگەڵ کوڕە کوژراوەکانی دا ساردو سڕو ناخۆش بوو، ماوەیەك پێش ئێستا جارێکیان شاهپور ڕێگای بە اسدا،،،،گرتبوو هەڕەشەی ئەوەی لێکردبوو کە ئەگەر بێت و کوڕەکانی لەسەر بێزار کردن و شەڕ پێ فرۆشتنی بەردەوام بن،ئەوە ناچار دەبێ لە ڕێگایەکی دیکەوە چارەیان بکات، بۆیە لەم ڕووەوە گومانی لە شاهپور بوو، ناوونیشانی شاهپورمان وەرگرت و بە سۆراغیەوە چووین، بەڵام ئەو لە ماڵێ نەبوو کەسیش لە خەڵکی گەڕەك نەیبینیبوو، بۆیە ماڵەکەیان بەهۆی کارمەندانەوە خستە ژێر چاودێری و پرسین و لێکۆڵینەوە، وە بۆ دۆزینەوەی شوێنەکەشی هەر بەردەوام بووین، لە درێژەی بەدوواداگەڕان و وەرگرتنی زانیاری لەبارەیەوە درکمان بەوە کرد کە شاهپور لە بنەماڵەیەکی تاڕاددەیەك دەوڵەمەند و ڕەسەنە و لە کۆمپانیایەکی دەوڵەتی کارێکی گونجاوی هەیە و هاوسەرەکەشی بەهۆی منداڵبوونی ناوەختەوە لەدەست داوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کەسێکی سەر بە گێچەڵ و ئاژاوەچی نیە و هەموو خەڵك بەچاوی ڕێزوحورمەتەوە سەیری دەکەن و ئەگەری ڕوودانی تاوانێکی لە جۆری کوشتن زۆر دوور بوو لەو، پەیوەندیمان بە شوێنی کارەکەیەوە کرد و سەرنجماندا کە چەند ڕۆژێکە بەهۆی مۆڵەت وەرگرتنیەوە بۆ کۆمپانیا نەهاتووە، کاتێ لە ڕێکەوتی دەستپێکی مۆڵەتەکەیمان کۆڵیەوە، زانیمان کە ئەم ڕێکەوتە لەگەڵ ڕێکەوتی ڕۆژی دووایی کە تەرمەکانی تێدا دۆزرایەوە وەك یەکە، بۆیە ئەگەری دەست تێدابوونی شاهپور لەم کارەساتە لە بیرو هۆشماندا بەهێزبوو.

سەرەنجام بە ڕێنمایی یەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانی شاهپور سەرکەوتوو بووین و لە یەکێك لە گوندە دوورەکانی شار و ماڵی یەکێ لە خزمەکانی باوکی دەستگیرمان کردو بەرەو ئاسایش گواستمانەوە،شاهپور لە سەرەتادا بە زەبرو زەنگەوە هەموو جۆرە دەست تێدا بوونێکی لە کوشتنی ڕەسوڵ و براکەی ڕەت کردەوەو نکوڵی لێکرد، تەنانەت بە بیستنی ئەم ڕووداوە داخ و پەژارەشی پیشاندا، بەڵام لە درێژەی ئەوەی کە لێکۆڵینەوەکان شێوەیەکی هونەری تریان بەخۆوە گرت، لە نێو قسەکانیدا ئاماژەی بە بێگوناه بوون و بێ ئاگابوون کرد، ئەمە ئەوی خستە ژێر پرسیارەوەو ئێمەشی بەگومانتر کرد لە خۆی، کاتێك شاهپور بینی لە بەرامبەر پرسیارە تایبەتیەکانی کارمەندانی پۆلیس ناتوانێت بەرگە بگرێت، ناچاربوو دانیپێدا بنێ و پەردەی لەسەر نهێنی تاوانەکە لابرد:

((هەموو خەتای ڕەسوڵە مشکەبوو، نازانم بۆچی لە ئازاردانی من چێژی وەردەگرت و حەزی دەکرد بەهەر بیانویەك بێت یەخەم بگرێت، سەرەتا بەرگەی تەواوی ڕووبەڕوو بوونەوە بێ ڕەووشت وپلارە سووکەکانیم دەگرت، لەبەر پاراستنی شەرەف و ئابڕووی خۆم و خانەوادەم بە کەناری هەموو ئەمانەدا تێدەپەڕیم، بەڵام وردە وردە کارەکە بەجۆرێکی دیکە گۆڕا و هەرچی قسەی سووك و بێمانا بوو کۆیدەکردنەوەو بەمنی دەووتن و هیچ هەستی بە شەرمەزاری یا پەشیمانی نەدەکرد، تا ئەو کاتەی تۆمەتی ناپاکی خستە پاڵ خانەوادەکەم، ئەمەش گەورەترین سووکایەتی بوو بە شەرەفمەوە، ئیدی لەمە زیاتر چیدیکە نەمتوانی بێدەنگ بم و پشتگوێی بخەم، بڕیارمدا بە ناخۆشترین شێوە تۆڵەی لێبکەمەوە تا ئیدی حەزی بێ ڕێزی بەرامبەر هیچ خانەوادەیەکی ئابڕوومەند جارێکی دیکە نەکەوێتەوە سەری، هەر بۆیە پەیوەندیم بە دوو کۆنە هاوڕێمەوە کرد بە ناوەکانی ((چنگیز پلنگ)) و ((قودرەتی کەللە شەق)) کە بە شەڕانگێزی و بەدناوی بەناوبانگ بوون، لەدووای ڕاوێژ بڕیارماندا بیانکوژین و تەرمەکانیشیان بۆ جێگایەکی لاچەپ بگوێزینەوە تا هیچ پاشماوەیەك لەم هەڵەکاریە نەمێنێتەوە، ئەوی ڕاستی بێ لە شەوی ڕووداوەکە من ئامادە نەبووم، بەڵام چنگیز و قودرەت

نەخشەکەیان بۆ جێبەجێ کردم، وە هەر واش بوو سەرکەوتووبوون لە کارەکە،هەر ئەو شەوە بۆ لام هاتن و ئەو نیوە پارەیەی لەسەری ڕێك کەوتبووین و لەلام مابوو وەریانگرت و ئێستاش لە یەکێ لە شارەکانی سنوورن و من هیچ ئاگایەکم لێیان نیە))

لەگەڵ هەماهەنگیە بەکار هاتووەکان و لێکۆڵینەوەکانی پۆلیس پاش چەند ڕۆژێك،چنگیز و قودرەتیش دیلی چەنگاڵەکانی یاسا بوون و بۆ گرتووخانە ڕاپێچیان کردن تا چارەنوسی کۆتایی لە دادگا دیاریبکرێ،بەڵێ،جار هەیە پریشکێکی بچووك دەتوانێ ئەنبارێ بە خێرایی ئاگر تێبەردا و هەموو سەرمایەی مرۆڤ بفەوتێنێ.

# چەرخ و فەلەك

ئێوارەی کۆتاییەکانی مانگی سەرماوەزەو هەوای شار تەماوی و هەورە ڕەشەکان سەرتاپای ئاسمانیان داپۆشیوەو بارانێکی وردو خێرا دەباری و لە نێوان پەڕینەوەو تێپەڕینی مرۆڤەکان کە بەپەلە ڕەت دەبوون پاسێکی شین کە نیشانەی (کارگەی شاهین) بە تەنیشتیەوە دەبینرا لە کەنار شەقامی سەرەکی شاردا ڕاوەستا، سامانی گەنجی بالآبەرز بە قژی لوولەوە کە وادیاربوو تەمەنی ٢٧ ساڵی لە بڕوانامەی ژیانیدا تۆمارکردبوو، لە کاتێکدا سەبەتەیەك لە میوەو خۆراکە سووکەکانی بە دەستەوە بوو قورسی دەکرد، لە پاسەکە دابەزی و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە هەنگاوە درێژەکانی خۆی بە کۆتایی کۆڵانێکی ناسەرەکی کە دەرگای ئاسنینی ڤێللایەکی زەرد دەرکەوت، گەیاند، دەرگای کردەوەو لە نزیك دەرگای هەیوان کاك نیزامەددینی پیرو خاوەن ماڵ لەگەڵ هاوسەرەکەی نادرە کە پێکەوە دەژیان تێپەڕی، وەك هەمیشە یەڵدای هاوسەری بە ڕووخساری جوان و میهرەبانیەوە کە ٢٥ پاییز بە تەواوی یادگارییە تاڵ و شیرینەکانەوەی بەسەر بردبوو بۆ پێشوازی هات و سەبەتەکەی لە دەستی وەرگرت و بە پێکەنینەوە ڕووی تێدەکات و دەڵێ ناکا تەواوی فرۆشگای کارگەی شاهێنت کڕیبێ سەبەتەکە ئەوەندە قورسە! سامان پێڵاوەکانی لە جێگای تایبەت دادەنێ و دەنگی بەرز دەکاتەوە: جارێ یەکەمجار بڵێ گوڵە ئەستێرەی بابە لە کوێیە؟ دڵم بۆی دەرهاتووە، هێشتا قسەکەی تەواو نەببوو کە ئەستێرەی چوار ساڵە بە قژی درێژو خورمایی و چاوانی شینەوە خۆی لە باوەشی پیاوانەی سامان ئازاد دەکات و بە زمانێکی شیرینەوە ڕوو لە باوکی دەکات،بابە خۆراکەکانت کڕیوە، سامان ماچێکی لە ڕوومەتە سوورەکانی ئەستێرە کرد، خوایە بابت قوربانت بێ هەموویم بۆ کڕیوی! ئەستێرە بە خۆشیەوە بەرەو سەبەتەکە ڕۆیی کە یەڵدا لە چێشتخانەکە دایبنابوو، ئەو ساتانە بە شادییەوە دەگوزەرێنن، دووای کاتژمێرێك وەختێ ئەستێرە دەخەوێ یەڵدا ڕوو لە سامان دەکات و دەڵێ: ئەوەی ڕاستی بێ ئەمڕۆ (جەبار و سیروس) ی هاوڕێ کۆنەکانت هاتبوون هەواڵی تۆیان دەپرسی، سامان بە

بیستنی ئەم ناوانە بە حەپەساوییەوە وەك كەسێكی سەرسام ڕوو لە یەڵدا دەكات و دەڵێ: سیروسی دووپشك و جەباری چەپڵە لێدەری كارناسازی ئەمەك نەناس لەنێو ئەم شارە چیدەكەن؟ ناونیشانی منیان لە كوێ پەیداكردووە من خۆم لە كارە نالەبارەكانیان دوور گرتووە، باشە نەیانگووت چ كارێكیان هەیە؟ یەڵدا دەڵێ: نا، تەنها گووتیان بیری سامانمان كردووە و دەمانەوێ ببیبنین، بەڵام سامان ئەوەندە بێتاقەتبوو پەنجەكانی لەتاوا دەتەقاند! یەڵدا بەهۆی ئەمانەوە ژیانمان دۆڕاند و هەموو(سەرپێچی،زیندان، دزی) چوار ساڵان تەمەنم لە پشت شیشە ساردەكانی زینداندا بەفیڕۆدا، باوك و دایكم لە غەمان تووشی نەخۆشی بوون، ناچاربووم لەبەر ناووناتۆرەی خراپ و بێ ئابڕوویی كە لە هامووشۆی هاوڕێی بەدەوە ڕووبەڕووی دەبوومەوە لە شاری خۆمانەوە ئاوارەی شارێكی نامۆبین، خواستی خوا بوو ئەردەشێر خان پیاوەتی نواندو خوا لەخزمایەتی كەم نەكات، كە بەهۆیەوە دەستم لەم كارگەیە گیربوو تا بە لوقمە نانێكی حەڵاڵ خەرجی ژیانمان دەربهێنین، یەڵدا تۆنی دەنگی نزم كرد: خۆشەویستم نامەوێ خۆت بێتاقەت بكەی من متمانەم بەتۆ هەیە وە لەم دوو ساڵەدا سەلماندت كە پیاوانە بەرامبەر بەڵێنەكەت وەستای! توانیت ژیانێكی خۆش بۆ من و ئەستێرە دابین بكەی، ئێمە ڕازین! خواش لە تۆ ڕازی بێ! ویستی خوا بوو، خاوەنماڵێكی میهرەبانی وەكو نیزامەددین و نادرە خانمان هەبوو كە ئێمەیان هاوشێوەی منداڵانی خۆیان خۆشبوێ وخۆشەویستی و دڵسۆزی ئەوان بووە هۆی ئەوەی هەست بە غەریبی و تەنهایی نەكەین،سامان تەماشای ڕووخساری ئەستێرەی دەكرد كە ئارام خەوتبوو، یەڵدا ئەم سیروس و جەبارە هەڵبەتە پلانێك لەنێو كەللەی پوچیاندا هەبووە وا بۆ سۆراغی من هاتوون! بەڵام زۆر سەهوون من ئیدی بە بیرۆكە شەیتانیەكانیان فریو ناخۆم،ساتێك خۆشی لەگەڵ تۆو ئەستێرە بە دنیای پیسی ئەوان ناگۆڕمەوە، یەڵدا بە نیگەرانیەوە ڕوو دەكاتە سامان و دەڵێ: تو گیانی ئەستێرە چیدیكە قسە لەبارەی سیروس و جەبارەوە مەكە، تەلەفزیۆن فیلمی ئاوێنەی عیبرەتدارە لێگەڕێ با تەماشای بكەین، بۆیە هەردووكیان ڕوو لەیەكتر دەكەن و دەست بە

پێکەنین دەکەن، میلەکانی کاتژمێری دیوار تێپەڕبوونی وەخت پیشاندەداو کەم کەم تاریکی دەڕواو سپێتی ڕۆژ بە تینی نیوەڕووی خۆر دەردەکەوێ، بەیانی ڕۆژی دوایی کزەی سەرما بە هەموو جێگایەکدا بڵاوببۆوە، سامان لە کاتێکدا دەستەکانی بە نێو گیرفانی پانتۆڵەکەیدا کردبوو خەریکی هەنگاونان بوو بەرەو ڕێگای وێستگەی کارگەی شاهێن، هەستی بە هەڵوەستەی ئوتومبیلێکی سپی کرد کە سیروسی دووپشك لێیدەخوڕی و جەباریش لەتەنیشتیەوە دانیشتبوو، سیروس دەستی لە پەنجەرەوە دەرێناو گووتی: ئەی بەڕەلاّ، سامانی دەستخۆش چۆنی؟ بۆ کوێ بەم خێراییە ناکەس ڕادەسناکەی؟ سامان ئەحواڵپرسیەکی سارد دەکا: ئێوە لەکوێ و ئەم شارە لە کوێ؟ جەبار گووتی: ئاخر ئێمە وەکو تۆ ناووناتۆرەمان پەیداکردو بووین بە مانگای نێوچەوان سپی کە هەمیشە هەر دزیەك دەکرا پۆلیس بەدووای ئێمە دادەهاتن، بزانە سامان بیستم بوویی بە لێپرسراوی ئەنباری کارگەی شاهین، ئێمە چەند ڕۆژێکە نەخشەیەکی جەهەنەمیمان هەیە ئەگەر حەزدەکەی پارەیەکی زۆرو ئەستور لە باخەڵمان بنێین ئەوە هەروەکو جاران لەگەڵ تۆین، سامان بە توندی ڕوویان تێدەکاو دەڵێ: لێم دوور کەونەوە، خوا ڕزق و ڕۆزیتان بۆ جێی دیکە بنێرێ، ئێستا ماشێنی کارگە دەگاتەجێ، جەبار بە هەڕەشەوە ڕوو دەکاتە سامان: نەکەی سیناریۆمان بۆ بکەی ها، ئاهت بەبەردا دێنێتەوە سامانی خۆشدەستی بەدبەخت، خوا ڕووم ڕەشکا ئەگەر بەلاّیەکی تێدابێ، سامان کە چاوی بە پاسەکە دەکەوێ بێ خواحافیزی بۆلای دەڕوات، سیروس و جەبار تا سواری پاس دەبێ بە نیگایان بەڕێی دەکەن، ئەو ڕۆژە لە کارگەدا سامان بیرو هۆشی جەنجاڵی ئەوە بوو لەو ڕۆژەوەی کە لەم کارگەیەدا دامەزراوە هەوڵ و ڕاستگۆیی خۆی پیشاندابوو، بۆیە ئەردەشێر خان لەدووای تێپەڕینی ساڵێك وەکو سەرپەرشتیاری ئەنباری کارگە دایناو دەست بەکاربوو هیچ کاتێ لە ڕابردوودا تاریکی بۆ ناو ڕووناکیەکی وەهادا پەلکێشی نەکردبوو، سامانیش هەمیشە بە ڕاستی و دڵسۆزییەوە بەزەیی خوای لەبەرچاو گرتبوو هەرگیز بیری لای ناپاکی نەبووە، وەك ئەوەی کە سیروس و جەبار پێشنیاری

دزیان بۆ کردبوو، بێتاقەت و ناڕەحەت بوو، چەند هەفتەیەك تێپەڕی، نیگەرانی سامان لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە گۆڕانکارییەکی لەپڕ لە ڕووخساری یەڵدا دروستبوو، هەر ڕۆژە ڕەنگی پەڕیوترو جەستەی لەڕولاوازتر دەبوو، جارهەبوو وەها بێ ڕەنگ دەبوو وەك بڵێی هەر خوێنی لە لەشیدا نەبێ، لێوانی شین هەڵدەگەڕاو سینگی خیزە خیزی دەکرد، نەخۆشیەکی ترسناك جەستەو ڕۆحی میهرەبانی یەڵدای ئازار دەدا،سامان بەزەیی پێیدا دەهاتەوەو هەمووجار پێی دەگووت چیتە ئەوە وەختە دڵم بۆت بێتەدەر، یەڵدا هەمیشە بە پێکەنینێکی ئارامەوە وەڵامی دەدایەوە و دەیگووت: ئازیزم من هیچ نەخۆش نیمە، تۆ بیرت لای خۆت بێ چونکە ئێستا لە کارگەدا ڕۆژی دوو جاران دەچی و کاری زیادە دەکەی تا بارودۆخی ژیانمان ڕوو لە باشتر بێ، تۆ بیرت لای خۆت بێ، نەخۆشی من بەهۆی کاریگەری قەڵس بوونمە بە وەرزی پاییز، لە سەردانی دکتۆر خۆی دەپاراست، لەگەڵ بەسەرچوونی کات لە نیوەڕۆی یەکێ لە ڕۆژەکان کە خۆری پاییزی کەم ڕەنگترو بێ تین تر بوو بە هاواری ئەستێرەی بچکۆلە کە دەیگووت دایە یەڵدا حاڵی تێکچووە، بە فریام کەون، نیزامەددین و هاوسەرەکەی بە ترساوییەوە پێڕاگەیشتن، بێ وەستان یەڵدایان بۆ نزیکترین خەستەخانەی تایبەتی کە زۆر دوور نەبوو لە ماڵەکەیان گواستەوە، پزیشك بەپەلە پشکنین و کاری پێویستی بۆ ئەنجامدا، پاش کاتژمێرێ سامانی ترساوو تۆقیو خۆی بە یەڵدا دەگەیەنێ و دەستە ساردەکانی بە دەستەکانی خۆی دەگرێ و یەڵداش لە ساتێکدا بە دەنگێکی کزەوە دەڵێت ئەست،،،،رە چۆنە؟ سامان بە دەنگی بەرزەوە دەڵێت: سوپاسی خوا بکە کە خەریکە قسەدەکەی؟ نیگەران مەبە یەڵدا تۆ باشدەبی، خوا لە منت نەستێنێ، ئینجا یەڵدا لە قسە دەکەوێ و چاوانی دادەخات، پەرستار بۆ لای دێت،سامان بەپەلە خۆی بە ژووری سەرۆکی نەخۆشخانە دەگەیەنێ و دەڵێت: جەنابی دکتۆر من گیانی هاوسەرم یەکەمیان لە خوا پاشان لە ئێوە دەوێ، دکتۆر لە پشت مێزەکەی هەڵدەسێ و دەڵێت: بۆچی زووتر خەمتان لێنەخواردووە لوویەك لەنێو سەریدا گەشەی کردووەو پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە، دەبێ تیمێکی

پزیشکی به ئەزموونی خەستەخانە ئەنجامی بدەن، سامان بە بیستنی قسەکانی دکتۆر ئەژنۆکانی سست دەبیٚ و سەری گێژ دەخوات و ڕوو لە دکتۆر دەکات و دەڵێت: دکتۆر یەڵدا تەواوی دنیای من و ئەستێرەی کچمە توخوا کۆمەکی بکەن، ئەم فریشتە میهرەبانە هەمیشە نەخۆشیەکەی لەمن دەشاردەوە، دکتۆر دەڵێت: نیگەران مەبە، سبەی بەیانی پەیوەندی بە ژمێریاری خەستەخانەوە بکە چونکە پارەیەکی زۆری دەویٚ، ئێمەش هەوڵی خۆمان بۆ سەلامەتی نەخۆشەکەتان دەخەینە گەڕ، سامانیش بە پاڕانەوە بە دکتۆر دەڵێت: نیگەرانی خەرجی و پارە مەبن، گیانی یەڵدا لە هەمووشتیٚ بۆ من بە نرخترە، بە چاوانی فرمێسکاوی ژووری دکتۆر جێدەهێڵیٚ و غەمبارانە بۆ پشت سەری یەڵدا دەڕواتەوە و دەیبینی کە چاوانی داخراوەو دڵۆپە زەرداوەکان بە هێواشی دەچنە جەستەی میهرەبانی، بە سەرسامی لێی ڕادەمێنیٚ و هەموو ڕابردووی وەکو ئاوێنە دێنەوە پێشچاوی، بەڕاستی چارەنووسێکی سەیر بوو من و یەڵدا شێتانە عاشقی یەکتر بووین، یەڵدا داخوازییەکی زۆری لە چینی خوێندەوارو پارەدار هەبوو، خانەوادەکەی بە هاوسەرگیریمان ڕازی نەبوون کەچی ئەو لەگەڵ هەموو هەل و مەرجێکی باشی ژیانی تکای لێکردن تا ڕازی بن شووم پێبکات، بەڵام بەداخەوە! یەڵدا لە تەواوی نالەبارییەکانی ڕۆژگار خۆی ڕاگرت، چوار ساڵ زیندانی من لە جموجۆڵی خست بەڵام برۆی لێم گرژ نەکرد، خوایە دەزانی ئەگەر گیانم لە ڕێگای یەڵدا بەختدەکەم و هەرگیز ناتوانم دڵۆپێك لە ڕابردوو میهرەبانی ئەو قەرەبوو بکەمەوە، خوایە چەرخ و فەلەکی ڕۆژگار دەیەویٚ تۆفان لە ژیانی من و یەڵدا و ئەستێرە هەڵبکات، خوایە خۆت کۆمەکمان بکە، سامان بە دەنگی پەرستارێکی گەنج کە دەیگووت: کاکە باش نیە بەم جۆرە ئاهو ناڵە بەسەر نەخۆشدا بکەی، خەیاڵەکانی دەپچڕێت و فرمێسکەکانی پاك دەکاتەوە، پەرستار دەڵیٚ: ماقووڵ نیە لە بەشی ژنان تۆ لای نەخۆش بیت، سامان نیگایەکی ئارام بە یەڵدا دەکاو دەردەچێت، پاش ئێشکگرتنی لە شەوی ڕابردوو بە ماڵیٚ دەگاتەوەو نیزامەددین و هاوسەرەکەی ئەحواڵی یەڵدای لێدەپرسن، ئەویش دەڵێت : بە ئومێدی خوا بەیانی دەردەکەویٚ،

ئەی باشە ئەستێرە لە کوێیە؟ نادرە خانم دەڵێ: لەماڵی زاواکەمانە لەگەڵ منداڵەکان خەریکە، ئێستا خەوتووە ئێوە نیگەرانی ئەو مەبن،سامان دەڵێ: حەزدەکەم ئەمشەو لەگەڵ خوای خۆم خەڵوەت بکەم تا دوعا بۆ یەڵدا بکەم، ئینجا بۆ ژوورەکەی دەڕوات وجێگای یەڵدا و ئەستێرە خاڵیە، دڵی تەنگ دەبێ و بەرماڵ ڕادەخات و بە قەد تەواوی دڵتەنگیەکانی دنیایەك فرمێسك دەڕژێنێ، تا بەیانی لە بەرامبەر دادپەروەری خوایی دوعا بۆ سەلامەتی یەڵدا دەکات، ڕۆژی دووایی لە ژووری ژمێریاری خەستەخانە، وەختێ ژمێریار بە سامان دەڵێت : نەشتەرگەری یەڵدا ٩ملیۆن تومان خەرجیەکەیەتی، ئەویش بیردەکاتەوە خوایە ئەم هەموو پارەیە لە کوێ بێنم، لەپڕ دەستێك بەخۆیدا دێنێ و دەڵێ: ئەگەر بە نرخی گیانیشم تەواوبێ، دەبێ ئەم پارەیە هەر ئامادەکەم بەهای سەلامەتی و زیندوو مانەوەی یەڵدا لەهەموو شتێ باڵاترە، نابێ نائومێدبم، سامان بەشێك لە چەکی سپی لەو جۆرە حسابە بانکیەی بۆت هەیە پارەی لێهەڵبگری واژوو دەکات و بە دەستی ژمێریارەکەی دەدات و بۆ لای بەشەکە دەڕوات، سەرپەرشتیاری خەستەخانە بە سامان دەڵێت : ئەوەی ڕاستی بێ سەردانی نەخۆشەکەی ئێوە قەدەغەیە، پێویستە دەستبەکاربوونی تەندروستی بۆ ئەنجام بدرێ،سامان بۆ بەردەم پەنجەرەی ژووری یەڵدا دەڕوات، یەڵدا دەبینێ کە چاوەکانی داخراوەو لەسەر قەرەوێڵە ئارام خەوتووە، ئامادەکردنی (٩ملیۆن تومان پارە) لە یەك ساتدا بۆ نەشتەرگەری یەڵدا سامان دێنێتەوە هۆش خۆی: تا درەنگ نەبووە پێویستە بیرێك بکەمەوە، لە نەخۆشخانە دەردەچێ و بەرەو کارگە دەکەوێتە ڕێ، بەرپرسیاری نوسینگەی بەڕێوەبەری کارگە دەڵێت : بەداخەوە ئەردەشێر خان بۆ بەستنی بەڵێننامەکانی کۆمپانیا بۆ دەرەوەی وڵات ڕۆیشتووە و نابێ بەبێ ئەو دەست لە هیچ شتێ بدرێ،سامان بەدەنگێکی بەرزەوە دەڵێت : ئاخر هاوسەرم لە خەستەخانەیە وەختە دەمرێ، من پێویستیم بە ٩ملیۆن تومانە، بەرپرسیاری نوسینگە دەڵێ: ئەی بابە جا دڵت بەچی خۆشکردووە، دەزانی ئەم پارەیە چەندە زۆرە، خۆ ئەردەشێر خانیش لێرەبایە پێی نەدەدای، ئەمیش کارگە جێدێڵێ و

بەرەو ماڵێ دەڕواتەوە، ئەستێرەی بچکۆلە بە بینینی سامان دەست بە گریان دەکات، باوکیشی هەوڵدەدات ئارامی بکاتەوە: ئازیزم بۆچی دەگری دایکت چەند ڕۆژێك پشوو دەدات، دەبێ تۆش دوعای بۆ بکەی، ئەمڕۆش وابڕیارە پورە مریەم و دایە گەورەت میوانمان بن باش نیە لەبەرچاوی وان خۆت بێتاقەت بکەیت و بگریەی، من بەڵێنت پێدەدەم هەر ئەمڕۆو سبەینێ یە دایکت چاکدەبێتەوە، ئەستێرەی بچکۆلە چاوە شینەکانی بە فرمێسك تەڕ ببوو، بە ئاهو ناڵە دەستە منداڵانیەکانی بۆ ئاسمان درێژ دەکات (خوایە دایە یەڵدام لە تۆ دەوێت).

– ئافەرین! کچم دوعا بکە،خوا لەنێو دڵە شکاوەکانە، دڵنیابە دوعای تۆ پاك و بێگوناهەو گیرا دەبێت، سامان ئەستێرە بۆ لای نادرە دەنێرێ و بە چاوە فرمێسکاوییەکانیەوە لە ماڵ دردەچێت، نیگەران و پەشۆکاو لە نێو شەقامە جەنجاڵەکان کە مرۆڤەکان لە دنیای تەم گرتووی ژیانیان نوقوم بوون هەنگاو هەڵدەگرێ و لەبەرخۆیەوە دەڵێت: ئەم خەڵکانە هەڵبەتە خەم و خەفەتێکیان وەك من لە دڵدایە و ناتوانن بەوانی دیکەیان بڵێن و ئازار دەکێشن و بەرگەیان دەگرن، جاریش هەیە کە زۆریان بۆ دێنێ ماندوو دەبن و لە پێ دەکەون،بەداخەوە مرۆڤایەتی و مرۆڤدۆستی تەواو بووەو هیچ کەسێ وەکو جاران کۆمەك بە کەسی دی ناکات،هەموو لە بیری خۆیاندان، وردە وردە نمەی باران تۆزو تەم ومژی دنیای لەناو دەبردو ڕێبوارو ئۆتومبێلەکان لە حاڵەتی تێپەڕیندا بوون، هەر یەکەیان بە جۆرێك بەبەرچاوی سامانی دڵ بەخەم دا ڕەت دەبوون، سەیرە! مرۆڤەکان هەموو لەخۆیاندا نوقوم بوون و هیچ سەرنجێکی ئەویان نەدەدا، سامان گشت دەرگاکانی بە داخراوی بەسەر ڕووی خۆیدا دەبینی، لەناکاو هۆڕینی ماشێنێکی سپی کە شوفێرەکەی سیروس بوو جەباریش لە تەنیشتیەوە بوو، سەرنجی سامانیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشا و قسە گۆڕینەوە لەنێوانیاندا دروستبوو،،،

دنیایەکی تاریك و بێدەنگیەکی غەم ئەنگێز هەموو جێگایەکی گرتبۆوە، شار بە خەوێکی قووڵدا چووبوو، لەو تاریکی و ڕەشێتیەی شەودا شەش جووتە چاو لە خاڵێکی تاریکی کارگەی شاهین ڕامابوون،ساتی دووایی قوفڵی گەورەی دەرگاو

ناوەوەی ئەنباری مەڵبەندی کارگە بە کلیلێك و بە هێواشی دەکرێتەوە،سێ پیاو لەو کەسانەی پلانەکەیان بە باشی جێبەجێدەکەن، خۆشحاڵبوون، بەلاَم چەند خولەکێ دووایی دەنگی گڕی پیرەمێردی پاسەوان بەناچاری چرایەکی پێکردبوو، هەموو لە جێگای خۆیان وەك بزمار چەقین: وەی وەی! چاوت ڕوون چ مرۆڤێکی بێ چاوڕووی، چاکم ناسیتەوە،دزی بێ ماریفەت ئێستا زەنگ بۆ پۆلیس لێدەدەم تاکو بێن، بە من دەڵێن (بابە شێر حەیدەر) لێناگەڕێم ڕاکەن، پیرەمێرد هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو لەناکاو تەنێکی بڕەر لە دەستە بەهێزەکانی یەکێکیان دەردەکەوێ و بێ بەزەییانە لە دڵی پیرەمێردی ڕۆدەکات ولەخوێنی خۆی دەگەوزێنێ، پیرەمێرد دەکەوێتە سەر زەوی، کابرایەکی بالاَ بەرزیشیان خێرا هەڵمەتی بۆ دەبات و قەممەکە لە گیرفانی چاکەتەکەی خۆی دەشارێتەوەو دەڵێت: ئاخر هەی ناپیاو لەبەرچی پیرەمێردی بێچارەت کوشت، ئەی وابڕیار نەبوو کە دەستمان بە خوێنی کەس سوور نەکەین، یەکێکیان کە لەڕولاوازە بە تووڕەییەوە ڕوو لە هاوڕێکەی دەکات: هەستە بابە! لەخۆڕا دەتەوێ کاتمان بەفیڕۆ بدەی، ئەگەر درەنگ بکەوین سەرئێشەمان بۆ دروستدەبێ، بۆیە هەرسێکیان دەست بە کۆکردنەوەی سەروەتە دزراوەکە دەکەن، چەند خولەکێك بە دوواوە پیاوەکان وەکو کونەپەپوویەك لە ڕەشایی شەودا وندەبن، بەیانی یەکێ لە ڕۆژەکانی پشوو ئاگادار دەکرێینەوە ڕووداوێکی دزی و کوشتنێك لە کارگەی شاهین قەوماوە، بێ دوواکەوتن بە هەماهەنگی یاسایی و یاوەری تیمێکی پشکنینی شانۆی تاوان بەرەو شوێنەکە بەڕێکەوتین،لەبەردەم دەرگای ناوەوەی ئەنباری کارگە پیرەمێردێکی لاواز نزیکەی ٦٥ ساڵە بە قەمسەڵەیەکی ڕەش و پانتۆڵێکی شینی ئاماڵ ڕەش بە جۆرێ کە جلەکانی لە خوێندا شەلاَڵ ببوو، لەو گۆڕە و لە خوێنی خۆیدا گلاراوو هیچ جۆرە پاشماوەیەکی ژیانی تێدا نەدەبینرا کەوتبو و چرایەکی شکاویش بەهۆی بەر زەوی کەوتن لە تەنیشتیەوە دەبینرا، وێنەی هەموو دیمەنەکان دەگیراو سەرپەرشتی شوێنەواری بەجێماویش دەکرا، پزیشکی یاسایی لە جەستەی کوژراو دەستی بە لێکۆڵینەوە کردو ڕایگەیاند کە بەهۆی ئامێرێکی بڕەرەوە کوژراوە،

لەگەڵ بەردەوامی توێژینەوەکان هیچ جۆرە کوشتارێکی تاوان لە شوێنەکە بوونی نەبوو، ڕەنگە تاوانباران بۆ ونکردنی شوێنەواری (کوشندەی تاوانەکە لەو شوێنە دوورکەوتبنەوە)، بەو لێکۆڵینەوانەی ئەنجام دەدرا بەوە گەیشتین کە کوژراو ناوی (حەیدەر،م ناسراو بە بابە حەیدەر) ە، کە ساڵانێکە بەناوی پاسەوانی کارگەی شاهین ئەرکی خۆی بەجێدێنێ، سەرجەم کارمەندانی کارگەکە لە کوشتنی دڵ پرووکێنی بابە حەیدەر داخ و پەژارەی خۆیان پیشاندەدا و خوازیاری چاوخشاندنەوەی زیاتر بوون بە دۆسیەکەی لەپێناو دەستگیرکردن و بە سزا گەیاندنی بکوژ یا بکوژان،ڕێگای یاسایی و داوەریانە دەگیرێتەبەر و تەرمەکەش بەهۆی ئوتومبێلی فریاگوزارییەوە بۆ ساردخانەی نەخۆشخانە دەگوێزرێتەوە، لەگەڵ ئەو پشکنینانەی کە لە شوێنی ڕووداوەکە ئەنجاممان دەدا، (کیانوش) ی یاریدەدەری کارگە ئاشکرای کرد کە گومانمان لە کەس نیە، کاتێکیش پرسیارمان لێدەکرد ئەی کام لە کارمەندانی ئێوە نەدەهاتن یا مۆڵەتیان وەردەگرت،ئەو دەیگووت: تەنها دوو کەس لە کرێکارانمان بە ناوی رامین و سامان، کلیلی ئەنباری کارگە لە لای چ کەسێکیان بووە؟ کیانوش دەڵێت: لای سامان بووە، چونکە جێگای متمانەی کارگەکەیە و بەرپرسی ئەنبارەکەشە، چەند ڕۆژێکە سامان لە مۆڵەتیشدا بووە بۆیە کلیل لای فیروزە، ناونیشانی سامان و رامینی لێوەردەگرین، توێژینەوەو نوسراوو ڕاپۆرتمان ئامادەدەکەین و لە کارگە دەچینە دەرەوە، کۆبوونەوە لەگەڵ دەستەی هۆشیاری و پێداچوونەوەی وردی پشکنینی دۆسیەی کوشتن و دزی لەگەڵ هاوکارانم جێبەجێ دەکەین و بەو ئەنجامە دەگەین کە ڕەنگە:

- دزەکە یا دزەکان وە بکوژ یا بکوژەکان، شارەزاییەکی تەواویان لە چوونە ژوورو دەرچوونی دەوروبەری کارگەکە هەبووە بەم شوێنە نامۆ نەبوون، چونکە بێ هیچ جۆرە تێکدانێك نەدەبینرا بە کلیل دەرگای ئەنباری سەرەکیان کردۆتەوەو دەستیان بە دزی کردووە .

- بابە حەیدەر بەکامە گوناھ کوژراوە؟ لەوانەیە بێ ویستی خۆی دەسەویەخە بوبێتەوە لەگەڵیان کە دوواجار بە کوشتنی ئەو کۆتایی هاتووە، لەوانەشە بابە حەیدەر یەکێك لە تاوانبارەکانی ناسیە و ئەمیش بۆ ئەوەی ئاشکرای نەکات کوشتوویەتی، هەزاران پرسیار بوونیان هەبوو کە دەبوو بێ هیچ جۆرە کات بەفیڕۆدانێك بەدووای سەرەداوی ڕووداوەکەدا بچین، سەرەتا لە کارمەندانی کارگەکەوە توێژینەوەکانمان دەست پێکرد، بە لێکۆڵینەوە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکان و بە دزییەوە لە پەردە لادان بەسەر ڕووداوەکە نزیك بووینەوە، وادەرکەوت رامین لە مۆڵەتی سەردانی ڕێگایەکی دووردا بووەو لە شەوی قەومانی کارەساتەکە لەم شارەدا نەبووەو دەستی لەم ڕووداوەدا کەمتر دەهاتە بەرچاو، بەڵام سامان ئەزموونی زیندانی پێشتر هەبووە، بەڵام پاش دامەزراندنی لەم کارگەیە هیچ جۆرە تاوان و شتێکی ناشیرینی لێنەبینراوە، بەڵام لەو توێژینەوانەی لەنێو شاردا ئەنجام دران، وا دەرکەوت هەفتەی پێشوو دوو کەس لە هاوڕێیانی سامان کە لە تاوانبارانی پێشوو هەڵەکاربوون هاموشۆی ئەویان کردووە، سامانیش بۆ خەرجی نەشتەرگەری هاوسەرەکەی پێویستی بە نۆ ملیۆن تومانی نەختی هەبووەو ڕووی لەهەر دۆستێك کردووە هیچ کامێکیان نەیانتوانیوە گرفتەکەی چارە بکەن، لە هەمووی گرینگتر ئەوەبوو کە ڕۆژی دووای دزیەکە ٥ ملیۆنی پارەی نەختی بە ژمێریاری خەستەخانە دابوو، چاکترین جێگا بۆ دیتن و دەستگیرکردنی سامان خەستەخانە بوو، لە یەکێ لە ڕۆژە ساردەکان کە بەفری زستان بەردی حەوشەی خەستەخانەی سپی پۆش کردبوو، پیاوێکی نیگەران لەسەر کورسیەکی پانی دارینی خەستەخانە بەرامبەر پەنجەرەیەك کە بەشی لەجێکەوتووی ژنان بوو دانیشتبوو چاوی لە هاوسەرەکەی کە بێهۆش پاڵکەوتبوو بڕیبوو، وەها نوقمی بیرو خەیاڵاتەکانی بوو دڵمان نەهات ئارامیەکەی لێ تێك بدەین، بەڵام چارەیەکمان نەبوو،قازی وای لە دۆسیەکەی ڕاگەیاندبوو کە دەبێ دەسگیربێ تا لێکۆڵینەوەو پرسینی لەگەڵدا بکرێت، بەهێواشی دەستێکی لە شانی دەدەم و خۆمی پێدەناسێنم کە من ئەفسەری هۆشیاریم، چەند پرسیارێکمان هەیە و دەبێ بۆ

پۆلیسخانە بێیت، سامان لە جێگاکەی هەڵدەستێ و دەڵێ: لە ڕاهی خوا تەماشاکە ئەو ژنە هاوسەری منە و دایکی منداڵەکەمە، خەریکە دەمرێ بەزەیی و پیاوەتی بۆ کوێ ڕۆیشتووە، لەگەڵ ئەوەی دەمزانی کە سامان خۆی لە ڕابردووی تاریکی دوور گرتووە، پێی دەڵێم: بزانە سامان تۆ بابە حەیدەر دەناسی، جا کوژراوە، بە بیستنی ئەم قسەیە خێرا ڕەنگی دەپەڕێ و دەڵێ: خوا ڕیسوایان بکات ئەم بێ بەزەییانە کە پیرەمێردێکی خۆشەویستیان وەها کوشتووە، باشە ئەی بۆچی من وەڵام بدەمەوە؟

- بزانە سامان گیان! ئێمە هەست بە حاڵەتی تۆ دەکەین، بەڵام مەسەلەی کوشتن و دزی کارگە و ڕووداوەکان لەم ماوە کورتەدا زۆر پەیوەستن بە تۆو لەگەڵ تۆ یەك دێنەوە، ئێستا هەستەو لەگەڵمان وەرە، ئەو کە نەیدەویست دایکی یەڵدا کە لە ژوورەوە لە پشت سەری کچەکەی بوو لە دسگیرکردنی ئاگاداربێ، زۆر بە ئارامیەوە دەڵێ: داوایەکم لە ئێوە هەیە.

- چ داوایەك؟

- تەنها ڕێگام بدەن چەند خولەکێك بە تەنها بۆ نێو بەشی ژنان و پشت سەری یەڵدا بڕۆم بەڵکو بە دایکی بڵێم کارێکم هاتۆتە پێش تا ئابڕووم نەڕوات، منیش بەزەییم پێدادێتەوەو ڕازی دەبم بەجۆرێك کە چاوی لێهەڵنەگرم و چاودێری بم،بۆ لای هاوسەرەکەی دەڕوات، چەند خولەکێك دواتر بەرامبەرم دەوەستێ و دەڵێ: جەنابی ئەفسەر زۆر سوپاس بۆ ئەو متمانەیەی کە پێتکردم چونکە لەم شارەدا من بێگانەم، تەنها تکام وایە زووتر لێکۆڵینەوەکانتان ئەنجام بدەن تاکو من زوو بگەڕێمەوە، منیش پێی دەڵێم: ئەگەر وەك ئەو بەڵێنەی کە ئێستادات، لەگەڵمان بێی بەڵێنت پێدەدەم کۆمەکت بکەم، بە پۆلیسخانە دەگەین بەڵگەی توێژینەوەی لەبەردەم دادەنێم و داوای لێدەکەم ڕاستگۆبێ و جگە لە حەقیقەت شتێکی دیکە نەڵێت، کاك سامان ٥ ملیۆن پارەی نەختی کە بە ژمێریاری خەستەخانەتداوە بۆ مەسەلەی نەشتەرگەری هاوسەرەکەت، لە کوێت هێناوە؟ ئەو بێدەنگ دەبێ، دوایی دەڵێ: جەنابی ئەفسەر ئەم پارەیە کەسێکی نەناس کە حەزناکات ناوی

ئاشكرا بكرێ بەمنی داوە تا هاوسەرم لە مەرگ ڕزگار بکەم، پێکەنینێکی درۆزنەی بۆ دەکەم و دەڵێم: سەیرە لەنێو ئەم دنیا جەنجاڵەدا کە گۆچان لە کوێر دەدزن ئێوە ئەم خۆشەویستەتان لەکوێ پەیدا کردووە، تکادەکەم بۆ بەرزکردنەوەی تۆمەتەکانتان حەزدەکەم ئەم مرۆڤە کە نازناوی فریشتەی زەویە بناسم و ئاشنایەتیم لەگەڵیدا هەبێ.

- جەنابی ئەفسەر وادیارە ئێوە بەرامبەر هەموو کەسێك بەدبینن،هەندێ لە کەسەکان زۆر چاك پێیانخۆشە بە بێدەنگی و نەناسراوی خزمەتی ئەوانە بکەن کە وەکو خۆیانن.

بزانە قسەکانت لەگەڵ حەقیقەتی ڕووداوەکە زەوی و ئاسمانیان لەنێواندایە، ئینجا سامان ڕوو لە من دەکات و دەڵێ: من ئیدی حەوسەڵەی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی ئێوەم نیە، ئەم شارە بەم گەورەییەوە کە هەموو جۆرە کەسێکی تێدا دەژیەت ئێوەش بەدووای کوشتنی بابە حەیدەردا دەگەڕێن؟ من پێی دەڵێم: بەداخەوەم بۆت! ناچارین تا وەڵامی شوێنهەڵگری و بەجێمانی پاشماوەی پەنجە لە شوێنی قەومانی ڕووداوەکە و تەواو بوونی لێکۆڵینەوەکان لە زینداندا بتهێڵینەوە، بەڵام سەرەڕای ئەم خەم و خەفەتانەش کە ئێستا تێیدا دەژیت پێمناخۆشە بێزارت بکەین بەڵام چارەیەکمان نیە ئێمەش کارمەندین و داوای لێبوردن دەکەین، سامان ڕوو لە من دەکات: چ سوودێکی هەیە چ ڕاستی بڵێم و چ درۆ ئێوە هەر دەمگرن و ڕێم لێدەگرن، چیدی قسەیەکم بۆ گووتن نیە من، من دەڵێم: پێشتر خۆت هەڵەکار بوویی و دەزانی هیچ شتێ باشتر لە ڕاستگۆیی مرۆڤ بە مەبەست ناگەیەنێت، دەزانم تۆ فریوت خواردووە و دڵم پێم دەڵێ تۆ بکوژی بابە حەیدەر نیت، بەڵام دەستت لە دزییەکەدا هەبووە، بە ئەفسەری ئێشکگر دەڵێم سامان بخەنە ژێر چاودێرییەوە و هەر کاتێکیش ویستی دانیپێدابنێ ئاگادارم بکەنەوە،ئەوێ بەجێدێڵم، هێشتا کەمێ لە شەو تێنەپەڕیبوو کە ئەفسەری ئێشکگر لە ڕێگای بێ تەلەوە ئاگاداری کردمەوە سامان دەیەوێ قسەم لەگەڵ بکات، بەپەلە خۆم دەگەیەنمەوە وێ و لە ژووری لێ پێچینەوە لە کاتێکدا سامان فرمێسکەکانی

دێنە خوار بەبێ هیچ جۆرە پێشەکیەك زاری بۆ دانپیانان هەڵدێنێ: بڕوابکەن خەریکبوو دەبوومە مرۆڤ و بە یەك لوقمە نانی حەلاڵ لەگەڵ یەڵدای هاوسەرم و ئەستێرەی کچم ژیانمان بەسەردەبرد لەناکاو چەرخ و فەلەك ناسازی لەگەڵدا پەیداکردم، لە بەختی خراپی من هاوسەرەکەم کە بە ئەندازەی تەواوی دنیا خۆشم دەوێ، نەخۆشدەکەوێ و زەلیل و زەبوون لە سوچێکی خەستەخانە ڕادەکشێ، پێویستی بە نەشتەرگەرییەك دەبێ و بڕێکی زۆری پارە تێدەچوو کە بە (٩ ملیۆن تومان) دەخەملێنرا، ڕووم لە هەر کەس و ناکەسێك کرد هیچ کامێکیان ئامادە نەبوو کۆمەکم بکات،کەچی لەبەختی کەچم هاوڕێیانی خراپ و هەڵەکارم لە نێو ئەم شارە نامۆیەش دەستیان لێ هەڵنەگرتبووم و بۆ سۆراغم هاتن، نازانم شەیتان چۆن بۆ نێو پێستم چوو، لەبەرئەوەی پێویستیەکی زۆرم بە پارە هەبوو، ڕاڕا بووم و بەڵێن و پەیمان و تۆبەم شکاندو لە گەڵ سیروسی دووپشك و جەباری چەپڵەلێدەر دزیمان لە کارگە کرد، سوێند بە گیانی یەڵدا هیچ جۆرە نەخشەیەکم لە کوشتنی بابە حەیدەردا نەبووە، ئەو شەوە کاتێ ئەو خوا لێخۆشبووە چرایەکی بەدەستەوە گرتبوو بەرامبەر دەموچاوی منی ڕاگرت یەکسەر منی ناسیەوە، لەپڕ سیروسە دووپشکی بێ بەزەیی بە کێردێك کە لەگەڵ خۆی هێنابوو، خوێنی بابە حەیدەری بێچارەی ڕژاندە سەر زەوی، دڵنیاشم ئەم خوێنە بە ناهەق ڕێژراوە ئێمەی ڕیسواکرد،

من پێی دەڵێم: جەبار و سیروس ئێستا لە کوێن؟

سامان فرمێسکەکانی هەر دەهاتنە خوار و دەیگوت: جەنابی ئەفسەر ئەوان کالاّ دزراوەکانی کارگەیان بە (حیسامی ماڵ کڕ) کە لە شاری دراوسێمان دەژیەت فرۆشتووە، بەشی من کە پێنج ملیۆن بوو پێیاندام و بە بڕێکیش لە پارەکان ماشێنێکی چاکیان پێکڕی و هەر بەویش بەرەو باشور چوون تا لەوێ ماددەی بێهۆشکەر بشارنەوە، ئێوە دەتوانن نیشانەکانی ئوتومبێلەکە لە نوسینگەکانی دەلاّلی وەربگرن، هەموو ئاشکراکردنەکانی سامان منیش دەکەم بە ڕاپۆرت، سامان ڕووم تێدەکات و دەڵێ: جەنابی ئەفسەر یەك داواکاریم هەیە دەتوانم

تەلەفۆنێك بۆ خەستەخانە بكەم، دڵم دەكوڵێ،دەمەوێ هەواڵی یەڵدا بپرسم، منیش بە ئەفسەری ئێشكگر دەڵێم: سامان دەتوانێ بە ئامادەبوونی ئێوە پەیوەندی بە خەستەخانەوە بكات و هەواڵی هاوسەری بپرسێ،پاش هەماهەنگی داوەری بە رێنمایی سامان، حیسامی ماڵ كرێ لە هەڵمەتێكی بێ ئاگایانە دەسگیر دەكەین و كاڵا دزراوەكانیش دەدۆزینەوە، بەیانی زوو بە هاوكاری پیشانگای مالكی ئوتومبێل بەتەواوی نیشانەكانی ئوتومبێلەكە بە ژمارەی،،،،،،و ناسنامەی(سیروس وجەبار) لە گشت سنوری ناوەوەو دەرەوەی شار رادەگەیەنین، چەند كاتژمێرێ دوواتر ژمارەی ئوتومبێلەكەیان دەبێتە جێی سەرنجی كارمەندان تاكو بیانناسنەوە، لە وەستانی بازگەی جاددەیەك بێ ئاگا لەخۆیان دەگیرێن و ماددەی بێهۆشكەریشیان شاردبۆوە و ئەمانیش دەیان پشكنن و ئاشكرای دەكەن، لەگەڵ سەرنجدان بە گرینگی تاوانەكەیان (كوشتن و دزی لە كارگە) ئینجا بۆ بەدەستهێنانی مەسەلەی یاسایی گروپێك لە كارمەندان بەرەو شوێنی تاوانباران بۆ بنكەی دەرەوەی شار دەنێرین و هەردووكیان دەسگیر دەكرێن، بەهۆی كۆكردنەوەی بەڵگەیەكی زۆر لەسەر تاوانەكەیان هەر زۆر زوو دانیپێدادەنێن.

جەبار دەڵێ: سەرەتا ئێمە نەدەبوو لەگەڵ ئەم سامانە ئادەم فرۆشە هەڵەبكەین چونكە تەڵەی بۆ دانایەنەوە تا تاوانی خۆی سووك بێ.

پێی دەڵێم: لێكۆڵینەوەو خوێنی بەناهەق رێژراوی پاسەوان و چاوچنۆكی ئێوە وایكرد رووداوەكە ئاشكرابێ، بۆچی پیرەمێردی بێگوناهتان كوشت؟

سیروسی دووپشك دەڵێ: بریاری كوشتنی كەسمان نەبوو بەڵام هەر لەو كاتەوە كە لە سەرەتای تەمەنمانەوە هەر بەدبەخت و هەڵەكار بووین، پیرەمێردی پاسەوان سامانی ناسیەوەو منیش مەبەستم ئاشكرا نەبوونی مەسەلەكەمان بوو، ناچار بووم بە كێردێك كە لەگەڵ خۆمم هەڵگرتبوو بریندارى بكەم، كەچی نەمزانی لەنێو ئەم تاریكیەدا ئەم برەرە تیژە بە چ جۆرێ بۆ نێو دڵی پیرەمێرد رۆیشتووە، یاری رۆژگار ئەمجارە كردمی بە پیاو كوژ.

دەڵێم: ئێوە دەزانن لەم ماوە کورتەیەدا چ زنجیرە تاوانێکتان ئەنجام داوە: ١ـ کوشتنی بابە حەیدەر ٢ـ دزی لە کارگەی شاهین ٣ـ هێنانەکایەی ترس و تۆقاندنی گشتی ٤ـ هەڵگرتنی بڕێك ماددەی بێهۆشکەرو،،،سیروس و جەبار سەریان داگرت.

جەبار دەڵێ: بەڕاستی کارێکی گەمژانەمان کرد و شەیتان بووین، خوا عەقڵی لێوەرگرتبووینەوە، بیرمان لە ئەنجامەکەی نەدەکردەوە، ئێستاش لەو کارەی کردوومانە پەشیمانین، هەموو ئاشکرا کردنەکان منیش دەکەم بە ڕاپۆرت، دۆسیەیان تەواوو تاوانبارانیش (سیروسی دووپشك،جەباری چەپڵەلێدەر و سامان) بۆ زیندان دەنێرین تا لە پشت حەسارە ئاسنینەکانەوە لە چاوەڕوانی ڕۆژە ڕەشەکانیاندا بن .

# چل ڕۆژ لەنێو بازرگانانی مەرگ

## پێشکەشە بە ئازادەی کچم

پاش نیوەڕۆی یەکێك لە ڕۆژەکانی کۆتایی مانگی خەرمانانی دەیەی حەفتاکان بوو، ئەو ڕۆژە من وەکو ڕاهێنەر لە سالۆنی یانەی شەڕی بۆکسێن و بەرگری پۆلاّیینی خۆیی، سەرگەرمی فێرکردنی هونەرەکانی شەڕ بە قوتابیەکانم بووم لەوەی تیمێکی تەواو لەقورسایبە جیاوازەکان بە ئامادەییەکی باشی لایەنی پێشبڕکێ و شەڕکەرانی قارەمانی بۆکسی پارێزگا کە بڕیاربوو لە ڕۆژەکانی دووایی ئەنجام بدرێت، کۆمکردبوونەوەو نوقمی شادی و لەخۆبایی وەرزشیم بووم کە لەناکاو یەکێ لە قوتابیەکانم لە تەنیشتمەوە وەستاو پێی گووتم: ((مامۆستا هاوکارتان بە ئوتومبێل و پۆلیسەوە لەبەردەم یانە کاریان بە ئێوەیە)) کەمێك پێم سەیر بوو ئەگەری ئەوەم دانا کە بێگومان ئیشێکی تایبەت هاتۆتە پێش بۆیە هاوکارەکەم بۆ بەردەمی یانەکە هاتووە، بە یەکێ لە قوتابیە کۆنەکانم گووت کە کار لەگەڵ منداڵەکان بکات تا من دێمەوە، کاتێ بۆ بەردەم یانە ڕۆیشتم هاوکارم کە پلەدارێکی گەنج بوو پێی گووتم: (( بەرنامەی بانگکردنی کارمەندانەو ئامادەبە، جلی یاسایی بپۆشە و خێرا خۆت بە بنکەی ناوچە بگەیەنە)) منیش پێمگووت: ((مەسەلە چیە؟)) بە پێکەنینەوە ڕووی تێکردم و گووتی: ((خۆت چاك دەزانی کە سوپا چیە و میەی ناوێ، مەسەلەیەکی مرۆڤ ڕفاندن لە جێگایەکی چاوەدێرکراو قەوماوە و ڕەنگە ئاژاوەچیەکان لەو ناوچەیە بن و بارودۆخەکە خراپە)) پێمگووت: (( خوا بەخێری بگێڕێ، خۆم هەستمکرد هاتنی تۆ بێ هۆ نیە، تۆ برۆ من خۆم دەگەیەنمە ئەوێ )) ئینجا خواحافیزی لێکردم ومنیش بە قوتابیانی یانەم گووت: (( خۆتان دەزانن ڕاهێنەری کاری دووەمی منە خۆم چەکداری سوپام، ئێستاش کارێکم بۆ هاتۆتە پێش لەوانەیە چەند ڕۆژێك نەتوانم بۆ خزمەتی ئێوەی ئازیز بێم،گروپەکەتان ئامادەییەکی چاکی هەیەو هەمووتان لەسەر کێشی خۆتانن، با لەجیاتی من جەلال و کەریم بەردەوامی بە مەشقەکەتان تاکو کاتی پێشبڕکێ بدەن)) جەلال و تەواوی منداڵەکان بە ناڕەزاییەوە ڕوویان تێکردم و گووتیان: ((

لەگەڵ جەنابتان نەبێ ئێمە بۆ پێشبڕکێ ناڕۆین)) بە پێکەنینەوە پێمگووتن: (( بەدبەختینە میدالیاکانتان لە دەست دەچێ و کەسیشتان بۆ پاڵەوانی وڵات هەڵنابژێردرێن، بابە گاڵتەم کرد خوا گەورەیە دەگەڕێمەوە، ئێوە بە ئومێدەوە بن و دوعام بۆ بکەن)) ئینجا پاشان بەرنامەی مەشقم بە قوتابیە گەورەکانی یانەکەدا و خواحافیزیم لێکردن، یەکێ لە وەرزشکاران گووتی: ((مامۆستا وەڵا بەجۆرێك خواحافیزیمان لێدەکەی وەك ئەوەی تا کۆتایی دنیا یەکتر نەبینینەوە)) بە پێکەنینەوە پێمگوتن: ((خوا ڕووم ڕەشکا ئەگەر شتێ هەبێ، مەترسن دەگەڕێمەوە)) لە کاتێکدا کە پەشۆکاوی و ئاڵۆزییەکی نەخوازراو لە دڵمدا یاری دەکرد ماڵئاواییم لێکردن و بەرەو ماڵەوە کەوتمە ڕێ، شێوانێکی ئازاردەر سەرتاپای گرتبوومەوە، هەرچەندی بیرم دەکردەوە نەمدەتوانی هۆکاری سەرەکی ئەم نیگەرانیە بێ سنورەم بدۆزمەوە، دڵم گەواهی دەدا کە ئەم کارە مەترسی و هەستیارە و دەتوانێ خاڵی وەرچەرخانی ژیانی ئایندەم بێ، ئایا دەبێ لەڕاستیدا وا بێت؟ وەختێ بە ماڵێ گەیشتمەوە چەندین جار هەوڵمدا دەربارەی کارەکەم کە ڕووبەڕوو بونەوەبووی ئاژاوەچیە چەکدارەکان بوو، لەگەڵ هاوسەرم و بەتایبەتی دایکم کە لەسەر بەرماڵی نوێژ دانیشتبوو قسە بکەم و داوایان لێبکەم بەرامبەر قاپی خوا دوعای سەرکەوتنمان بۆ بکەن، بەڵام وەختێ پەشۆکان و دڵەکوتێی دایکانەشم دەکەوتەوە یاد زمانم قوفڵ دەبوو، ئەوەندە دایکمم خۆشدەویست دڵم نەدەهات نیگەرانیەکانی خۆمی بۆ دەربڕم، هاوسەرو منداڵەکانم وەك هەمیشە بە خۆشەویستیەکی زۆرەوە پێشوازیان لێدەکردم، بەڵام پێم باش نەبوو ئەوانیش بکەمە هاوبەشی غەمم،هاوسەم دواهەمین مانگی دووگیانیەکەی تێدەپەڕاند و لە حاڵەتێکی ڕۆحی باش دا نەبوو، هەر بۆیە تاوەکو کەسیان نیگەران نەبن پێمگووتن: ((ئەمشەو ئیشێکی گچکەم هەیە و دەبێ مانۆڕێك لە ناوچەکە ئەنجام بدەین))

دایکم بەهەمان میهرەبانی پێشوویەوە گووتی: ((کوڕم بڕۆ، بەڵام ئاگات لەخۆبێ)) ئاوازی قسەکەی لەگەڵ غەمێکی ڕاچڵەکێنەر تەبا بوو، لە کاتێ کە

دوگمەی جل و بەرگە پلّنگیەکەم دادەخست بە پێکەنینێکی ساختەوە گووتم: ((مەبەستت چیە دایە؟ بێتاقەتی چی؟ )) دایکم بۆ پێشەوەتر هات و تەماشایەکی سەروسیمای کردم و گووتی: ((جا چ دایکێك هەیە مندالّی خۆی نەناسێت؟ کوڕم ئەوەندە سیناریۆمان بۆ مەکە،بلّێ چی بووە؟ ناکا کارێکت لەگەلّ ئاژاوەچیەکان هاتبێتە پێش؟ خۆت دەزانی کە باوکی خوالێخۆشبووشت هەر چەکداری سوپا بوو، سالأنێکی زۆر لەگەلّیدا ژیام و دەزانم کارێکی هەستیارو پڕ چەرمەسەریە)) چەند ساتێك لە ژیری و بیر تیژی دایکم حەپەسام، نەمدەویست فرمێسکەکانی ببینم، بۆیە خێرا خۆم ئاسایی کردەوەو گووتم: ((ئەی بابە ئێوە هێشتاکەش هەر نیگەرانی حالّی منن دایە گیان، خەیالّتان ئاسوودەبێ، خوایاربێ زوو دەگەڕێمەوە)) دایکم دەستەکانی ڕووەو ئاسمان بلّندکردو گووتی: ((خوایە خۆتدەزانی هەر ئەم کوڕەم هەیە ئەویش بەتۆ دەسپێرم)) من لە ترسی ئەو پرسیارە لەپڕو غافلأنەی خێرا ڕووم لە هاوسەرم کردو هەندێ شتی پێویستم پێ سپارد، مندالّەکانم بەرەو لام ڕایانکردو خۆیان خستە باوەشمەوە، بەبێ ئارەزووی ئەوان نوقمی ماچ و نازو دلّنەوایی ئەوان بووم، قسە خۆشەکانیان هێندەی دیکە ئاگریان تێبەردەدام، بۆ ئەوەی خواحافیزیان لێبکەم هەستم دەکرد کە دەبێ کەسێکی دیکە بم بەلأم چۆن؟ لەکاتێکدا هەولّمدەدا بیرو هۆشی پەرش و بلأوم ڕێکخەمەوە، بۆیە جارێکی دیکە مندالّەکانم ماچکردەوەو پێش ئەوەی فرمێسکم بێنەخوار خواحافیزیم لێکردن و بۆلای ئوتومبێلەکەم ڕۆیشتم و ڕێگای ناوەندی بنکەم گرتەبەر، وەختێ بە مەلّبەندی فەرماندەیی گەیشتم بێ ڕاوەستان بۆ شوێنی جبەخانەیان ناردم و چەك و تەقەمەنی و بێتەل و ئامێری پێویستیان پێ سپاردم، ئینجا لە ژووری فەرماندەیی چۆنیەتی سەقامگیری لە بۆسە و ئیش و کارەکانمان و بەرەو ڕووبوونەوەمان لەگەلّ ئاژاوەچیان لەسەر دەستی لێپرسراوی چالاکیەکان بۆ ڕوونکرایەوە، لێپرسراوی چالاکیەکان گووتی: ((ئێوە دەبێ بۆ ٥٠ کیلۆمەتری ڕۆژهەلأتی ناوچەی خۆپارێزی بڕۆن و لەگەلّ ئەندامانی بنکە بەرەو شارێك بچن تا لە بۆسەی شەوانەی بەردەوام دابن و لە ئاژاوەچیەکان بدەن)) لەدووای کۆتایی

دانیشتنی ڕێنمایی فەرماندەکان من لەتەك ژمارەیەك کارمەندی بە ئەزموون کە لەم کارە لەگەڵماندا بوون هەستم بە ئارامیەکی تایبەت کردو پاش سلاّو ئەحواڵپرسی دۆستانە کە لەگەڵ تاکە تاکەی ئامادەبووان ئەنجامم دا سواری یەکێ لە لاندکرۆزەکان بووم کە دۆشکاو پێویستیەکانی هۆشیاری لەسەر بوو بە هاوڕێیەتی چەندین ئوتومبێل و پاترول و،،،بەڕێکەوتین، لەوکاتەدا کە هەتاو کەم کەمە چادری زێڕین و ئاڵتونی لەسەر ڕووی شار کۆدەکردەوەو هەواڵ گەیشتنی شەوی ڕادەگەیاند بە بنکەی دەرەوەی شارێکی ڕۆژهەلاّتی ناوچەی خۆپارێزی گەیشتین، هێشتا چەند خولەکێك لە گەیشتنمان بۆ وێ تێنەپەڕیبوو کە یەکێ لە هاوکارانم پێشنیاری ئەوەی کرد بۆ ڕەواندنەوەی ماندوویێتی ڕێگامان با هەر بە ئوتومبێل پیاسەیەك بەدەوری بنکەکەدا بکەین، بۆیە ئێمەش هاتینە دەرەوە، بەلاّم هێشتاکەش پەشێوی دەروونم تەواو نەببوو، لەبەر خۆمەوە گووتم: ((ناکا ڕووداوێکی شووم لە ڕێگادا هەبێ! ڕەنگە ئەم کارەش وەکو کارەکانی پێشووم بێ و دڵم لەخۆڕا بگوشرێ! خوایە خۆم و ئەندامانی هاوڕێم بە تۆ دەسپێرم،)) هاوکارم بینی من کەوتوومەتە قووڵایی بیرکردنەوەوە ڕووی تێکردم و گووتی: ((بابە چیە وا زۆر بیردەکەیتەوە، بێ ئاگا یا خۆی دێت یا نامەیەکی، وەرە زوو بگەڕێینەوە بنکە تا شەومان بەسەرا نەهاتووە)) پێکەنینێکی تاڵم خستە سەر لێوانم، ئینجا ڕووم تێکردو گووتم: ((خۆش بە حاڵتان هەمیشە لەنێو ژیانتان ئاسوودەو بێ خەیاڵ و خوڕەمن؟ دەزانن مرۆڤیان ڕفاندووەو ئاژاوەچیەکان لەم شوێنەدان و ئاسایشی ئێرە خراپە؟)) هاوکارم گووتی: ((لەگەڵ خوای خۆتبە و هەقت نەبێ)) لەدووای چەند خولەکێك بە بنکە گەیشتینەوە،پاش نوێژو نانخواردن هەموو بەدەوری یەکەوە دانیشتین،هەندێ لە منداڵەکان بە گاڵتە و گەپ هەوڵیاندەدا کەشێکی سەرنج ڕاکێش دروستبکەن، لەپڕ چاوم بە یەکێ لە باشترین هاوکارم کەوت کە لەبارەی ڕەووشتی کردارو ڕەفتاریەوە سەرمەشقێ لە چاکەکان بوو، محەمەد ڕەسول گەنجێکی ٢٥ ساڵە بوو خۆش ئەندام و ڕووخۆش کە مامەخەمەی منداڵەکانی چەکداری سوپا بوو، ئەو شەوە وەها لەگەڵ هاوکارانم

پێدەکەنی، بەڵام دووایی زانیم خەیاڵی لە جێگایەکی دیکەیە، سیمایەکی نورانی هەبوو، وەك بڵێی دڵی لەم دنیایە هەڵکەنرابوو ڕۆحی بە دنیایەکی دیکەی نهێنی ئامێزدا دەڕۆیی، لە یەك ساتدا یادی کڕنوشە درێژو فرمێسکە شاراوەکانیم لەماوەیەکی زۆری هاوکاریمان کەوتەوە بیر و دڵم داخورپا، واتە ئەم هەڵس و کەوت و جوڵانەوەو ڕووخساری هەمیشە میهرەبان و دڵڕفێنی منیان بۆ بیرکردنەوەی دوور دەبرد؟ ئایا ئەویش بارودۆخی وەکو منە؟ یان ئەو شتێك دەزانێ کە ئێمە نایزانین؟ ناکا کەوتبێتە دڵیەوە ئەمشەو،،،؟ خۆزگە دەرفەتێکم دەقۆستەوەو کەمێ خەمم لا هەڵدەڕشت، بەڵام ئەو ڕۆحێکی گەورەی هەبوو، بەداخەوە کە ناتوانم لەگەڵ ئەم هاوشەڕە چاکەم دەردە دڵ بکەم، وردە وردە وەختی بەڕێکەوتنمان بەرەو کارەکە هات، میلەکانی کاتژمێر نیوە شەویان پیشاندەدا کە گرووپەکەمان پاش دەرچوون لە بنکەی دەرەوەی شارێك لە دڵی تاریکی شەودا لە نێوان کێوو گردە بچووك و گەورەکان کە لە شەودا وەکو تارماییەك دەهاتنە بەرچاو ڕەتبوون  تا بە شوێنی مەبەست گەیشتن، خاڵی بۆسەکەی ئێمە لە نێوان گردە بچووك و وردە بەردەکان بوو کە چەندین کیلۆمەتر لە شارەوە دووربوو جاددەیەکی خۆڵاوی بە مابەینیان دا تێدەپەڕی، بڕیاروابوو ئێمە هەر لە نێو وێدا بمێنینەوە و چاوەڕوانی هاموشۆی ئاژاوەچی و قاچاغچیە چەکدارەکان بین تا وەك بارمتەیەك یەخسیریان بکەین، بە مەبەستی دیتنیان چالاکیمان دەست پێکرد، بۆیە تاك تاکە ئوتومبێلەکانمان لەو خاڵانەی کە لێپرسراوی چالاکیەکان ڕایگەیاند جێگیرکردو وە ئەوانەی دۆشکایان لەسەر چەسپێنرابوو گەنجێك بەسەر لاندکرۆزێکی پلنگیەوە بە دڵنیاییەکی تەواوەوە لە چۆنیەتی چالاکیەکە ئاگاداربوو، جێگیر ببوون و من و هاوکارانی دیکەشم لە تەنیشت ئوتومبێلی دۆشکا لە بێدەنگیەکی پروکێنەر لە نیو دڵی تاریکی شەودا لە چاوەڕوان و بەرەوڕووبونەوە لەگەڵ بازرگانانی مەرگ لە بۆسەی شەوانەدا بووین و ئەرکی سەرشانمان بەجێدەهێنا، لێپرسراوی چالاکی بۆسەکان پێویستی تەواوی بەسەر هەر سێ گرووپەکەماندا کە لە خاڵە جیاوازەکاندا خۆمان ماتکردبوو دابەشکردبوو،

ڕایگەیاند: هەموو شتێ تەواوو ئامادەیە و ئەوەی پێویستە بەبیرمان هێنانەوە، وە هیچ جۆرە ڕووناکیەك لە تاریکی نێو بۆسەدا نابێ ببینرێ و بێدەنگیەکی تەواو بەرقەرار بێ و لە کاتی دیتنی ئوتومبێلی ئاژاوەچیەکان و ڕاگەیاندنی فەرمانە پێویستەکان ئامانجی ئاگرو پەلاماری شەوانە لە بۆسەدا ئەنجام دەدرێت، تاریکی شەو هەموو شتێکی لەناو خۆیدا قووتدابوو، کێوو گردەکانی دەوروبەر هاوشێوەی تارماییەکی سەرگەردان بوون کە ئێمەیان لە ژێرەوە تەماشا دەکرد، دەنگی ترپە نائارامەکانی دڵم تا دەهات زیاتر دەبوون، زارم بۆ ئایەتلکورسی و چەند سورەتێکی دیکە هەڵێنا بیانخوێنم و چاوم بە محەمەد رەسول کەوت کە بە هۆشیارییەکی تەواوو ئازایەتیەکی وەکو لێدانێك لە کاتێ کە چەکی کلاشینکوف و جێ گوللە زیادەکانی بە لێهاتووییەوە هەڵدەگرت، لە سووچێکی بۆسەکەدا سەری ڕووەو ئاسمانی پڕ ئەستێرە بڵندکردو لە ژێر لێوەوە دوعای عاریفانەی دەخوێند، هەستم کرد تەواوی کارمەندی ئەفسەری پلەدار لە ئەرکەکانی ئەو شەوە پەشێوییەکی لەڕادە بەدەریان هەیە، لەناکاو چاوم لە تاریکی بێکۆتایی شەو بڕی، بەڵام تاکە شتێ کە زۆر ئازاری دەدام بێدەنگی بوو، بێدەنگیەکی مەرگهێن زاڵ بوو کە وەك زمانی ژەهراوی مارێك کەم کەم ڕۆحمی دەسمی و ئەشکەنجەی دەدام، بۆ ئەوەی لەم تەنگانە تۆقێنەرە ڕاکەم بە هێواشی لەژێر لێوەوە بە یەکێ لە هاوکارانم گووت: ((بزانە ئەکبەر گیان، من زۆر،،زۆر نیگەرانم! ئەوەی ڕاستی بێ دڵم باش نالێ! نازانم هۆیەکەی چیە، بەڵام باش،،،))

زمانم لە دەمی وشك بووم خولاندەوەو بەردەوام بووم: ((وا هەستدەکەم ئەمشەو ڕووداوێکی خراپ دەقەومێ، ئەم کارە لەگەڵ تەواوی ئەوانەی من دەیانزانم کەمێ جیاوازی هەیە! تۆش ئەمە دەزانی؟!))

لە پڕ هاوکارم چەند سانێك لە تاریکیدا چاوی تێبڕیم، دووایی هەناسەیەکی پڕ دەنگی لە سینەیدا دەرکردو بە وەڕزییەوە گووتی: ((پەنا بە خوا! ئێمەش کەمێ لەو نیگەرانیەمان هەیە بەڵام بەڕێزتان پێدەچێ کەوتبێتنە ڕاڕایی و ئارامیمان تێك بدەن! ئێستا کە بەمنت گووت قەیناکا، بەس ئەم قسەیە بە منداڵانی دیکە نەڵێی

ها! ئەگینا بێچارانە لە ناخی دڵەوە پردیان لێدەپسێ و متمانە بەخۆیان لەدەست دەدەن و بارودۆخەکە تێکدەچێ))

ئاوازی قسەکەی گۆڕی و بە میهرەبانیەوە گووتی: (( ئاخر بۆچی دەقرێنی کە ڕەنگە شتێ ڕوبدات؟ نیگەرانی چی؟ من بە پێچەوانەی تۆ دڵم قایم و پتەوە و هیچ ڕووداوێکی ناخۆش ناقەومێ)) ئینجا دووبارە بۆ بابەتەکەی پێشوو گەڕایەوە.

بە دڵتەنگیەوە گووتم:

- ئاخر بۆ خۆت دیتت هەموو گووتیان ئێرە بۆ خۆ مەڵاسدان جێگایەکی باش نیە! هەر ئەمەیە زۆرتر کە وا نیگەرانم دەکات! ساتێکیش چیە لێم دوورناکەوێتەوە!

هاوکارم سەرێکی باداو گووتی:

- بەڵێ، منیش دەزانم بۆسەنانەوە لە جێگایەکی وەها بەرز باش نیە، هەڵبەت خاڵی چاتر پەیدا دەبوو بەڵام دەبێ تازە چیبکرێ؟ فەرمانی سەرکردەیەو نابێ پێشێل بکرێ، دڵت بە خوا بسپێرە و ئومێدەوارم کە هیچ شتێ ڕوونادات، هەر لەو کاتەدا ئوتومبێلێکی تویوتای بارهەڵگر ڕووناکی دەرکەوت کە سەر بە یەکێ لە بەڕێوەبەرێتیەکانی دەوڵەت بوو، پاش وەستان و پشکنین بە بیانووی ئەوەی کە شوفێرەکە بڕوانامەو فەرمانی کاری نەبوو دەستمان بەسەر بەڵگە و شت و مەکەکانی داگرت و بارهەڵگرەکەمان بەڕێکرد، چەند خولەکێك لە ڕۆیشتنی تیدەپەڕێت، کە لە ڕێگای بێتەلەوە ئاگادار دەکرێینەوە گۆڕانێکی کەم لە هەڵوێست نواندنەکانمان بکەین، هێشتا لە حاڵەتی ئەنجامدانی گۆڕانێکی پێویستدا بووین کە چاومان بە ڕووناکی گڵۆپی کۆمەڵە ئوتومبێلێك کەوت کە بەخێرایی نزیکمان دەبوونەوە،بەپەلە بۆ شوێنی پێشوومان گەڕاینەوەو چاومان لە جاددە بڕی و سەرنجماندا تا بزانین لە پشت ئوتومبێلی یەکەمەوە چەندی دیکەی بە دوواوەیەو چەندیش لێك دوورن،تا ئاستێکی زۆر دڵنیابووین کە ئەم ئوتومبیلانە پەیوەست بە قاچاغچیەکانن، بۆیە خۆمان ئامادەی هەر جۆرە جوڵەیەکی نەشیاو لەلای ئەوانەوە کرد، لەهەمان ساتدا بڕیارمدا بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی باشتر

گۆرانێکی کەم لە جێگاکەمدا بکەم و بۆ پشت تاشە بەردێکی گەورە کە چەند هەنگاوێ بوو لێمەوە بڕۆم،بۆیە بەم مەبەستەوە لە جێی خۆم جووڵام، لەناکاو دەنگی دەسرێژێکی توند ئارامی دۆخەکەی تێکشکاندو شەپۆلێك لە ترس و تۆقین سەرتاپامی لەرزاند، ئاگری گوللەکان ڕوناکیەکی ترسناکی بە گۆڕەپانی شەڕو ململانێکە دەدا، تەواوی ئەندامان کە لە بۆسەدا بوون دەستیان بە تەقەو دەسرێژ کرد، بەبێ ڕاوەستان خۆم بە پشتی تاشە بەردەکە گەیاند، شەڕو پێکدادانەکە تا دەهات زیاتر دەبوو دەنگی تەقەو دەسرێژی گوللەکان مێشکیان کاس دەکردی، دەنگە دەنگی گاڵە گاڵە بەردەوامەکان لەم ناوە دەنگی دەدایەوە و تاریکی لە جەنگی شەوانە شتێکی لە ئازایەتیمان کەم نەدەکردەوە، لە ساتێکدا ئاژاوەچیان بە دەنگە دەنگ و هەراوهۆسەی بێ ئامانیانەوە بۆ چەند ساتێ ئێمەیان وڕو گێژکردبوو نەماندەزانی چ کاردانەوەیەکیان پیشان بدەین، هەر سێ گرووپ لە بۆسەدا بە هۆشیارییەوە دەستمان بە ڕووبەڕوو بوونەوە کرد بەڵام زوو فریای خۆم کەوتم، وا پێویستی دەکرد بەتەواوی بوونمەوە لەخۆم و گشت هاوکارانم بەرگری بکەم و بە عەشقەوە بۆ خزمەتی خەڵکی سەر زەوی تا دووا دڵۆپی خوێن لەگەڵیان بجەنگێم و بەم هۆیەوە پەیامم سەبارەت بە نیشتیمان و خەڵکی وڵاتم بەجێبهێنم، دەستم بە بەگژداچوونەوەدا کرد، لە هەردوولاوە بە توندی گوللە بارانێکی زۆر بەردەوام بوو، لە پڕ سەرنجی نەمانی تەقەی دۆشکەکەی سەر پاترۆڵەکە بووم، وام هەستکرد ئەو سەربازە بە ئەزموونەی لەسەر دۆشکەکە بوو بریندار بووبێ، لەدووای ئەوە دەنگی (الله اکبر) ی محەمەد رەسولی هاوکارم بەر گوێ کەوت، هەر لەو کاتەدا ئاوڕم دایەوە چاوم بە محەمەد رەسول کەوت کە نوقمی خوێن ببوو بە ئارامیەوە زەردەخەنەیەکی ئاسمانی لە گوتن نەهاتووی لەسەر لێوبوو لە سوچێکا هێواش کەوتبوو ڕۆحی بە ئەبەدییەتەوە بەسترابۆوە، چ شایەتمانێکی پڕ شانازی و ڕۆح بەرز بوونەوەیەکی شکۆمەند بوو! توڕەیی سەرتاپای گرتبوومەوە، فرمێسك لە چاوانم بۆ لە دەستدانی باشترین هاوکارم هاتە خوار، دیتنی ئەم دیمەنە کودەتای دەروونمی زیاتر کرد، دووبارە میلی تفەنگم لێهێنایەوەو دەستم بە تەقە

کرد، لە کاتێکدا کە هەندێك لە منداڵان بریندار ببوون و بە ناڵە ناڵەوە خۆیان بە پەناگایەك دەگەیاند، ئاژاوەچییەکان تا دەهات گەمارۆکەیان لەسەرمان قورستر دەکرد، پێشڕەوی ئەوان بە پشتیوانی ئاگری گوللە هاوێژەکان هەر بەردەوام بوو، تەواوی گردی بۆسەکانیان گوولله باران کردو بە ڕیزێکی ڕێك و پێك و ئامادەییەکی تەواوەوە دەهاتنە پێش، ئێمەش هەر لەو کاتەدا بە تەواوی هێزەوە بەرگریمان لەخۆمان دەکرد،لەناکاو دەنگی هاوارێك بەرزبۆوەو ئوتومبێلی دۆشکەکە بۆ کێوێکی ئاگر گۆڕا و بڵێسەکانی دڵی شەویان ڕوناك دەکردەوە، لە کاتێکدا خۆم بەم ڕووداوە زۆر کاریگەر بووم و وا بە خەیاڵمدا هات کە گشت منداڵەکان بکەونە ژێر کاریگەری ئەوەوە،سەیرەکە لێرەدا بوو کە ئاژاوەچییەکان حەشارگاکەی ئێمەیان دۆزیبوەوە و هەموو دەم هەستم دەکرد کە پێویستە جێگاکەم بگۆڕم، بە سینگە خشکێ لە تاریکی دا بەرەو پێشەوە چووم، بەڵام سەرنجمدا دوژمنان بەجۆرێکی سەیر پێشڕەویان کردووە، وردە وردە دەنگی تەقە لە حەشارگای هاوسەنگەرانم نەما و سەدایەکی خنکاو لە گۆشەو کەناری بۆسەکەدا بەر گوێ دەکەوت و هیچ جۆرە ئومێدێکمان بۆ ڕزگاربوون لەم دۆخە دژوارە نەبوو، لە حاڵەتێکی ڕاڕایی وەهادا بووین نەماندەزانی یا شەڕ بکەین یا خۆبەدەستەوە بدەین، ئا لەو ساتەدا بە ئازاری دەموچاوم هاتمەوە هۆش کە بەر ئاگر کەوت، ساچمەیەك بەشێکی لە ڕوومەتم بریندار کردبوو، خێرا پەڕۆیەکم لەسەردانا و لە جێگای خۆمەوە پاشەکشێم کرد، تەقە لەلای دوژمنانەوە هەر بەهەمان شێوە بەردەوام بوو،ئەمەش مانای پێشڕەوەی ئەوانی دەگەیاند لەم شەڕەدا، یەکێ لە قاچاغچییەکان کە جلێکی بلوجی لەبەر بوو بۆ لای یەکێ لە لاندکرۆزەکانی ئێمە چوو تا بۆ حەزی خۆی دەرببێنێ، شوێنەکەی بەجۆرێ بوو کە زۆر باش بوو بۆ پێکانی ئامانجی من، لەگەڵ ئەوەی بە دەم ئازارەوە دەمناڵاند، سێرەم لێداگرت و پەنجەم پێدانا کەچی بەری نەکەوت، بەڵام ئەو کە سەرنجیدام گوللە بارانی کردم، ئیدی بەردەوامیدان بەشەڕ هیچ سوودێکی نەبوو، هەرچەندی چاوم لە نێوان ئاگرو دووکەڵدا دەگێڕا پاشماوەیەکم لە منداڵانی خۆمان نەدەدیت، جگە لە شەهید

بوونی محەمەد ڕەسول چارەنوسی هیچ کام لەوانی دیکەم نەدەزانی، گومانم دەکرد یا بریندار بوون یا خۆیان بەدەستەوە داوە، دەنگە دەنگی دوژمنان کە بە زمانی خۆیان قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد و دەهاتنە پێش بە ئاشکرا دەبیسرا بەجۆرێ کە وام دەزانی ئێستاکە بۆ سەر سەرم دێن، کاتێکیش بە دەست و چەکەوە بمبینن بوارم پێنادەن و لە جێوە دەمکوژن، لە وەختێکی وەهادا خۆبەدەستەوە دان و کۆیلەیەتی لە کوشتن باشتر بوو، خۆ هەر نا ئومێدمان بۆ درێژەدان بە ژیان دەبوو، گەمارۆیاندام منیش بە نائومێدی و نابەدڵیەوە تفەنگەکەم لەسەر زەوی دانا و دەستم بۆ سەرەوە هەڵبڕی و لەژێر لێوەوە ناوی خوام هێناو لە حەشارگام هاتمە دەرەوە، گومانەکەم لەجێی خۆیدا بوو، چواردەورم بە ئاژاوەچی چەك بە دەست و گورگ سیفەت و بێ بەزەیی گیرابوو چاوەڕوانی بچووکترین جووڵەی نابەجێ بوون لێم تاکو جەستەم بە وێنەی بێژنگ کون بکەن، چەند گوللەیەکیان لە دەوروبەرمدا و تۆزو خۆڵ بۆ ناو چاوم چوو، یەکێ لەوان کە لە من نزیکتر بوو بۆ پێشەوە هات و بە توڕەیی و گرژییەکی تەواوەوە سەرتاپاییم بە چاو بەسەر کردەوە، وەختێ چاوی بە پلەی چەکداریم کەوت، سیمای لەپڕ توڕەتر بوو بێ هیچ قسەیەك بە شەق و مشتەکۆڵە و قۆنداغی تفەنگ کەوتە گیانم، یەك دوو کەسیش لە هاوڕێیانی بۆ کۆمەکی هاتن، وەك بڵێی جگە لە مەرگی من هیچ ئامانجێکی دیکەیان نەبێ، ئازار وەکو ئەژدیهایەکی ژەهراوی تەواوی جەستەمی بەخۆیەوە هەڵدەگوشی و خوێن بەسەرو چاومدا هاتە خوار، سەرەنجام لەدووای نزیکەی بیست خولەك کە بە بیست ساڵ بەسەر مندا تێپەڕی، دەستیان لە لێدانم هەڵگرت، هەناسەم بە قورسی هەڵدەکێشا و پەردەیەك لە خوێن ڕوخسارمی داپۆشیبوو، دوو کەسیان بن باڵە بێ هێزەکانیان گرتم و بە ڕاکێش ڕاکێش بۆ سووچێکیان بردم و فڕێیاندامە نێو ئۆتومبیلێکی ساردەوە، دەنگە دەنگی هاوکارەکانم کە لە تاو ئازار دەیاننالاند بەر گوێم کەوت و پاش چەند ساتێ دەوروبەرم قەرەباڵغ بوو:

- کاك ئیسماعیل حاڵتان باشە؟

ـ منداڵان! ئەوانەی کە سەلامەتترن وەرن کۆمەکم بکەن!

ـ وای! بێ ویژدانانە چ بەڵایەکیان بەسەر هێناوە؟ پێویستە هەرچی زووترە برینەکەی بپێچین! پێموایە ڕوخساری قڵەشیوە و بەجۆرێکی خراپ خوێنی لێدێت!

ـ جا کاتمان لە کوێ بوو؟ ئاخر لەم بارودۆخەدا باندج و کەل و پەلی پێویستمان کوا؟ دەبێ هەر بەم چەفیە و جلانەی خۆمان بۆ برینەکانی بیرێکی لێبکەینەوە،،،

دەنگەکان هیچیان لەلام نامۆ نەبوون، بەڵام توانام نەبوو خاوەنی دەنگەکان بە تەواوی دەستنیشان بکەم، پاش چەند خولەکێك کە سەرو چاوم لە خوێن پاکبۆوە بە زۆر چاوم کردەوەو تەماشای دەورووبەرم کرد، بەڵێ خۆیان بوون، چوار کەس لە منداڵەکانی هاوڕێم کە لە چەنگاڵی خوێنینی دوژمنان دیل ببوون، هەموو بە خۆشەویستیەوە لەهەمان کاتدا نیگەران و تورە دەوریان گرتبووم و ئەحواڵیان دەپرسیم، لە دەرەوە دەنگە بەرزو گڕو ڕووشاوەکان کە بە بلوجی قسەیان دەکرد دەهاتە بەر گوێ، سەربازێکی بە کارو خزمەت بە دزییەوە لە دەرەوە ورد دەبۆوەو بە ئەفسوسەوە گووتی:

ـ ئەو نەعلەتیانە ئوتومبێلی دۆشکەکەیان ئاگر تێبەردایە و گشت ئامێرەکانیان بەتاڵان بردین!

ئینجا دەستێکی بە دەموچاوی خۆڵاوی داهێناو بە ڕقەوە گووتی:

ـ خوایە! فریامانکەوە! ئەی هاوار لە دیلی!

من دڵنەواییم کرد، بەڵام ڕستەی دوایی بە توندی ڕایچڵەکاندم،یەکەمین شت کە لە ((دیلی)) بە خەیاڵمدا هات،ناوی پیرۆزی بانوی ئازای دەشتی کەربەلا و یاوەری شەهیدی گەورە (ع) بوو کە حاڵمی گۆڕی و فرمێسك لە سوچێکی چاوانم سەری دەرێنا،

دیلی! سەرەتای سەردەمێکی پڕ لە سووکایەتی و زەلیلی و بێداری کە بەرگە گرتنی دڵ کێوێك و سەبری ئەیوبی دەوێ، ئەمانەش لە دەستی گروپێ کە

هەستیان بە سۆزو بەزەیی نەدەکرد، باوەڕکردنیش گەلێك لایان سەخت بوو بەڵام تازە چارەیەك نەبوو،

(( واتە ئیدی هیچ ئومێدێك بۆ گەڕانەوەی باوەشی گەرمی خانەوادە و دیتنی دایك و هاوسەر و منداڵەکانم بوونی نیە؟ ئەو یاریانە چی بوون دەستی قەدەر لە داهاتوو بۆی تۆمارکردین؟ زیندوو دەمێنینەوە یا دەکوژرێین؟ )) ئەم پرسیارانە و دەیان پرسیاری دیکەی بێ وەڵام هاوشێوەی زەنگێکی گەورەی شوومی مەرگ لە خەیاڵی پەرش و بڵاوم بوونیان هەبوو ئازارو خەمیان زۆرتر دەکردم، تاکە دڵخۆشیم ئەمە بوو کە تەنهانیم و ژان و ئەشکەنجەی کوشندەی دیلێتیم لەگەڵ ژمارەیەکی دیکە دابەشکردووە.

ئازاری سینە و پەراسووەکانم ئۆقرەیان لێهەڵگرتبووم، هەر بەوجۆرەی کە لەتاو ژان خۆم گرمۆڵە دەکرد پرسیم:

- ئێستا ئێمە بۆ کوێ دەبەن؟

یەکێ لە منداڵان بە دەنگێکی دڵخۆشکەر گووتی:

- ئێمەش نازانین،بەڵام نیگەران مەبە! دڵم دەڵێ بەم زووانە هێزەکانی کۆمەك بە هاوارمانەوە دەگەن!

دەنگێکی گڕو بڕاوی سەربازێ سەرنجی ڕاکێشام:

- خودا،،،گوێ لە هاواری زەبوونتان بگرن، جەنابی ئەفسەر من کە،،،،خەریکە،،،لەتاو ئازار،،،،دەمرم!

کە بۆ لای ئەو سەربازە گەڕامەوەو سەرنجم لێدا، ڕۆڵەکەی تاران و شوفێری دۆشکەکە بوو، ناسیمەوە، لە کاتێکدا قاچی بریندارو خوێناوی خۆی گرتبوو پێکەنینێکی تاڵی بۆ کردم و لە نێوان لێوە قڵەشیوەکانیەوە گووتی:

- ئێوە نیگەرانی من مەبن! قاچم،،،قاچم گوللەی پێکەوتووە!

هێشتا هەر گوێم لێگرتبوو تا دڵنەوایی بکەم کە ناڵەیەکی دیکە سەرنجی ڕاکێشام، سەربازێکی بەخزمەتی دیکە بوو دەستی لەسەر قۆڵی ڕاستی دانابوو

لەگەڵ ئەوەی ئازاری دەچەشت و ڕەنگ لە ڕوخساری پەڕیبوو، بەڵام هەوڵی دەدا دەنگی هاواری بڵند نەبێت،

بە نیگەرانیەوە پرسیم:

- چ کەسێکی دیکە گوللەی بەرکەوتووە؟ خوانەخواستە کەسی دیکە جگە لە محەمەد رەسول شەهید بووە؟

ناوی شەهید تەمێکی لە غەم و پەژارە لەسەر ڕوخساری منداڵەکان دانا،یەکێ لە هاوکارانم لە حاڵەتێکدابوو کە بە زۆر تورەیی و ڕقی خۆی قووتدەدایەوە ئاهێکی بەرزی لە سینەیەوە دەرکردو بە نارەحەتیەوە گووتی:

- بەڕاستە محەمەد رەسول شەهید بووە؟

بە دەنگێکی پچڕاو بە هاوکارەکەم گووت:

- بەڵێ ئەو بە ئارەزووەکەی گەیشت، خۆش بە حاڵی هەمیشە حەزیدەکرد شەهیدبێ و ڕۆحی بە ئاسماندا بفڕێ، خۆزگە منیش ئەم شەرەفەم پێ بڕابا و شەهید دەبووم دیل نەدەبووم،

هاوکارم گووتی:

- لەگەڵ خوا بە .

لەگەڵ ئەوەی هێشتا لە هەل و مەرجێکی وەهاشدا ڕۆح و ئومێدی خۆی پاراستبوو، سەیرم پێهات.

لەناکاو دەنگێکی گڕو دوور هەموومانی ڕاچڵەکاند:

- بەڵایەکتان بەسەر دێنین لە مێژوودا بنوسرێتەوە! هەمووتان لەنزیک یەکەوە گوللە باران دەکەین تا ئەوانی دیکە نەتوانن پێش لە کاروانی ((عەبدولجەبار)) بگرن! من عەبدولجەبارم، چاوێکم بۆ لای خاوەنی دەنگەکە گێڕا، پیاوێکی کامڵ بوو وەك گشت ئاژاوەچیەکانی دی جلی بلوجی لەبەر بوو، سمێڵێکی بابڕ و تا پەنا گوێیان درێژ، چاوانێکی زەق و خوێنی ڕەنگی مرۆڤی دەترساند،جێگای کۆنە برینێکی قووڵ لەسەر ڕوومەتی ڕاستی دەبینرا کە تا ژێر چاوی درێژ دەبۆوە، هەموو ئەم نیشانانە سیمایەکی ئێجگار تورە و ترسناکیان پیشاندەدا، بە

لێهاتوییەوە دەستەکانی بە کەمەرییەوە گرتبوو وەك سەرۆکی کاروان قسەی لەگەڵ دەکردین، ئەو پیاوە پاش ئەوەی چەند جارێك جنێو بارانی کردین ئینجا فەرمانی بە سێ کەس لە هاورێیانی دا: لە پشت سەری ئەمانە دەوەستن و هەر کە قسەیەکی نابەجێ یا جووڵەیەکیان کرد بواریان پێمەدەن و گولله بارانیان بکەن، پاسەوانان کە تورەیی و شەرانگێزیان لە سەرو چاوی دا دەباری، بۆ پشت بارهەڵگرەکە هاتن و بە چەکی دەستیانەوە چاوەدێریان کردین و دانیشتن، هەمووماننیان لەوێدا فرێدابوو، ئینجا ئوتومبێل تەکانێکی توندی دا و کەوتە رێ،نیگایەکی بێ تینم لە چواردەوری روبەرووومان بریبوو،ئەو جێگایەی کە پێشتر خاڵی بۆسەی ئێمەبوو، ئێستا بە روناکی بڵێسە بەرزەکانی ئاگر و تۆزو خۆڵ و دوکەڵی چڕ کە ئەوێیان تەنی بوو بە جێیەکی قوربانی ترسناك دەچوو، شەو دێوێکی بێ قۆچ و کلك بوو کە دەمی رەش و بێ کۆتایی بە رووماندا کردبۆوە و دیلی و شکانی تاڵی بە رووودا دەکێشاین و گاڵتەی پێدەکردین، خەریکبوو ئەوێمان بە هەموو شتەکانەوە بەجێدەهێشت، جەنگیش وەکو ژیان دەمێنێتەوە یا دەبەینەوە یا دەدۆرێین، هەموو شت لە پشت پەردەیەکی لەرزۆکی ئاوێتە بە فرمێسك و حەسرەت دووبارە بۆ لای ماڵ و ماڵۆچکە گەرایەوە و بە شێوەی دڵۆپە ئەسرینێکی گەرم و سوتاو بەسەر گۆنای بریندارو خۆڵاویمدا هاتە خوار، روخساری بێگوناه و رەنجاوی دایکم لە سەرپۆشی سپی نوێژی هەمیشەیی، هاوسەرم بەو نیگایانەی کە دنیایەك لەخۆبردوویی وهاودڵی تێیادا شەپۆلی دەدا و منداڵە پڕ جۆش و خرۆش و جوانکیلەکانم کە بانگم دەکردن، لە یەك ساتدا وەکو فیلمێك بە بەردەم چاوە فرمێسکاوییەکانم دا تێپەرین، لەوەی لە رۆژی پێشبرکێی شەری پاڵەوانی پارێزگا لە نزیك قوتابیانمەوە نەبووم دلم تەنگ بوو، هەرچەندی زیاتر لە شوێنی پێکدادانەکە دوور دەکەوتینەو، تاریکی زۆرتر خۆی بەسەرماندا دەسەپاند وچەند خولەکێك بە دوواوە ئێمە و ئاسمانی پڕ ئەستێرەو بیابانێ بووین کە بە هەموو گەورەیی خۆیەوە لەبەر چاومان راکشابوو ترس و شکۆی شەوانەی بە رووماندا دەکێشا وەك بڵێی ئەوەی کە دەمدیت ئەو دەشتە خاکەسارو جوانکیلەیە

نەبور کە لە هەر خاڵێکی بێدەنگ بە درێژایی ساڵانی وشك و بێ باران زاڵبوو هەموو مرۆڤێکی ناچار بە بیرکردنەوە دەکرد، ئێستاکە ئەژدیهایەکی ڕەش و ناشیرین لەبەر دەممان قووت ببۆوە کە گوێ قوڵاخی دەرفەتێ بوو تا گڕۆ تورە بێ و دەمی بکاتەوە و قوربانیانی ماندوو کوتراو لەگەڵ ئاگری سووری دزەکان لووش بکات، بەڵام،،،بەڵام نابێ نائومێدبی،چونکە نائومێدی کلیلی ((مەرگ)) ە، لە هێشتاوە تا هەڵاتنی سپێدە مۆمی ئومێد ڕوناکە و بریسکە دەدات، لە ژێر لێوەوە دوعام خوێند: ((خوایە! هەرچارەنوسێك کە بووە تۆ لە ڕۆژی ئەزەلەوە بۆ ئێمەت نوسیوە و ئەمە گۆڕەپانی تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنە کە بۆمانت هەڵبژاردووە! خۆم و هاوڕێیانم بە توانا و هێزی تۆ دەسپێرم و ڕازیم بە کاری تۆ! هەستێکی وەها قووڵمان پێ بدە کەپەی بە ناخی حەقیقەت ببەین و هێزی خۆڕاگری و ئاستانەی سەبرمان زیادکە تاکو لەم تاقیکردنەوەیە سەربەرز بێینە دەر، خوایە ئامین!))

نەمدەزانی چەند کاتژمێرێ لە شەو تێپەڕیبوو کە ئوتومبیلەکە لە جووڵە کەوت، گوڕو تینێکم دایە بەر خۆم و سەیرێکی هاوڕێیانم کرد، یەك دووەك لە منداڵەکان لە نێوان خەوو بێداریدا پەلیان دەکوتا و لەناو ئازار خۆیان گرمۆڵە دەکرد، بەڵام جورئەتی دەنگ بڵند کردن و هات و هاواری ناڵەیان نەبوو، لەبەرئەوەی ژمارەیەك لە ئاژاوەچیان بێ بەزەییانە تەواوی گیانیان دەشکاندن.

پاش چەند ساتێك کە بلوجیەکان قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، لە قسەکانیان تێگەیشتم ئوتومبێلەکەی ئێمە پەنچەر بووەو خەریکی گۆڕینی ئەون، بە سەرنجەوە لێیان دەڕوانین، خەریکبوو جوڵەیەکی بچووك بە دەست و قاچەکانم بدەم کە قۆنداغە تفەنگێکی قایم بەر سینەم کەوت و منی بۆ سەر منداڵەکان فڕێدا:

- بۆ کوێ؟

فارسیەکی تێکەڵ بە زاراوەی بلوجی قسەی دەکرد.

بە ناڵەوە گووتم:

دەست وقاچم گیانی تێدا نەماوە دەمەوێ هەر لە جێی خۆمەوە بجولێم و،،،

بەلام یەکێ لە ئاژاوەچیە چەکدارەکان بە تورەییەوە هاواری کرد:

- سەرپێچی کردووە،،،،،

دووایی لافاوێك جنێوو قسەی ناشیرینی بە سەرمدا رژاند، هەر لەو کاتەدا سەربازێك بە دەنگێکی میهرەبانانەوە گووتی:

- توخوا،،،کەمێکم ئاو بدەنێ قورگم وشك بووەو خوێنێکی زۆرم لەبەر رۆیشتووە! یەك دلۆپە ئاو،،،

بەلام نەیتوانی قسەکەی تەواو بکات، پاسەوانان کە هەستی مرۆڤایەتیان تێدا نەبوو، هەستان و کەوتنە گیانی منداڵەکان، دەنگی هاواری دڕندانەیان لەگەڵ ناڵەی بەردەوامی منداڵەکان تێکەڵ ببوو، سەربازێکی بە خزمەت لەکارەکەی کە لە نزیکمەوە بوو ڕەنگی پێنەمابوو، یەکێ لە پاسەوانان پۆتینەکەی لەسەر قاچە بریندارەکەی دانابوو بە دڵڕەقیەوە هەمووی پان دەکردەوە، بە ئەستەم هەناسەی هەڵدەکێشا کە من هێرشم بۆسەر قاچی پاسەوان بردو هاوارم کرد:

"- ئەم بێچارەت کوشت.

پاسەوان دەستی لە سەربازی بریندار هەڵگرت و کاتێ بینی من بووم بە بەربەستێ لەنێوان ئەوو سەربازەکە ئاگری تورەیی تیژتربوو، تفەنگەکەی بەرەو رووم ڕاگرت و لە نێوان ددانەکانیەوە کە لەسەر یەکی دانابوون نەڕاندی:

- دەتکوژم!

ئینجا دڕندانە هێرشی بۆ کردم.

کاتێ ئاژاوەچیان ماندوو بوون بەرەڵایان کردین، منداڵەکانیش زامدار و خوێناوی ببوون و تەنانەت دەنگی ناڵەشیان بە باشی نەدەبیسرا، منیش ئەوەندەم لێدان خواردبوو هیچ ئازارێکم هەست پێنەدەکرد، دووبارە ئوتومبێلەکە کەوتەوە رێ، ئێمەش هەر ئەوەندە ئومێدەوار بووین  کە دوژمنان جارێ دەستیان لێهەڵگرتبووین و دەمانتوانی چاو لە دیتنی بەیانیەکی دیکە ببڕین، بەلام بەداخەوە کە دیلی رێگری ئازادیمان ببوو!

زۆر زوو سپێدەی سەحەر لە ئاسۆ بە دەرکەوت و تیشکە گەرمەکانی هەتاو جێگای برینەکانی پەیت کردوخوێنە وشکبۆوەکانی ختوکەدا، تا چاو بڕیدەکرد دەشت بوو زیخەڵان و تاك وتەرا گیا و پنچکە کێویەکان کە لە بەرامبەر وشکایی هەمیشەیی بیاباندا سەری کڕنوشیان دانەواندبوو، چەندین کاتژمێر بێئەوەی مۆڵەتی پشوومان بدەنێ بە دڵی بیابانی کەس نەزاندا بردیانین، کاتمان لەدەست چووبوو، هاڵاوی گەرما بە توندی سووتانی بە برینەکانمان دەبەخشی تا لە خاڵێکدا وەستاین و پاش چەند ساتێ ئێمەیان بە زەبری چەك دابەزاند، ئەشکەوتێکی تاڕاددەیەك گەورە لە بەرامبەرمان هەبوو، بۆ ناوەوەی چووین و بە هەزار حاڵ بۆ پێشەوە ڕۆیشتین، لە سوچێکی ئەوێ دایانناین بە دوو سێ پاسەوانەوە، پاشان بۆ سۆراغی کارەکانی خۆیان چوون، مۆڵەتمان لێوەرگرتن و دەستمان بە نوێژ کرد، پاشان بە سەرسوڕمانەوە تەماشایەکی چواردەورمان کردکە بەردە بچوك و گەورەکانیان هەڵچنی بوو بە چاو لەیەکمان دەپرسی: ((ئەمئەشکەوتە لە ناوەڕاستی ئەم بیابانە چیدەکات؟ لەبەرچی بۆ ئێرەیان هێناوین؟))

هێشتا هەر لەو پرسیار و حەپەسانەدابووین کە سەرنجماندا سێ کەس خەریکە لێمان نزیك دەبنەوە، ئەوانیش هەر جلی بلوجیان پۆشیبوو بەڵام سیمایان میهرەبانتر دەهاتە بەرچاو، یەکێکیان کەل و پەلی برین پێچی بە دەستەوە بوو بۆ لای دوو سەربازی بریندار چوو دوو کەسی دیکەشیان کە یەکتریان بە ((ئەرسەلان)) و ((کشکول خان)) بانگ دەکرد،نان و برنجێکی کەمیان وەك نانخواردن بۆ هێنابووین و بەرامبەریان داناین، وا دیاربوو لێپرسراوی چێشتخانەو دابینکەری پێویستی ئاژاوەچیەکان بوو،ئەوەندەمان برسی و تینوو بوو بێ هیچ قسەیەك تەواوی خۆراکەکەمان خوارد، تفەنگچی بلوجی کە بەرپرسیاری برین پێچانی منداڵەکان بوو بە نور محەمەد بانگیان دەکرد، بە سینی یە چایەکەوە بۆ لامان گەڕایەوە، ئەم کارەی ئەو جورئەتی دایە بەرم و لێم پرسی:

تۆ دەزانی کەی بڕیارە ئێمە ئازاد بین؟

ئەویش سەرێکی باداو شانەکانی هەڵتەکاند، ویستم پرسیارێکی دیکەی لێبکەم بەڵام سەروچاوی چەند کەسێ لە ئاژاوەچیەکانی دی دەرکەوت و ناچاربووم بێدەنگ بم، پیاوێکی باڵابەرزو گورج و لێهاتوو کە هەر سی و پێنج شەش ساڵێك دەبوو لە پێشیانەوە دەڕۆیشت، کە سەرنجمدا عەبدولجەبارم ناسیەوە، کاتێ بە نزیك ئێمە گەیشتن عەبدولجەبار بەچاوێکی سووك و کەمەوە تەماشایەکی منداڵەکانی کردو ئینجا بۆ لای من گەڕایەوە، تاوان و شەڕانگێزییەکی سەیر لە چاوانیدا پەیدابوو، چونکە لە دوورەوە گفتوگۆی من و نور محەمەدی دیتبوو بە هەمان زمانە دوو ڕەگەکەیەوە پرسی:

- دەتەوێ چی بزانی؟

غیرەتم دایەخۆم و بە پارێزەوە پرسیم:

- داواو تکاتان لێدەکەین کە پێمان بڵێن،،،چ کاتێ ئازادمان دەکەن؟ وە بۆچی لەگەڵ خۆتان دەمانبەن؟وە بۆ کوێ دەڕۆین؟

لەناکاو دەنگی هاواری لەناو ئەشکەوتەکەدا زرنگایەوەو قسەکەی پێ بڕیم:

- جارێکی دیکە ئێوە بەهیچ شێوەیەك ڕەنگی ئازادی نابیننەوە، ئێستا تێگەیشتی؟

هەوڵمدا ئارامی و هێمنیم بپارێزم،

- ئاخر بۆچی؟ دیلبوونی ئێمە چ سوودێکی بۆ ئێوە هەیە؟ ئێمە لەناو یەکتری گشتمان بریندارو نەخۆشین،،،ئێوەش ئێرانین، مەگەر دڵتان نیە؟

دووبارە بە بێزارییەوە بۆ نێو قسەکەم هاتەوە:

- ئێمە کۆمەڵێك داخوازیمان لە بەرپرسانی ئێوە هەیە، ئەگەر بەبێ هیچ مەرجێ داواکانمان قبوڵ بکەن، ئێمەش لەوانەیە،،،بزانە گووتم لەوانەیە ئازادتان بکەین! ئێستا بێدەنگبە و لەخۆڕا بەهانەمان مەدە دەست!

دوایی ئامازەی بۆ دەوروبەری کرد:

- بەر و بارگەکان ئامادەکەن پێویستە زووتر بەڕێکەوین، بۆمان دەرکەوت کە دیلی کاروانێکی نێو نەتەوەیی لە بازرگانانی مەرگ دەبین، نزیکەی سێ تەن

تریاکیان له ئوتومبێلەکانیان بار کردبوو، من و هاوسەنگەرانم مات و بێدەنگ بووین لەوەی هیچ شتێکمان له دەست نەدەهات بۆیە لە قووڵایی دەروونمانەوە حەسرەتمان هەڵدەکێشا، هەموو ساتێ چاوەڕوانی دەنگی تەپە تەپی هەلیکۆپتەری هێزەکانی خۆمان بووین ببیستین، یا نیشانه و شتێ له ئوتومبێلەکانی پۆلیس و هێزەکانی پۆلیس و ئاسایش دەرکەوێ تا ڕزگارمان بکەن، بەڵام وەك بڵێی چاوەڕوانیەکی بێهودە بوو، هەر لەم خەیاڵانەدا بووم کە دەنگی گەورەی عەبدولجەبارم بەرگوێ کەوت، فەرمانی دابوو سواری ئوتومبیلەکانمان بکەن، دیسان به زەبری چەك سوار بووینەوەو لەگەڵ ئاوابوونی خۆر کەوتینە ڕێ، دیسان تا چاو بڕیدەکرد دەشتی ڕووت و بێ ئاوو گیابوو، ئاسمانی شین و پان و بەرینیش وێڕای ئەوە بێکۆتایی بەردەوام بوو، لەناکاو خەیاڵم بۆ لای خانەوادەکەم گەڕایەوە، ((هەڵبەتە ئێستا هەواڵی دیلبوونی ئێمەیان بیستووە، دایکی بێچارەم! دەبێ حاڵ و ئەحواڵی چۆن بێ؟! دەزانم چاوێکی گریانە و چاوەکەی دیکەشی لە دەرگا بڕیوە تا دووبارە من ببینێتەوە! هاوسەری باشم کە پێی لەناو دووا مانگی دووگیانیدایە، چی؟! ئایا دەتوانێ وەك هەمیشە ئارام گرتووبێ لە ناخیشەوە وەك مۆم دەسووتێ و دەتوێتەوە و سەرەڕای بێتاقەتی خۆی بە ئومێدەوە دڵنەوایی ئەوانی دیکە بداتەوە؟! منداڵە گوڵەکانم،،،خوایە! لێگەڕێ یەکجاری دی بیانبینم و له نزیکیانەوە هەست بە چێژی ئازادی بکەم ! ڕق و کینەیەکی سەخت ڕێگای گەرووی داخستبوو، بەڵام نابێ بهێڵم فرمێسکەکانم بێنەخوار، ئەگەر هاوڕێیانم فرمێسکم ببینن،بێ شك ڕۆح و خۆڕاگریان لاواز دەبێ،وە دوژمن له بەرامبەرمدا بە دیتنی گریانم وا هەستدەکات هێزی بەرگەگرتنم شکاوە و بێزارو تەنگەتاو بووم و ناتوانم له هەمبەر ئەم هەموو ئێش و ئازارە خۆڕاگرم، ئاهێکی گیان سووتێنم له سینەم دەرکرد و چاوم له ئاسۆی دوورە دەست بڕی و سوپاسی خوام کرد و لە دڵمدا دەستم بە دوعا کرد و ئارامی خۆم پاراست، هەمووومان پێکەوە بەم ئەنجامە گەیشتبووین ئەمە حیکمەت و بەرژەوەندی خوا بووە، کە وا ئێمە بەشێ لە ژیانمان بە دیلی بەسەر ببەین و

بەرامبەر هەر ئازار و ئەشکەنجەیەکی ڕۆحی و جەستەیی بە نرخ و گرینگی هەموو شتەکان وەك بەخششێکی گەورەی ئازادی پەی ببەین کە جاران کەمتر سەرنجمان لێیاندەدا، پێویستە بە هیواوە بیر لە داهاتوو بکەینەوە، ڕۆژێکیان بەم ئەنجامە گەیشتین کە یەکێ لە ئێمە دەبێ ڕابکات و خۆی بە بنکە یا لادێ و شارێك بگەیەنێ و هەواڵی زیندوو مانەوە بە هێزەکانی خۆمان بدات، پاش ڕاوێژێکی زۆر یەکێ لە سەربازە بە ئەزموونەکان کە گەنجێکی پڕجۆش و خرۆش و لێهاتوو بوو داخوازی ئەم کارە مەترسیەی گرتە ئەستۆ، چەند ڕۆژێ هات و چوو دوژمنانمان بە وردییەوە خستە ژێر سەرنج و گوێمان لە قسەکانیان گرت و تێگەیشتین عەبدولجەبار و چەند کەسێ لە هاوڕێیانی دەیانەوێ بەم زووانە بۆ کارێکی گرینگ و ئامادەکردنی کەل و پەلی پێویست بۆ داوێنی دەشتی شارێکی لەم نزیکانە بڕۆن ئەمەش باشترین کات بوو بۆ جێبەجێکردنی پلانەکەمان، بەشێوەیەکی گشتی خۆراك و بەنزینیشیان لەو دەشتە بەهۆی پەیوەندییەکانیان ئامادەدەکردو،،،؟

لەو ڕۆژەدا من و گشت منداڵان لە دەرفەتی گونجاودا خەریکی قسە لەگەڵ تفەنگچیەکان بووین و هەوڵماندا بەم ڕێگایە سەرقاڵیان بکەین تاکو لە چواردەوری خۆیان بێئاگابن، ئەم فێڵە کاریگەرە سەری گرت و سەربازی ئازا لە ساتێکی زێڕیندا بە زرینگی و چالاکیەوە لە ئەڵقەی گەمارۆدان ڕایکرد، ئەو ڕۆژە خۆشترین ڕۆژانی سەردەمی دیلیمان بوو، هەمووما لە نێو جۆش و خرۆشی بێ وەستانی پاسەوانان و تورەبوونیان لەبەر ڕاکردنی سەربازە بەجەرگەکەمان یەکتریمان لەباوەشگرت و فرمێسکی ئاواتمان دەڕشت و بە هیواوە کڕنوشی سوپاسمان بەجێدەهێنا، کاتێ عەبدولجەبار گەڕایەوە و لە ڕووداوی ڕاکردنی سەرباز بە ئاگابۆوە، وەکو کێوی ئاگر پڕژێن تەقیەوە و هەموومانی دارکاری کردو جنێوی پێداین و زۆر هەوڵیدا تا دانیپێدا بنێین و ڕێگای ڕاکردنەکەی پێ بڵێین بەلاَم بێ سوودبوو چونکە هیچکامێکمان قسەیەکمان لە زاری نەهاتەدەر، بۆیە ئەمیش لەگەڵ چەند کەسێ لەخۆیان و تفەتگچیەکان کە لە لێخوڕینی ماتۆڕ لێزان بوون فەرمانی دا بۆ دۆزینەوەی سەربازە ڕاکردووەکە بست بە بست بپشکنن، تا وەختی

گەڕانەوەی ماتۆڕ سواران دڵمان لەناو دەستی بوو، بەڵام دەمانزانی سەربازەکەمان چەندە چاپوکە و دەماننناسی بۆیە تا ئاستێك خەیاڵمان بەوە ئاسوودە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەری دەسگیربوونیمان هەر دانابوو، کاتێ ئەوان بە دەستی خاڵی گەڕانەوە، عەبدولجەبار بە گووتنی ئەم دەستەواژەیە کە: (( ئەو ناتوانێ لەنێو ئەم دەشتە بێ سەر و بن و وشکە بەردەوام بێ و بەم زووانە دەمرێ)) ئیدی بەدووای ئەم ڕووداوەدا نەچۆوە، لەوەی سەرەنجام یەکێ لە ئێمە توانی مژدەبەخشی ئازادیمان بێت، گەلێك خۆشحاڵ و ئومێدەوار بووین، بەڵام کاتێ ماوەیەك تێپەڕی و هیچ هەواڵێ لە فڕۆکەکانمان یا هێزەکانی خۆمان نەبوو، گومانی جۆراوجۆرمان کرد و دیسان بۆ ماوەیەکی دیکە خۆمان بە کارە سەخت و خۆڕاگرییەکانی ڕۆژانەو شەوانی پڕ ڕاڕایی و داهێزران سپاردەوە، بەڵام دەمانزانی ئەو سەربازە ئازایە بە هەر شێوەیەك بێ لەو دۆزەخە بێ ئامانە خۆی ڕزگار دەکات، ماوەیەك بەسەرچوو دووبارە بیرۆکەی ڕاکردن کەوتەوە سەرمان، ئەمجارە من و یەکێکی دیکە لە منداڵان پێکەوە بڕیاری ڕاکردنماندا، پێویست بوو هەرچی زووترە ئەم کارە ئەنجام بدرێ و هێزەکانی کۆمەك بە هاواری منداڵەکان بگەن،چونکە گوێمان لێببوو یەکێ لە سەرکردە بەهێزو دەسەڵاتدارەکانی ئاژاوەچیان بەناوی ((ئەسکەندەر)) مەبەستیەتی ئێمە لە عەبدولجەبار بکڕێت و بۆ هەر جێیەك کە خۆی دەیەوێ بمانبات و هەر بەڵایەك کە حەزی پێیەتی بەسەرمان بێنیت، ئەسکەندەر سیماو دیمەنی سامناکترو دڕندەتربوو لە عەبدولجەبار، چەند جارێك بۆ شوێنی جێگیربوونی کاروان هات و تەماشای بارودۆخەکەی کرد و ترس و ڕاڕایی ئێمەی زیاتر کرد، سەرەنجام ڕۆژێکیان بەیانی پاش نوێژکردن، وەختێ دنیا بوولێڵ بوو شت و مەکی پێویستمان هەڵگرت و بە پشت بەستن بە خوا خۆمان بەدەستی چارەنوس سپارد و لە دەرفەتێکی گونجاودا بەرەو تاریکیەکی چڕی بەرەبەیان ڕامانکرد، بەتەواوی هێزەوە غارماندەدا بۆ ئەوەی تا بۆمان دەکرێ لەوێ دوور بکەوینەوە، بێئاگا بووین لەوەی جگە لە ئاژاوەچیەکان دەشتیش وەکو دێوێکی بێ قۆچ و کلك پلانێکی فەوتانی بۆمان داڕشتووە، کاتێ خۆری ڕۆشنکەرەوەی جیهان

پەچەی لەسەر ڕووی هەڵگرت و دەشتی ڕۆشنکردەوە چەند کاتژمێرێ لە ڕاکردنمان تێپەڕیبوو تا ئاستێکیش لە سنووری حەشارگای دوژمنان دوور کەوتبووینەوە، بەڵام نەماندەوێرا بگەڕێینەوە و ئاوڕ لە دوواوەمان بدەینەوە، ترس لە دیتنەوەی دووبارەی ئاژاوەچیان لەلایەك ئومێد بە دۆزینەوەی کەسێ تا ڕێگایەکی ڕاستمان پیشانبدا لە لایەکی دیکەوە، هێزو توانایەکی دووئەوەندەی بە قاچە ماندووەکانمان دەبەخشی و دەبووە هۆکارێك تا لە هەر کەوتنێکدا دووبارە هەستینەوەو بە دڵدانەوەی یەکتری درێژە بە ڕێگاکەمان بدەین، بەڵام هەرچەندی بۆ پێشەوە دەڕۆیشتین بە جێگایەك نەدەگەیشتین، وەختێ چاوی خۆڵاوی و ماندوومان بە دڵۆپە ئارەقە گەورەکان تەڕ ببوون، لەسەر خاڵێك کە جیلوەی درەوشاوەی ئاوی هەبوو بە سەرسامیەوە لەوەی دوواجار بە جێگایەکی کۆتایی ئەم چۆڵەوانیە گەیشتین، بەخۆشحاڵیەوە خۆمان خستە باوەشی یەکترو بەرەو هەمان خاڵ ڕاماندەکرد، بەڵام هەرچەندی دەڕۆیشتین پاشماوەیەکمان لە ئاو نەدەبینی و ئەو دەریاچە خەیاڵیە دووبارە بە چەندەها کیلۆمەتر چاوی لێ هەڵدەتەکاندین، تێگەیشتین دیسان پێدەشتی ساختەکاری نەفرەتی قەڵەمی بەدەستەوە گرتووەو هەموو ساتێك وێنەی سەرابێکی پووچمان لەبەرچاو دەکێشێ و هەڵماندەخڵەتێنێ تا زیاتر لەو حەپەسان و سەرگەردانیەمان چێژ وەربگرێ، بیابان سەرابێکی مەترسیدارو بێکۆتایی بوو!

جارهەبوو خاڵێکی ڕەش لە دوورەوە سەرنجمانی ڕادەکێشا، هیواو ئومێد دووبارە بۆ جەستە و ڕۆحی ماندوومان دەگەڕایەوە و بە پەلە پەل بۆ لای ڕاماندەکرد، بەڵام کاتێ بە نزیکیان دەگەیشتین جگە لە قوتووی بەتاڵ یا لقێکی وشکبۆوەی کرم خواردووی درەخت یا تاشەبەردێکی بێ ڕۆح و تواوە شتێکی دیکەمان نەدەبینی، بنی پێمان بەهۆی زۆر ڕۆیشتن بە درك وداڵ بریندار ببوو بە حەسرەت ساتێکی ئاسوودەیی بووین بەسەری ببەین، بەڵام ئەو بیابانە بەردەڵانە و ئەو هەتاوە سووتێنەرە و سەرما تەزیوە، هیچ کامێك نەیاندەتوانی ساردمان بکەنەوە لە ڕۆیشتن، دوواجار بە نزیك جاددەیەکی خۆڵاوی گەیشتین، لەگەڵ

ئەوەی ئێجگار هیلاك و برسی و تینوو بووین و ئەو ئاوەی لەگەڵ خۆشمان هەڵگرتبوو خەریکبوو تەواو دەبوو، بۆیە بڕیارماندا درێژە بە ڕێگاکەمان بدەین، چونکە هەرچۆنێ بوو ئازادیمان لە برسێتی و تینوویەتی بە نرختربوو ئامادە نەبووین بەهیچ بەهایەك بیفرۆشین، تاکە کێشەی گەورەی ئێمە ئەوەبوو کە ڕێگای ڕاستمان لەم بیابانەدا پێنەدەزانی و شارەزا نەبووین، لە خاڵەکانی دیکە ئێسقان بەندی ئەو وشترانەمان دەبینی کە سەرەڕای بەرگری جەستەیان توانایان نەمابوو گیانیان لەدەستدابوو بێ ڕۆح ئێسقانە ڕووت و ڕزیوەکانیان لەم بیابانەدا دەبینرا، لە کاتێ کە هیلاك و لەش کوتراو درێژەمان بەڕێگامان دەدا، لەناکاو دەنگی وڕە وڕی فڕۆکەیەکی ئاشنا سەراپامانی نوقمی شادی کرد و بەخەیاڵی ئەوەی هێزەکانی کۆمەك بۆ دۆزینەوەی ئێمە هاتوون، دڵشادانە هەوڵماندا هاوارکەین و هەڵپەڕین، بەلاَم فڕۆکەکان لەو ئاسمانە بڵندەوە بێ ئەوەی سەرنجمان لێبدەن تێپەڕین و لە خاڵێکی دوور لەچاوانمان بزربوون، پاش کەمێك ڕۆیشتنی دیکە لەپڕ چاومان بە مێگەلە مەڕێك کەوت، بەخۆشحاڵیەوە بۆ لایان چووین و شوانێکی گەنجمان بینی کە جلی بلوجیەکانی لەبەربوو بە بەدگومانیەوە تەماشای دەکردین، لەدووای تێراو بوون بەهۆی شوانەکە پرسیاری ڕێگایەکمان لێکرد کە بە ئاوەدانی بگات، ئەویش بە نابەدڵیەوە ڕێگایەکی پیشاندایین، لەگەڵ ئەوەی زۆر متمانەمان بە قسەکانی شوانەکە نەبوو بەلاَم ڕێنماییەکەی ئەو لە سەرگەردانی بیابانمان چاتربوو بەپەلە خەریکبوو بەهەمان ڕێگادا دەڕۆیشتین لەپڕ کۆمەڵە دەنگێکی جیاوازمان لە دوواوە بیست کە ئاوڕماندایەوە گروپێکی ئاژاوەچیەکانمان بەسواری ماتۆڕو ئوتومبیلەوە بینی بە خێرایی بۆ لامان نزیك دەبوونەوە، ئاخ خوای گەورە! ئایا ڕاستە ئەوەی دەیبینین؟! ئایا ئەم بیابانە بێ بەزەیی و بێ سۆزە دووبارە یاریمان لەگەڵ دەکات یان بەڕاستی ئەمانە ئاژاوەچیەکان بوون؟! تەواو شڵەژابووین بەلاَم لە ساتێکدا بە تەواوی ئەو توانایەی مابوومان قاچمان هەڵێناو دەستمان بە ڕاکردن کردەوە، بەلاَم هەوڵەکانمان بێسوود بوو، کاتێ خۆمان لەنێو گەمارۆی دوژمنی چەکداردا بینی، تەواوی ئومێدمان بە باداچوو هەر تەنها ماندووبوونمان بۆ مایەوە،

تێگەیشتین ئەو شوانە سەر بە وان بووە و ئێمەی فریو داوە، لەو دەشتەداچەندەمان لێدان بە دەستی ئەم گورگانەوە خوارد، ئینجا بۆ شوێنی پێشوو بردیانینەوە، عەبدولجەبارو دارو دەستەکەی چ ڕفتارێکی دڕندانەیان بەرامبەرمان نواند،چیرۆکێکی درێژە، وەختێ بە لەشی ورد و کوتراوو سەروچاوی خوێناوییەوە بۆ باوەشی منداڵەکان گەڕاینەوە بە ئاستەم هەناسەمان هەڵدەکێشا، بیرم لەوە دەکردەوە ڕەنگە ئیدی هەرگیز خانەوادەکەم نەبینمەوە و ڕەنگ و بۆنی ئازادی لە تاریکخانەی خەیاڵمان بپارێزین، ئەو شەوە لەگەڵ ئەوەی بیست و چوار کاتژمێر بوو هیچ خواردنێکمان نەخواردبوو تەنها بە چەند دڵۆپێك ئاو زیندوو مابووینەوە، ئینجا بە گوریسە قایمەکان دەستیان لە پشتەوە بەستینەوە و قاچیان جووت کردین و بەجۆرێ بەستیانەوە کە تا بەیانی لەتاو ئازار تلماندەدا و تەنانەت ساتێکی کەمیش چیە خەو نەچووە چاومانەوە،ئەوشەوە بۆ هەموومان شەوێکی سەخت بوو،چونکە گشتمان بە دەست و پێی قوفڵ بوو لەتەنیشت یەکەوە لە کاتێك کە لە ئازادی نائومێد ببووین، چاومان لە ئاسمانی پڕ ئەستێرەی بیابان بڕیبوو لە خەیاڵی خۆمان بەدووای خەونە ونبووەکانی خۆماندا دەگەڕاین، لە هەموو شت ناخۆشتر گریانی یەکێ لە سەربازەکان بوو کە بە ئازارەوە ڕووی لە ئاسمان کردو گووتی: ((خوایە ! تاکەی قەرەبووی گوناهەکانم بدەمەوە؟ ! واتە منْ ئەوەندە ڕوو ڕەشم بەهۆی منەوە بەزەیی و سۆزو میهرەبانیت بە هاوڕێکانیشمدا نایەتەوە؟ واتە دیلی و بەدبەختی چەشتن لە غوربەت و چەنگاڵی ئەم مرۆڤانەی لە خوا بێ ئاگان، بە مانای کۆتایی ژیانی منە و ئیدی ناتوانم ڕوخساری مانگی کچە بچکۆلەکەم ببینمەوە؟! خوایە سوێند بە گەورەییت بەزەییەکت بە حاڵماندابێتەوە،)) دڵمان شکابوو خواش ئەوەتا لەنێو دڵە شکاوەکانی ئێمەدا بوو،ئەم سکاڵا و دوعا پڕ سۆز و توانەوەیە پڕیشکێ بوو لە حاڵی پەرێشان و ژاکاومانەوە پەرەی سەندبوو، دەنگی گریانە شاراوەکان بەرز بۆوەو فرمێسکەکان هاتنە خوار و هەموو بە دوعای پاکانەوە سەرقاڵی ڕازو نیاز لەگەڵ خوای خۆیان بوون، ڕاستگۆترین و بێگەردترین نزا و دوعاکان پێموایە لەو شەوەدا لە

خڕبوونەوەی منداڵەکاندا بینیم، چەند ڕۆژێك دووای ڕاکردنمان دوژمنان بۆ دۆڵێکی گەورە کە پاشان تێگەیشتین سنوری نێو نەتەوەییە شوێنەکەیان گواستەوە، هەموو شەو لە دەوری بیست تا سی فڕۆکە بە دەنگە دەنگێکی ناخۆش لە ئاسماندا دەفڕین، بۆ هەموومان جێی پرسیاربوو کە بۆچی بۆ ئەم خاڵە هاتووین؟ ئایا عەبدولجەبار مەبەستێکی خراپی لەبارەی ئێمەوە هەیە؟

چەند ڕۆژێك دووایی، جموجۆڵی گروپی دوژمنان لەوە دەچوو خۆیان بۆ سەفەر ئامادە بکەن، تا ئەو ئاستەی ئاگاداربووین مەبەستیان بوو بارە قاچاغەکانیان بفرۆشن، بەڵام منداڵەکان لەوە دەترسان عەبدولجەبار بیەوێ بە دەستی ئەسکەندەرمان بفرۆشێ، لەوکاتەشدا بارودۆخی ئێمە زۆر دەکەوێتە قەیرانەوە و تەنها ڕشتەی ئومێدمان بە ئازادی دەپچڕێت، ڕۆژێکی دووای نیوەڕۆ عەبدولجەبار بۆ لامان هات و بەبێ پێشەکی گووتی: ((ئامادەی بەڕێکەوتن بن دەبێ سبەینێ بەیانی بۆ لای ئەسکەندەرتان ببەم و بتان فرۆشم)) ئەو هەمیشە هەوڵیدەدا بەم قسانە ئازارمان بدات، قسەکەی وەکو کوتکێ بوو کە بە سەرمانی دابدات، چونکە دوواجار ئەوەی نەماندەویست ببیستین بیستمان، منداڵەکان بە ڕەنگ و ڕووی پەڕیوو بێباوەڕانە تەماشای یەکتریان کرد و ویستیان قسە لەگەڵ عەبدولجەبار بکەن تاکو بتوانن لەم بڕیارەی پەشیمانی بکەنەوە، کەچی ئەو بەچەند چەکدارێکی هاوڕێی گووت کە بەیانی بۆ خاڵێکی دیاریکراومان ببات و ئینجا خۆی لێمان دووردەکەوێتەوەو ئێمە بە گێژی و سەرسامی لەوێدا جێبێڵێ، دووای نیوەڕۆی ڕۆژی دووایی هەموومانیان سواری ئۆتومبێل کردو بەرەو شوێنێکی نامۆیان بردین، کە ڕەنگە کۆتایی ئومێد و ئارەزووەکانمان بێ، بە دڵی زامدارو گریانەوە لەبەر قاپی خوا داوای بەخشین و لێبوردنمان دەکرد و هێشتاش هیواخواز بووین ئەم مامەڵەیە لەگەڵ ئەسکەندەر ئەنجام نەدەن ئەگینا لە مەرزی ئازادی دەردەچووین، بەڵام خوای میهرەبان دەنگی ڕاز و نیازی پاك و بێگەردانەی منداڵەکانی بیست، هەر لەو کاتەدا کە دوژمنان بەبێ سەرنجدان لە حاڵ و ئەحواڵمان بە بێ تەل لە پەیوەندی دابوون لەگەڵ یەکتر هەنگاو بە هەنگاو بۆ شوێنی یەکتربینین نزیك

دەبووینەوە، لە یەك ساتدا ئوتومبیلەکە وەستا و بە جۆرێکی دوور لەگاڵتەوە پێکەوە سەرگەرمی قسە و گفتوگۆ بوون بە زاراوەی بلوجی، چەند خولەکێك دوایی یەکێ لە پاسەوانان کە خوڵق و خوویەکی نزمتری هەبوو بۆ لامان هات و بە قسەکانی ئێمەی نوقمی شادی کرد: ((نیگەران مەبن، پێدەچێ بڕیارمان لەبارەی فرۆشتنتان بە ئەسکەندەر گۆڕیبێ، خۆمان پێویستە چاودێریتان بکەین ولە سنوور ئاودیوتان ناکەی))

هێشتا هیچکام لە منداڵەکان لەو باوەڕەدا نەبوون کە بەم ئاسانیە ئەم کێشەیە کۆتایی پێبێ، ئەم ڕووداوە زیاتر وەك موعجیزەیەکی خوایی بوو کە هەموومانی ڕاچڵەکاند،سەرەتا لە خۆشیا سەرمان بەسەر شانی یەکتر کردو گریاین، کاتێکیش ئوتومبیلەکان دووبارە ڕێگایان گرتەوە بەر و گەڕانەوە بە تەواوی دڵنیابووین کە مەسەلەی ئەسکەندەر کۆتایی هاتووەو هەر لەجێگای خۆمانەوە کڕنۆشی سوپاسمان بەجێهێنا و هەموو پێکەوە دەستمان بە ناردنی سەڵەوات کرد، دەنگی سەڵەواتمان لە شادیدا دەلەرزی و هاوشێوەی تریشقەیەك تەختایی بیابانی دەقڵەشاند و حەزی دووبارە دیتنەوەی نیشتیمانی ئازیزی لەلا زیاتر دەکردین، چەندین شەوو ڕۆژ تێپەڕین و ئێمە هەموو لەوپەڕی دڵەڕاوکێ و چاوەڕوانیدا بووین کە لە نیوە شەوی یەکێ لە شەوەکانی دیلیم لەپڕ بۆ یەکەمین جار دەمبینی کە سەرۆکی کاروانی دوژمنان بە دەنگێکی نەرم و هێواش قسەمان لەگەڵدەکات و لە قسەکانیدا ئاماژەی بە ئازادیمان دەکرد: ئەو گووتی، ئیدی کارێکمان بە ئێوە نیە،،،ئێوە ئازادن!

ئایا ئەوەی گوێمان لێبوو ڕاست بوو؟! ئایا خوا میهرەبانی و سەرپەرشتی بەرامبەرمان تەواو بەجێهێنابوو؟! چل ڕۆژ بوو خراپترین ڕەفتارو گوفتارمان لە زمانی عەبدولجەبار و هاوڕێیانیەوە بیستبوو چاومان هەر لەڕێی ئازادیمان بوو، کاتێ گوریسە ئەستورو قایمەکانیان لە دەست و قاچمان کردەوە و تا سنورێك ڕێگایان پیشانداین نەماندەزانی بۆ شوکرانەی ئەم نیعمەتە بکەوینە هەڵەکە سەما و پێکوتان یان لە کڕنۆشی درێژ بەسەر زیخەڵانەکانی بیابان هەموو دڵتەنگی و نزا

و خۆشحاڵیمان بَه فرمێسك دەربڕین، دوژمنان کەمێك ئاوو خۆراك و شقارتە و بەنزینیان پێداین و عەبدولجەبار بە دەنگێکی ئارامەوە گووتی: ((من مەبەستم بوو لە جێگایەکی سەلامەتتر داتانبەزێنم تا زووتر بە ئاوەدانی بگەنەوە، بەڵام لەترسی تووشبوون بە هێزەکانی دەوڵەت ناچاربووین لە ناوەڕاستی ئەم بیابانە بەرەڵاتان بکەین، بڕۆن بە سەلامەت!))

پاشان هەموویان سواری ئوتومبیلەکانی خۆیان بوونەوەو لە چاوتروکانێکدا لە نێو دڵی ڕەشی شەودا بزربوون، بۆ چەند خولەکێ مات و سەرسام تەماشای دەوروبەرمان کرد وەك بڵێی خەریکە تامی شیرینی ئازادی هەست پێدەکەین، وای چ ساتێکی سەیربوو کە بەخۆ هاتینەوە، کاتێ هیچ پاشماوەیەکی دوژمنمان بە چواردەورمانەوە نەدیت، هاواری شادیمان لەناخی دڵەوە کردو یەکترمان لە باوەشگرت و فرمێسکی کامەرانیمان ڕشت و، ئەوەندە دڵمان بۆ ماڵ و شارو وڵاتمان تەنگ ببوو هەر لەو کاتەی کە زۆر ماندوو هیلاك بووین و ڕێگامان بە دروستی نەدەبینی، بەرەو هەمان ڕێگا کە دوژمنان پیشانیان دابووین بەڕێکەوتین، کەم کەم سپێدەی بەیانی لە ئاسۆدا دەرکەوت و شەوی تاریك و درێژ چادری ڕەشی کۆکردەوە، هەموو مندالآن بە دڵێکی پڕ لە سوپاس و ئومێدەوە بۆ نوێژی سبەینێ وەستان و لە کڕنۆشی شوکرانەی کۆتایی نوێژ گریان و ئینجا دووبارە هەموو کەوتینەوە ڕێ، هەڵبەتە بیرمان لەوە نەدەکردەوە بۆ بە ئاوەدانی گەیشتن ئەوەندە درێژە بکێشێ، چونکە هەرچەندی دەڕۆیشتین شتێکمان نەدەدیت دەتگوت دڵی بیابان لە دڵی دوژمنان ڕەقتر و بێ بەزەییتربوو نەیدەویست بە شوێنی مەبەستمان بگەیەنێ، مەتارەی ئاو لای من بوو خۆم بە منداڵەکانم دەدا بۆ ئەوەی دەستی پێوەبگرین نەبا دوژمنان ڕێگایەکی هەڵەیان پێ نیشاندابین، تا بەلانی کەم بەشمان بکات و لە تینوێتی دا نەمرین، منداڵەکان زۆر کۆمەکیان بە یەکتر دەکرد و ژێر باڵی یەکتریان گرتبوو تا کەمتر هەست بە ماندوویتی بکەن،سەرەنجام ڕوناکی گلۆپێك لە دوورەوە بەرچاومان کەوت، بەڵێ ئازادی خەریکبوو بە ڕووماندا پێدەکەنی، دووبارە حەزو ئارەزوو بۆ منداڵە ماندووەکان

گەڕایەوە و هێزو توانایان دوو ئەوەندە بوو هەموو بە پەلە بۆ لای ڕوناکی قەلاّ بچکۆلەکانی بنکەکە ڕۆیشتین، ئەوێ بنکەیەکی بیابانی بوو؛ هێزەکانی ئەوێ بۆ دڵنیابوون ئێمەیان وەستاند و داوایان لێکردین لەسەر زەوی پاڵکەوین، ئێمەش فەرمانەکانی ئەوانمان بە وردی بەجێهێنا، بۆ لامان هاتن و زۆر زوو ئێمەیان ناسیەوە و بەخۆشیەوە بۆ بنکەیان بردین، ئیدی خەیاڵمان ئاسوودە بوو، بە تەواوی هەستەکانمان درکمان بە ئازادی دەکرد، ئازادی، شیرین ترین و ئومێد بەخشترین زمانی ژیانمان بوو، ئێستا لەو کۆترە تیژفڕانە دەچووین کە لە هەوای ئازادی پەڕوو باڵ لێکدەدەن و هەناسە هەڵدەکێشن، خوایە ! بەهۆی نوێژە پاك و فرمێسکە بەردەوام و دوعا شاراوەکانی منداڵەکان و نزاکانی شەوانەی خانەوادەکانمان بەزەبیت پێماندا هاتەوە، هەمیشە سوپاسگوزارتین، بۆیە بەپەلە بە تەلەفۆنی بنکە پەیوەندیمان بە ماڵەوەمان کرد، ئەلو،،،سلاّو دایە ! من ئازاد بووم، ئیدی نەمتوانی بەردەوامبم، دەستم بە گریان کرد و فرمێسك بەسەر دەموچاوە بریندارەکەمدا هاتەخوار، دنیایەك قسەی نەگوتراوم لە دڵدابوو کە پێویستی بە هەزارو یەکشەوی بێداری هەبوو تا ئەو هەموو ئەو یادگارییە تاڵەیان بۆ بگێڕمەوە، دەنگی لەرزۆك و میهرەبانی دایك کە ئاوێتە بە فرمێسکی شادی بوو، هاوشێوەی جوانترین مۆسیقای دنیا لە گوێمدا دەنگی دایەوە: ((سلاّو کوڕی ئازیزم! باشی؟ دەمزانی ئازیزم! دەمزانی دووبارە بۆ لامان دەگەڕێیتەوە،،،دەمزانی زیندووی،،، خوایە بەقوربانی بەژن و بالاّت بم! زووتر بکەوە ڕێ و وەرەوە چاوم لە ڕێتە،،،ئەوەی ڕاستی بێ هاتنە دنیای کچی بچکۆلەی سەربەخێرت زووتر لەتۆ هەموومانی خۆشحاڵ کرد!))

بێباوەڕانە و بە فرمێسکەوە پرسیم: ((مەبەستت ئەوەیە کە،،منداڵمان بووە؟! حاڵی دایکی چۆنە؟!)) ((بەڵێ دایە، هەم دایك و هەم کۆرپەکەش باش و سەلامەتن،منداڵەکەت زۆر بەناز و جوانکیلەیە دەڵێی فریشتەی ئاسمانانە،سی و پێنج ڕۆژە لەدایك بووە واتە پێنج ڕۆژ پاش بەدیلگیرانی تۆ، ئێستاش هەر بێ ناو ماوەتەوە! چاوەڕێ بووین خۆت بێیتەوەو ناوێکی بۆ هەڵبژێری! ئینجا زوو

وەرەوە!تا ناسنامەی بۆ دەربهێنین)) تەلەفۆنەکەم دانایەوە، بە تەماشاکردنی نەخشە بینیم شوێنی ئازادی ئێمە سنوردارەو کێوی کەللەگا لە ڕۆژهەلاتی بنکەکە بوو، هەموو بە حەپەساوییەوە سەرنجیان دەداین و یەکێ لە ئەندامانی بنکەکە گووتی: ئێوە لە سنوری کەللەگاوە تا شوێنی بنکە نزیکەی حەفتا کیلۆمەتر بە پێ ڕۆیشتوون، لە خۆشی دیداری خانەوادە نەمزانی چۆن ئەو کاتانەی کە مابوون بڕیم و خۆم بە ماڵەوە گەیاندەوەو خزم و دۆستان چاوەڕێ بوون و بە گوڵ و شیرینیەوە بۆ پێشوازیم هاتبوون، هەر کە چاوم بە ڕوخساری تەڕو پێکەنیناوی دایکم کەوت خێرا خێرا خۆم لە نێو ئەو قەرەباڵغیەدا گەیاندێ، لە باوەشی گەرمی کە باشترین پەناگام بوو خۆم ماتکرد،سەری بە شانم کردو عاشقانەترین فرمێسك و پێکەنینمان پێکەوە بەشکرد، دایکم هەر دەگریاو سەروچاوی منی ماچدەکرد، وەك بڵێی تێر نەدەبوو، پاش ئەو بەرەو پیری هاوسەرو منداڵەکانمەوە چووم،جگەرگۆشەکانم خۆیان بە سەر شانمەوە هەڵواسی و دەستیان بە قسەی خۆش کرد،لە باوەشی هاوسەرم کچۆڵەیەکی پاك و بێگوناھ کە بۆنی بەهەشتی دەدا خەوتبوو وەکو پەڕە سیغارێ سووك بوو لێم وەرگرت و چاوم لە سیمای شیرین و جوانکیلەی بڕی،چەند ئارام و جوان نوستبوو! لەناکاو لەنێو ئەو قەرەباڵغیە خۆشە جودا بوومەوە و ڕۆحم کەوتەوە گەڕان و تەواوی ڕۆژ و شەوانی سەردەمی دیلێتیم وەك فیلمێ هاتەوە بەرچاوو بە ساتی خۆشی ئازادیم کۆتایی هات،((خاگرە))! ناوێك بوو کە منی بۆ سەردەمی ڕەش دەگەڕاندەوە و پێی دەگووتم پێویستە لە هەموو ساتێکی ژیانم لەکۆتاییدا کەڵك وەربگرم، ناوێکی خۆش بوو،بەلاّم بەدووای ناوی خۆشترەوە بووم، (حدیپ) کە دەمتوانی بانگی بکەم و چیرۆکی پڕ غەمی ئەو سەردەمەم بیربێنێتەوە و داوا لە ئەم و منداڵانی دیکەشم بکەم نرخی ئازادیان باشتر بزانن، بەلاّم،،،ئەم ناوەش هەر ڕازی نەدەکردم، ئازادی بە هەموو بوونیەوە منی لە ئامێز گرتبوو،،،ئازاد بووم،،،ئازاد و ئازادە لە هەموو گیروداو،،،ئازادە،،،ئازادە! خۆشبوو، جوانترین و شکۆمەندترین ناو بوو کە گشت بیرەوەریمی لەخۆیدا هەڵگرتووە،دەبێ ناوی ئەم منداڵە بێگوناهە

بنێم ((ئازادە)) تا هیچکاتێ لەبیرم نەچێتەوە خوای گەورە چ سۆزو بەزەییەکی بەرامبەرم نواندووە، دەبێ منداڵەکەم لە هەموو کۆت و بەندە نزمەکانی دنیایی ((ئازادە)) بێت و ((ئازادە)) بژیەت و جێی شانازیم بێت، فرمێسکەکانم ڕوومەتە نەرم و ناسکەکانی ((ئازادە))ی تەڕ دەکرد و ئەمیش بە دەمی بچووکیەوە دڵۆپەکانی دەمژی و بە ئارامی چاوی دەکردەوەو وەك بڵێی هەستی بە چێژی ئەوە دەکرد کە سەری بەخێر بووە، ئێستا ساڵانێك بەسەر ڕۆژگاری دیلیمدا تێپەڕیوە، ئازادەی ئازیزم قوتابی یەکێ لە زانکۆکانی وڵاتە و چەندین یەکەی خوێندنی بەسەرکەوتوویی بڕیوە، منیش لە ناوەڕاستی تەمەن و خانەنشینیدام و هەرکاتێ بیر لەو ڕۆژە تاڵ و یادگارییە بەسەرچووانە دەکەمەوە سوپاسگوزاری خوام کە دووبارە تەمەنی پێدامەوە تا سەرنجی خەڵاتی گەورەی ژیان بدەم، هەرگیز دوعای پاك و بێگەردانەی وەختی دیلی فەرامۆش ناکەم، لە سات بە ساتی ئازادیم لە نزیك ئازادەو خانەوادەی میهرەبانم کە بەقەد تەواوی دنیا خۆشم دەوێن چێژ وەربگرم و خوای یەکتاش هەرگیز لەبیر نەکەم بە هیوای ڕۆژێ کە هەموومان لە کۆتەکانی دیلی دنیایی ئازاد بین .

# جامبازێ کە پیاو کوژ بوو

ڕۆژێکی تەماوی بوو کزەیەکی سارد بە نێو درەختە چڕەکانی پارکە جەنگەڵیەکەدا ئەخولایەوەو زۆر لە گەڵا زەرد و نارنجیەکان زەویان داپۆشیبوو، قەلەڕەشە پیرەکان بە قارە قاڕی نەڕوشاوی غەمگینەوە هەواڵی زستانێکی سارديان ڕادەگەیاند، کابرای ئوتومبێل چەمەند لە سەرەتای پارکە جەنگەڵیەکە وەستاو بەهێواشی دابەزی، نیگایەکی کاریگەری بە دەورو پشتی خۆیدا گێڕاو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و چەند ساتێك گوێی بۆ ئاوازی وشکی قەلەڕەشەکان هەڵخست، بالآیەکی بەرزو چوارشانەی هەبوو پاڵتۆیەکی چەرمی کەشخەی پۆشیبوو، لەگەڵ سیمای پیاوانەو زبرو چاوە کاریگەرەکانی کە لە ژێر برۆ ئەستورو درێژەکانیەوە پەنهان بوون، مرۆڤێکی دوور لەگاڵتەو بیرمەندو جامبازیان پیشاندەدا، دەستی بۆ نێو گیرفانی پاڵتۆکەی بردو پسوولەیەکی میللی دەرهێناو چەند ساتێ لە ڕوخساری پێنج ساڵەی پێشووی خۆی ڕاما، نیگای ساردی بەسەر نیشانەکانی پسوولەکەوە خلیسکا، ناو، موحتەشەم، ناوی خانەوادەیی،،،لەگەڵ هەر وشەیەك کە بە ژێر چاوانی موحتەشەمدا تێدەپەڕی قورساییەك لە ڕق و کینە فشاری بۆ گەرووی دەهێنا لەکاتێ کە پاڵی بە قەدی دار چنارێکی ئەستورەوە دەدا خەیاڵی بۆ پێنج ساڵی ڕابردوو ڕۆیشتبوو، ئەو سەردەمە هێشتا بۆ خۆی کەسێ بوو کە تازە سەری لەنێو ئەوانی دیکە دەرهێنابوو گەورەو کوێخا بۆخۆی بوو، پارەو سەروەتی بەدەستهاتوو لە کڕین و فرۆشتنی فستەق ژێر زمانی تام کردبوو ژیانێك بوو کە خۆشی بۆ ئەوو مینا پیشاندەدا، مینای بێچارە! چەندە خۆشحاڵبوو کە پاش چەند ساڵ دەربەدەری و کرێچێتی دوواجار دەبووە خاوەنی خانوویەك، ئاناهیتا ی کچی و ئارشی کوڕی چەندە دڵخۆشبوون کە هەرچی دەیانەویست بۆیان ئامادە دەبوو، بەلآم،،نەیدەزانی چۆن بوو هەموو شتێ لەناکاو بەسەریەکدا کەوتن و تێکچوون،چەکەکانی گەڕاندنەوەو حیساباتەکانی بەتاڵ بوون و کە بەخۆ هاتەوە ببوو بە کەسێکی تەواو تێکشکاو کە هەتا پارەی کڕینی نانی

شەوانیشی نەبوو،،،مینا تەمەنی خۆی لەپێناو ئەودا بەهەدەردابوو لەغەما دیقی کرد و،،،،،

شەوی مەرگی مینا، درێژترین و تاڵترین شەوی تاریکی ژیانی بوو، کاتێ نیوەشەو لەخەو هەستا و هاوسەرەکەی نەدیت، بە نیگەرانیەوە بەدوایدا گەڕا لەپڕ چاوی بە مینا کەوت کە لە ژووری پێشوازی میوان لە سوچێکدا دوور لە چاوی ئەو لەسەر هەمان جێگەی نوێژی هەمیشەیی بەهەمان سەرپۆشی سپی گوڵداری شەوی بووکێنیەوە ڕووەو قیبلە ڕاکشابوو، بە دیتنی ئەم دیمەنە سەیر و ڕاچڵەکێنەرە لەجێی خۆی وشك بوو،نەیدەزانی چی ڕوویداوە، کاتێ هاتەوە هۆش خۆی، بۆ بەردەمی ڕۆیشت و بەپەلە سەرپۆشەکەی لەسەر دەموچاوی لابردو ڕوخساری میهرەبانی هاوسەرەکەی بە چاوانی داخراوو بێ هیچ جۆرە جووڵەیەك دیت و نەیتوانی هاوار نەکاتن، لەگەڵ ئەوەی لە سەرەتای ژیانی هاوبەشیان لەسەر مەسەلە ماددی و مانەوییەکان کێشەیان لەگەڵ یەکتر هەبوو، بەڵام مینا دوور لەچاوی ئەو خەریکی خواپەرستی خۆی بوو لە بەرامبەر قسە سووك و گاڵتەجاڕییەکانی مێردەکەی خۆی ڕادەگرت،ئەو شەوە، موحتەشەم بە دیتنی جەستەی ساردی هاوسەری لەو جێیەدا هەستی کرد فریشتەیەکی زەوی بە پەڕو باڵی بریندارەوە بۆ خەوێکی تاهەتایی ڕۆیشتووە،ئەم کارەساتە لە نزیکەوە ڕۆح و ناخی شڵەژاند و ڕووداوێکی پشت شکێن بوو چەند ساڵێك زووتر ئەوی پیری کرد، موحتەشەم ئاهێکی هەڵکێشاو بەهۆش هاتەوە،((سلاَوتان لێبێ کاکە!)) موحتەشەم ڕاچڵەکی و بۆ دوواوە گەڕایەوە، یەکەمجار نەیتوانی ڕووخساری هەتاو سووتێنەری گەنجێکی لەڕولاواز کە لەبەردەمی وەستابوو بناسێتەوە، هێشتا هەر بە ڕاڕایی و فرمێسکەوە تەماشای دەکرد کە گەنجەکە بۆ پێشەوەتر هات و هەردوو دەستی لەسەر یەکتردانابوو کەمێ بۆ پێشەوە چەمایەوەو بە کەمێ زەردەخەنەوە گووتی: ((چیە نامناسیتەوە کاکە؟! من جومعەم، ساڵی پار لە باغاتی فستەقی ئێوەدا کارم دەکرد،،،)) موحتەشەم بەبیری هاتەوەو گووتی: ((وەی وەی، کاك جومعە! لێرە چیدەکەن؟! وامزانی بۆ ئەفغانستان بۆ لای خانەوادەکەت

ڕۆیشتوویەوە!)) جومعە قەمسەڵەکەی چاك کردو جلەکانی کەمێ هەڵکێشاو بە شەرمەزارییەوە گووتی: ((نا کاکە! ئێمە پارەی گەڕانەوەمان بۆ وڵاتی خۆمان نیە،هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەمڕۆ ئێوەم بینی،بێزارتان دەکەم،ئەگەر لە یادتان بێ پار نیوەی حەقەکەی خۆمتان پێدام و بەڵێنتاندا سێ مانگ دوواتر نیوەکەی دیکەشم بدەنێ، کەچی ئەوە هەشت مانگ تێپەڕیوەو هێشتاکە شتێکتان پێنەداوم، چەندین جار بۆ بەردەمیماڵەکەتان هاتووم بەڵام هیچ کەسێکی لێنەبووە، تا ئەوەبوو ئەمڕۆکە بە ڕێکەوت جەنابتانم بینی، دەمەوێ تکاتان لێبکەم دڵتان نەرم بێ و پارەکەی کە ماوە بمدەنێ تا هەرچی زووترە بۆ زێدم بگەڕێمەوە، دڵم بۆ ئەفغانستان و خانەوادەکەم زۆر تەنگ بووە!)) موحتەشەم دووبارە سەراپای کرێکارەکەی بەچاو بەسەرکردەوە، جومعە تەمەنی بیست و دووساڵ بوو بەڵام ئەو ڕێزو ڕەوشتەی بەرامبەر گەورەی خۆی دەینواند،لە گشت کرێکارە ئەفغانیەکانی دیکە جودای دەکردەوە و هەر ئەو خاسیەتانەشی بوو سەرنجی موحتەشەمیان ڕاکێشابوو خۆشی دەویست، هەربەو جۆرەی کە موحتەشەم لە کرێکارە بە ڕەوشتەکەی ڕامابوو، ئەمیش بەڕێزو شەرمەوە چاوەڕوانی وەڵامی بوو، لەپڕ بیرۆکەیەك وەك تریشقە بە مێشکی موحتەشەمدا تێپەڕی و ڕاچڵەکی: ((ئەمە باشترین دەرفەتە بۆ ڕاکردن لەدەست خاوەن قەرز)) دەنگێکی شەیتانی لە خەیاڵی زایەڵەی دایەوەو سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاکێشاو جادووی لێکرد: ((چکەسێ لەم گەنجە بێگانەیە باشترە؟!خۆت دووامەخە! ئەگەر دەتەوێ تەمەنێکی ئاسوودە بەسەر ببەیت،ساتێك دووامەکەوە!)) هەستێکی شاراوە بست بە بستی ساردی موحتەشەمی داگرت و جڵەوی هێزو توانای ناخی کرد، موحتەشەم زەردەخەنەیەکی بۆ کردو گووتی: (( وەڵا منیش وا ڕێکەوت هەر چەند خولەکێك پێش ئێستا لە خەیاڵمدا بووی، بەڵام ئێستا پارەم لانیە، هەوڵدەدەم تا کۆتایی هەفتە پارەکەت بدەمێ بۆ ئەوەی تۆش بەخەیاڵی ئاسوودەوە بۆ لای خانەوادەکەت بگەڕێیتەوە)) جومعەش بە خۆشحاڵیەوە گووتی: ((بەڕاستی سوپاستدکم گەورەم! دنیایەك مەمنونم لێتان! ))

موحتەشەم بە ڕوخسارێکی هێمنەوە گووتی: (( بەڵام ئاگات لە مۆبایلەکەت بێ و دایمەخە و چاوەڕوانی پەیوەندی من بە! ئێستا ماڵئاوا)) موحتەشەم ئیدی چاوەڕێی سوپاسە یەك بەدووای یەکەکانی کرێکارەکەی نەبوو،بێ وەستان سواری ئوتومبیلەکەی بوو لە پارك دەرچوو، موحتەشەم بە شڵەژاوییەوە تەماشای کاتژمێری کرد، دە خولەك لە پەیوەندیەکەی بە جومعەوە تێپەڕیبوو هەرچەندە جومعە بڕیاری دابوو زووتر بۆ شوێنی مەبەست بێ، بەڵام دیسانەکە موحتەشەم زووترگەیشتبوو لە چاوەڕوانی کرێکارەکەی دانیشت، جارێکی دیکەش پلانەکەی لە خەیاڵیدا تاووتوێ کرد، ئەگەر هەموو شتێك وەکو نەخشەکەی بەڕێوەچووبا ئیدی هیچ پاشماوەیەك لە ڕاڕایی و نیگەرانیە بێزارکەرەکانی لە بوونی خاوەن قەرزەکان نەدەما، موحتەشەم لە ئوتومبیل دابەزی و پاش باران بارین لە هەوای تازەو پاکدا هەناسەیەکی هەڵکێشا، چێژێکی لە ڕاددەبەدەر هەموو بوونی گرتبۆوە، جومعە دوواجار هات و پاش گفتوگۆیەکی کەمی موحتەشەم سواری ئوتومبیل بوو جومعەش لەبەر پێداگری خاوەندارەکەی لە کورسی پێشەوەو تەنیشتی دانیشت، بۆ چەند ساتێك هەردووکیان لە هەوای بارانی دەرەوە ڕامان، یەکێکیان لەبیری ئاییندە و دیداری خانەوادەکەی بوو ئەویدیکەشیان لە بیری کێشانی گیانی مرۆڤێکی بێگوناە و دوور لە خانەوادەکەی خۆی! موحتەشەم بە خێرایی ئوتومبیلەکەی بۆ دەشتەکانی دەورووبەری شار ڕێنمایی کرد، سەرەتا موحتەشەم سەری قسەی کردەوە و لە هەوای ساردی دەرەوە گلەیی کرد و ئینجا هاتە سەر مەسەلەی بارودۆخی ماڵی خۆیان و دووایش ستایش و پێداهەڵدان و لێهاتوویی جومعە و،،،،ئەوی سەرقاڵکرد و هەر لەو کاتەدا بە ئارامی و بێ ئەوەی سەرنجی جومعە بۆ لای خۆی رابکێشێ ، ئوتومبیلەکەی لە قەراغی دۆڵێکدا ڕاگرت و لە لێخوڕین وەستا،ئێستا پێویستە قۆناغی دووەمی نەخشەکەی جێبەجێ بکات: ((کاك جومعە چەند ساتێك لێرەبە تا دەگەڕێمەوە!)) موحتەشەم لە ئوتومبیل دابەزی،خێرا خڕکە بەردێکی گەورەی کە لە پێش تایەی ئوتومبیلەکە دانابوو لایبرد و دەرگاکانیشی داخست، بەپەلە سندووقی پشتەوەی کردەوەو گالۆنێکی بیست

لیتری بەنزین دەرهێنا و ئینجا لە کاتێ کە هەوڵی دەدا گوێ بە هاواری ویژدانی نەدات، هەردوو دەستی لەسەر پشتی ئوتومبیلەکە داناو بۆ پێشەوە پاڵی پێوەنا، هەر ئەو پاڵە بەسبوو بۆ ئەوەی ئوتومبیل لەسەر ڕوویەکی تا ئاستێ لێژ بگێرسێتەوەو بە دۆڵێکی کەمێ قووڵ کۆتایی بێ، بە هۆی کاریگەری خزینی بەسەر زەوی تەڕ بە جووڵە بێت و بۆ پێشەوە بڕوات، موحتەشەم خێرا گالۆنە بەنزینەکەی بە ئوتومبیلەکەدا کردو،،،لەبەردەم شۆڕبوونەوەی بۆ دۆڵەکە بەباشی دەنگی هاوارە پڕ پاڕانەوەکانی جومعەی لە ناوەوە دەبیست کە داوای هاوکاری دەکرد، پاش بەرکەوتنی ئوتومبیلەکە بە تاشەبەردەکان ئینجا کەوتە ژێر دۆڵێکی قووڵ و کێوێك لە ئاگر سەرتاپای قووتدا، موحتەشەم خێرا لە دیمەنەکە دوورکەوتەوە تا هەڵقرچانی مرۆڤێکی بێگوناه بەم شێوەیە نەبینێ، هەموو شتێ بەباشی تەواو ببوو، سەرێکی بەرزکردەوە و تەماشایەکی تروسکایی گڵۆپەکانی شاری لە بەردەمی ئێوارەدا کرد، ئێستا دەبێ چەند کیلۆمەترێ تا شار بە پێ بڕوات، پاڵتۆکەی ڕێکخست و کەوتە ڕێ پیشانگای نێونەتەوەیی کتێبی تاران لە ئاپۆڕەی جەماوەر شەپۆلی دەدا، موحتەشەم بە بێ مەیلیەوە بۆ لای منداڵەکانی دەڕۆیشت لە کاتێکدا ئەوان بە حەزو تاسەوە بەدووای کتێبدا دەگەڕان و لەم ژوور بۆ ئەو ژوور دەچوون، ئەو دەستی بە بۆڵە بۆڵ کرد: ((مرۆڤ لەنێو ئەم قەرەباڵغیە وەڕسکەرە دڵی تەنگ دەبێ! منداڵان زووتر شتەکانتان بکڕن تا بە کارەکانی دیکەم ڕابگەم،،،ئاخر ئەمە چ کتێبێکە تۆ کڕیوتە ئارش گیان،تۆ هیچ پەیوەندییەکت بە کتێبی پۆلیسی و تاوانەوە نیە و بە سێ هەزار تومانیشە ئەم ڕۆمانە دەتەوێ چی بکەی؟!)) موحتەشەم هێشتا هەر خەریکی پرتە و بۆڵە بوو لەگەڵ کوڕەکەی کە کچەکەی بە کۆڵێك کتێبی ژێر باڵیەوە دەرکەوت: ((بابە!پارەکە بەم کاکەیە بدە!)) موحتەشە بە سەرسوڕمانەوە کتێبەکانی ڕۆمانی بەڕیز سەیرکرد: ((توخوا جا تۆ لەگەڵ ئەم هەموو وانە قورسانەی کە هەتە دەتوانی ئەم کتێبانە بخوێنیتەوە؟! ئێ دەباشە بیرێکیش لە گیرفانی بەدبەختێکی وەکو منیش بکەنەوە!)) کچەکەی بە ووڕژاوییەوە گووتی: ((بەڵێن دەدەم ئەمانە

دووا کتێب بن کە لە پیشانگا دەیانکڕم! ئێستا بڕۆ پارەکانیان بدە تا بە کڕینی شتەکانی دیکە ڕابگەین!)) موحتەشەم لە سووچێکدا کچەکەو کوڕەکەی بەڕەڵا کرد لە کاتێکدا لە ژێر لێوەوە نەعلەتی لێدەکردن، بەپەلە بەرەو ژوورێك چوو لەناکاو سینەی بەر سینەی یەکێك کەوت،سەری بەرزکردەوەو بەڕێزەوە داوای لێبوردنی کرد: ((ببەخشن، ئاگام لەخۆم نەبوو بۆیە بەر یەك کەوتین!)) بەڵام لەپڕ کە چاوی بە کابرا کەوت شڵەژا و لەشی کەوتە لەرزین،کابراش بە حەپەساوی و بێباوەڕییەوە لە موحتەشەم ڕامابوو: ((ئاه باوەڕم نەدەکرد،،،کاك موحتەشەم! مەگەر تۆ،،،تۆ زیندووی، مەگەر دوو ساڵ لەبەر دەمی ئێمە بە ئوتومبێلتەوە لە دۆڵێکی نزیك شار نەسووتایت و نەبوویتە قەرەبرووت؟! تۆ،،،لێرە،،،تاران،،،؟!)) موحتەشەم خێرا بەسەر خۆیدا زاڵبوو بە توندی گووتی: ((بەهەڵە تێگەیشتووی کاکە! بە یارمەتیت!)) ئینجا بێ ئەوەی سەرنج لە کابرا بدات کە بە سەرسامییەوە سەیری دەکرد ڕۆیشت، بە خەیاڵێکی ئاڵۆزەوە پارەی کتێبی منداڵەکانی داو دەستی گرتن و بێ ئەوەی سەرنج لە پرسیارەکانیان بدات بەنێو ئاپۆڕەی ئەم خەڵکەدا هەڵات، بێ ئاگابوو لەوەی ئەو پیاوە یەکێك بوو لە خاوەن قەرزەکانی، تازە پەی بە نەخشەی موحتەشەم بردبوو، پێش ئەو هەنگاوی نابوو، بۆیە پۆلیسی لە ڕووداوەکە ئاگادار کردەوە و ئینجا بە دووای هەنگاو بە هەنگاوی موحتەشەم تا ماڵەکەی کە ژێر زەمینێکی بچووك بوو لە چەقی شار کەوتن، نزیکەی دووای کاتژمێرێك لە کاتێکدا کە موحتەشەم بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ یەکێ لە هاوڕێ تازەکانی دەکرد، زەنگی دەرگایان لێدا، موحتەشەم بە ترس و شێوانەوە تەلەفۆنەکەی داخستەوەو باوەڕی نەدەکرد بەم خێراییە شیرازەی کارەکەی بپچڕێت، بە پارێزەوە بەرەو دەرگای ماڵەوە ڕۆیی، بەڵام کوڕەکەی لەو زووتر بەرەو دەرگاکە ڕایکرد،هەر کە ئارش دەرگای کردەوە، موحتەشەم بە دیتنی کارمەندانی پۆلیس و کابرایەکی گەنج لە جێی خۆی وشك بوو،،،، دۆسیەی لێکۆڵینەوەم کردەوەو ڕووم لە موحتەشەم کرد و گووتم: ((باشە کاك موحتەشەم! فایلەکەت زۆر سەنگینە، ناتەوێ باسبکەی کە بۆچی بەم ڕۆژەو

بەم جێگایە گەیشتووی؟!)) موحتەشەم بە ئارامیەوە سەری بڵندکرد، چاوە غەمگینەکانی لەمن بڕی و بە دەنگێکەوە کە دەتگووت لە بنی چاڵێکەوە قسەدەکات گووتی: ((چی بڵێم جەنابی ئەفسەر؟! هەموو پێشینەم وا لەنێو ئەم دۆسیەیە،بەڵام خۆزگە دەستم بە خوێنی مرۆڤێکی بێگوناە سوور نەکردبا،من وامزانی کە بەم فێڵە هەموو باوەڕ دەکەن کە من بە ئوتومبیلەکەمەوە لە دۆڵێکدا هەڵدێراوم و مردووم، دوواجار هەموو دەستم لێ هەڵدەگرن و منیش بە خەیاڵی ئاسودەوە بۆ پایتەخت دێم و دوور لە چاوی خاوەن قەرزان ژیانێکی تازە دەست پێدەکەم، دەمزانی تاران بەم جەنجاڵیەوە کون و قوژبنی زۆرە و دەتوانم چەند ساڵێك خۆمی تێدا بشارمەوە تا ئاوەکان لە ئاش بکەوِن و من لە خەیاڵی دۆستان و هاوڕێیان و لە هەمووان گرینگتر لە بیری خاوەن قەرزە پێداگرەکان دەسڕێمەوەو گشتیان بە مردووم دادەنێن و دۆسیەی ژیانم دەخەنە ئەرشیفەوە!

دوو ساڵ بەم شێوەیە لە سووچێکدا ژیام، بەڵام باوەڕبکەن تەنها شەوێکیش بە خەیاڵی ئاسوودەوە نەنوستوم، هەموو شەوێ ئازاری ویژدان و مێردەزمەم دەبینی، شەوێك هاوسەری خوالێخۆشبووم لێم تووڕە دەبوو، شەوی دووایی سیمای ستەمدیدەی جومعەم لەخەودا دەدیت، شەوێکی دیکە خاوەن قەرزەکان لە جیهانی خەودا هاواریان دەکرد: جامبازی بکوژ!

بەکورتی ساتێك ئارامم نەبوو تا ئەوکاتەی سەرەنجام خوا تۆڵەی خوێنی جومعەی وەرگرتەوەو بێ ئەوەی بیر بکەمەوە کە لەگەڵ هاوشارییەکم کە یەکێ لە خاوەن قەرزەکانم بوو ڕووبەڕوو دەبمەوە و گشت ڕووداوەکە،،،،ئێستاش بە جورئەتەوە دانیپێدادەنێم کە خوێنی مرۆڤی بێگوناە لەسەر زەوی نامێنێتەوەو داوێنی بکوژ دەگرێت، وای لە من کە بە دەستی خۆم ڕۆحی ئەو گەنجە بێگانەیەم کێشا،،،،بەداخەوە سەروەختێکی دیکە تازە ناگەڕێتەوە تا پێش بە تاوانێك کە ئەنجامم داوە بگرم، ئێستا لەبەردەم قاپی یاسا بە گشت ئەو تاوانانەی تێوەیان گلاوم دانیان پێدادەنێم و ڕازیم چونکە جامبازێکی بکوژ بووم، هەرچی یاسا بیڵێ ڕازیدەبم،،،،،))

# چارەنوسسازان

تیشکە سووتێنەرەکانی هەتاو لێرە بەدوواوە لە نیوەڕۆی گەرمی هاوین هاوشێوەی چزووی ژەهراوی بە جەستەی ماندوو ئارەق کردووی دوو کرێکاری گەنجدا دەچوو کە لە جێگایەکی چۆڵ و دوور لە شار خەریکی چاڵ هەڵکەندن بوون، دوواجار قورسی کارەکە ناچاری بە پشوودان کردن، یەکێکیان کە گەنجتری پێشاندەدا لە دووای خواردنەوەی جورعەیەك ئاو بە بێزاری و بێتاقەتیەوە ڕووی لەوی دیکەیان کردو گووتی: ((چاوت لە گەمەی ڕۆژگارە دین محەمەد گیان! بە هەزار ئومێدو ئارەزوو لە ئەفغانستانی وڵاتی خۆمان بۆ ئێران هاتووین، بەڵام حەیف هەموو ئارەزوومان نەخشی سەر ئاوبوو!)) دین محەمەد کە ڕوخساری چەند ساڵێك لەو گەورەتری پێشاندەدا، بە حەسرەتەوە گووتی: ((جگە لە خۆڕاگری بەرامبەر ئەم بارودۆخە گول موراد گیان چارە چیە؟)) گول موراد ساتێك چاوی لە سیمای شێواوو ماندووی دین محەمەد بڕی، بەجۆرێ کە دین محەمەد لە نیگای کاریگەرو ماناداری هاوڕێکەی کۆمەڵێك قسەی زۆری خوێندەوە، بۆیە بە شك و دوودڵیەوە گووتی: ((دیسان چ بیرۆکەیەکت لە مێشکدایە گول مراد؟ ئەمیش بە پێکەنینەوە گووتی: ((ئافەرین، زوو لە مەبەستم تێگەیشتی،ئەوەی ڕاستی بێ من پلانی نەخشەیەکی دروست و باشم بۆ دەوڵەمەند بوون هەیە)) دین محەمەد بە بێ حەوسەڵەییەوە گووتی: ((بزانە برادەر! ئەگەر لە بیری کارێکی پێچەوانە دای من لەگەڵتا نیم چونکە تاقەتی ژانە سەرم نیە دەزانم دوواجار هەر دەکەوینە داوەوە!)) گول موراد بە دڵنیاییەوە گووتی: ((دەمێکە من بیر لەم نەخشەیە دەکەمەوە و هەموو شتێکیشم هەڵسەنگاندووە، مەگەر تۆ بۆ ژن و منداڵت بێتاقەت نەبوویی؟!))

دین محەمەد لە ژێر لێوەوە گووتی: ((چۆن، زۆریش بێتاقەتبووم، بەڵام کاری هەڵە،،،)) گول موراد قسەکەی پێ بڕی و بە دڵتەنگیەوە گووتی: (( نەمدەزانی بەم ئەندازەیە ترسنۆکی! وەرە خوایە دەمەوێ لەگەڵ چ کەسێکی ترسنۆك دەوڵەمەند بین!)) دین محەمەد کەمێ خۆی سەرکۆنە کردو دوواجار حەوسەڵەی نەماو پرسی:

((ئێستا نەخشەکەت چیە؟)) گول موراد بە بیستنی ئەم قسەیە گەشایەوەو بە خۆشحاڵیەوە سەری بە گوێیەوە نا، دنیا تازە ڕوناك ببوو،جاددەیەك کە لە شار دەردەچوو بە دەشتێکدا دەخولایەوە، بە شارێکی دراوسێ دەگەیشت و لەوکاتەدا بەیانی لە خەڵوەت و بێدەنگیدا وەنەوزی دەدا، شوفێرێکی گەنج کە هێشتا لە پەیوەندی ناوەختی دایك و باوکی نیگەران وحەپەساو بوو،کاتێ جاددەی چۆڵی دیت، قاچی لەسەر پایدەری گازەکە داناو لە ژێر لێوەوە نەفرەتی بۆ زەوی و ڕۆژگار دەنارد، ڕێگای گوندێکی کە دایك و باوکی لەوێدا نیشتەجێبوون گرتەبەر، بەڵام بەجۆرێك نوقمی خەیاڵاتەکانی ببوو سەرەتا سەرنجی دوو کەسی نەدا کە تا ناوەڕاستی جادە هاتبوون و بە هاوارو زارییەوە داوای کۆمەکیان دەکرد، بەڵام لە دووری چەند مەترێك ئوتومبیلەکەی ڕاگرت و پاشەوپاش بۆ لایان گەڕایەوە، یەکێ لەو دوو کەسە بۆ پێشەوە ڕایکرد و بە دەنگێکی شێواوو تێکەڵ بە پاڕانەوە گووتی: ((کاکە خوا خێرت بنوسێ کە لەو کاتەدا بە هانامانەوە هاتی،دەبێ هەرچی زووترە بە گوندی،،،بڕۆین، زەحمەت نەبێ بەوێمان بگەیەنی؟! ئەگەر ڕێگاشت بەسەر وێدا نیە، عەیبی تێدا نیە هەرنا تا نزیکی وێمان ببە!)) شوفێرەکە پرسی: ((چی بووە وا بەم بەیانیە زووە خەریکن بۆ لادێ دەڕۆن؟)) یەکێکیان بە تێروتەسەلی گێڕایەوەو گووتی: ((ئێمە کرێکاری خانووبەرەین لەمڕۆکەوە دەبێ لەنێو گونددا دە خانوو بۆ خاوەن کارمان دروست بکەین، چونکە گشت کرێکارانی دیکە پێش ئێمە زووتر بە ئوتومبیل ڕۆیشتوون، درەنگمان بەسەردا هاتووەو دەبێ هەرچی زووترە خۆمان بگەیەنینە وێ،ئەوەی ڕاستی بێ لە کاتی خۆی بە هاوارمانەوە هاتی!)) شوفێرە گەنجەکە پرسی: ((ئەفغانین؟)) کابرا تیلە چاوێکی لە هاوڕێکەی پشتەوەی کردو لە ژێر لێوەوە گووتی: (( بەڵێ، بەڵام بەم زووانە بۆ نیشتیمانی خۆمان دەگەڕێینەوە!)) چەند کیلۆمەترێ لە شار دوور کەوتبوونەوە، بە ڕێگایەکی خۆڵاوی و ناسەرەکی سوڕانەوە کە بۆ ئەو گوندەی مەبەستیان بوو دەچوو لە نێوان بیابان دا بە چۆڵەوانیەك تێدەپەڕین کە هیچ گیاندارێکی لێنەبوو، بێدەنگی باڵی بەسەر جاددەی چۆڵدا کێشابوو، شوفێرە

گەنجەکە هێشتا لە بیری ئەوەدا بوو لەناکاو سەرنجی دوودەستی بەهێزیدا بە دەوری گەردنیەوە کە بەتوندی دەیگوشی و هەناسەی توند دەکرد، ئەمیش بێ ئاگابوو، بەترسەوە تەماشایەکی تەنیشتی کرد تا کۆمەکی بکات، بەڵام چاوی خوێنین و زەق و سیمای بێ بەزەیی گەشتیار ئەمی نائومێد کرد و بەپەلە دەستی لە لێخوڕین هەڵگرت و لە قەراغ جاددە ڕایگرت، هەوڵیدا خۆی لەو گەمارۆ پتەوو مەرگهێنە ڕزگار بکات، بەڵام بریسکەی تیغی لێواری چەقۆیەك کە سەرنشینی پێشەوە بەرامبەر چاوە تۆقێنەرەکانی خۆی ڕایگرت، ترس و دڵەڕاوکێی دوو ئەوەندە کردو هەر کە ویستی خۆی ڕاپسکێنێ، یەکەمین لێدانی چەقۆ بەر دڵی کەوت و خوێن فوارەی کرد، ئەمیش لەتاو ئازار تلی دەدا و دەیەویست هاوار بکات و داوای کۆمەك بکات، بەڵام ئەڵقەی مەرگباری دەستەکانی سەرنشینەکەی پشتەوە سات بە سات توندتر دەبوو هەناسەی قورستر دەکرد، یەك بەدووای یەك چەقۆشیان لە جەستەی دا ڕۆدەکرد، خوێن قوڵپی دەداو دڵڕەقی هێرشبەرانیش بێ ئەندازە بوو، زۆری نەبرد جەستەی بێ هەست بوو لەنێو ددانە داخراوەکانی بە سەختیەوە ورتەیەکی لێوەهات و گووتی: ((ناپیاوینە! من،،،ماڵ و منالم هەیە،،،باوك و،،،دایکم،،،،چاوەڕوانن،،،)) بەڵام دووا چەقۆی گول موراد کۆتایی بە قسەکەی هێنا و دڵی بریندارو خوێناوی بۆ هەمیشە لەکار کەوت، گول موراد کە خەیاڵی لە بارەی شوفێرەوە ئاسوودە بوو ئاماژەی بۆ دین محەمەد کردو گووتی: ((ئیدی تەواو بوو،بەڕەڵایکە!)) ئینجا چەقۆی خوێنینی بە کراسی پارچە پارچەی گەنجەکە سڕیەوەو لە گیرفانی داینایەوەو بەپەلە خەریکی پشکنینی گیرفانەکانی کوژراو بوون، دین محەمەد بێباوەڕانە لە دەستەکانی خۆی ڕامابوو لە ترس و تۆقین دەلەرزی: (( واتە من بە دەستەکانی خۆم مرۆڤم کوشت؟! نا نا،وای لەمن!)) دووایی ڕووی لە گول موراد کرد: ((ئێستا چی لەم تەرمە بکەین؟!)) گول موراد بەخۆشحاڵیەوە پارە کاغەزەکانی لە گیرفانی داناو بە بینینی ڕەنگ و ڕووی پەڕیوو دەنگی لەرزۆکی هاوڕێکەی دەستی بە قاقای پێکەنین کردو گووتی: (( چیە هاوڕێ؟! زۆر ترسای وانیە؟! گرینگ یەکەم هەنگاو بوو کە تۆ هەڵتگرت و

هاوبەشی تاوانی من لە کوشتنی ئەم گەنجە بووی، ئیدی ڕێگای ڕاکردنت نیەو دەبێ تا کۆتایی لەگەڵمابیت! تازە ئیشەکەمان کردووە)) دین محەمەد بە توڕەییەوە هاواری کرد: ((ونبە بێ ویژدان! خۆم دەزانم چ قوڕێکم بەسەرماکردووە، گووتم ئەم تەرمە چی لێبکەین؟!)) گول موراد بەڵگەو شت و مەکەکانی لەسەر داشبولی ئوتومبیلەکە هەڵگرت و بە هێمنیەوە گووتی: ((ئەمە پرسیاری ناوێ! چ زۆرە لەم ناوە چاڵ زۆرە! دەبێ بیخەینە یەکێ لە چاڵەکانەوە، ئینجا بە سۆراغی ئەو پلانەی کە ماوە بڕۆین، ئامادەی؟!))

دنیاخەریکبوو تاریك دەبوو کە دووای بیستنی هەواڵێ لە ڕێگای پۆستی یەکێ لە بازگەکانی پشکنینەوە لەبارەی توێژینەوە لە وەستاندنی ئوتومبیلێکی پڕ کەل و پەلی گومانلێکراو، لەگەڵ یەك دووکەسی هاوکارم بە شوێنی مەبەست گەیشتین و خەریکی لێکۆڵینەوەو پرسیارکردن بووین، ئەفسەری پاسەوان چۆنیەتی ڕوودانی ڕووداوەکەی بەم شێوەیە ڕوونکردەوە: ((جەنابی ئەفسەر! سیماو قسەکردنی سەرنشینەکانی ئوتومبیلەکە ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەفغانین و هیچ جۆرە بەڵگەیەکیان پێ نیە کە دەریبخات ئەمان خاوەنی ئەم ئوتومبیلەن، بەڵام شتێ کە بۆچوونی کارمەندانی ئێمەی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و بووە هۆی ئەوەی لێیان بکەوینە شکەوە،شێوەو ڕواڵەتی ناو ئوتومبیلەکە بوو کە قەرەباڵغ و تێکچڕژاوی پیشاندەدا، وە لەژێر کورسی شوفێریش پەڵە خوێن دەبینرا و لەسەر ڕوخساری یەکێکیش لەوان پاشماوەی برین و ڕووشاوی بەرچاو دەکەوت، لەنێو گیرفانی ئەم کەسەش چەقۆیەکی مشاری خوێنین دۆزرایەوە، هەروەها کەسی دووەمیش لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵمان بێ ئەندازە ترسابوو بە دەنگی لەرزۆك و بێچارەییەوە وەڵامی پرسیارەکانی ئێمەی دەدایەوە، هەموو ئەم خاڵانە وایکرد گومان بکەین و بیوەستێنین و سەرنشینەکانی بگرین، ئێستا هەرچی ئێوە بفەرموون ئەنجامی دەدەین)) بە ڕێنمایی ئەفسەری پاسەوان بۆ گرتووخانە ڕۆیشتم و بەرەو ڕووی دوو گەنج بوومەوە کە جلی کرێکاریان لەبەردابوو،گەنجی یەکەم هەر کە منی دیت دەستی بە سکاڵا کرد: ((جەنابی ئەفسەر! باوەڕ بکەن

هەڵەیەك ڕوویداوەو لەخۆڕا ئێمەیان گرتووە، بێگوناهین)) تەماشایەکی هاوڕێکەیم کرد کە ترس و شڵەژان لە چاوانیدا شەپۆلیان دەدا و بێهوودە هەوڵی دەدا بەسەر خۆیدا زاڵبێ، ڕووم تێکردن و گووتم: ((ئاخر ئێوە بێ هیچ بەڵگەنامەیەك ئەم ئوتومبیلە دەهاژوون، مەبەستم ئەوەیە هیچ شتێ نیە بیسەلمێنێ کە جەنابتان خاوەنین؟!)) گەنجەکە بە هێمنیەکی ساختەوە گووتی: ((ئێ باشە بیرمان چوو بەڵێننامەی ئوتومبیلەکە هەڵگرین، هەر ئێستا هاوڕێکەم دەنێرم بیهێنێ)) بەلاّم لەناکاو گەنجەکەی دیکەیان کە دووایی خۆی بە دین محەمەدی بیست و نۆ ساڵە ناساند، زۆر تورەبوو بە زمانێکی قورسی ئەفغانیەوە هاواری کرد: ((من چیدیکە ناتوانم سیناریۆ بکەم گول موراد! دەمەوێ هەموو شتێ ئاشکراکەم و ویژدانم ئاسوودەبێ)) گول موراد وەك بلێی گشت پلانەکانی وەك نەخشی سەر ئاو دەبینێ،لەپڕ ڕەنگ و ڕووی گۆڕاو خوێن بەری چاوانی گرت و هاوشێوەی هەڵۆیەك پەلاماری هاوڕێکەیداو مشتەکۆڵەیەکی توندی بە لووتیدا کێشا: ((بێدەنگ بە هاوڕێی نیوە ڕێ! بی ماریفەت،،،،،)) و زۆر زوو هەمووشتێك ئاشکرا دەبێت، پاش کاتژمێرێ هەموو شت کۆتایی هاتبوو، گول موراد بە دەسبەسراوییەوە لە پشت شیشەکانی زیندان نەعلەتی بۆ زەوی و ڕۆژگار دەنارد و تیری کەوانی خراپە و نەفرەتەکانی لە دین محەمەد دەگرت و بە ناپاك و ترسنۆکی لەقەڵەم دەدا، دین محەمەد بە سەرو ڕووی شین هەڵگەڕاوو برینداریەوە لە ژووری توێژینەوە بەرەو ڕووم دانیشتبوو بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە ڕازی تاوانی دڵتەزێنیانی ئاشکرا دەکرد: ((هەموو گوناهی گول موراد بوو،خەریکبوو لەنێو ولاّتی خۆم شاری قەندەهار بە قوربانی خاکەکەشی بم لەگەڵ ژن و دوو منداڵم ژیانم بە لوقمە نانێکی نەمرو نەژی دەبردە سەر، کە گول موراد کوڕی دراوسێی کۆنمان تازە ژنی هێنابوو لە بن سەری هەڵخوێندم و لەبارەی هەل ومەرجی باشی کار لە ئێران قسەی بۆ کردم و پێشنیاری کرد بەجووتە بۆ ئیشکردن بەرەو ئێرە بێین، سەرەتا حەزم لەم سەفەرە نەبوو، ڕاستە ژیانێکی هەژارانە دەژیام بەلاّم دوواجار بەم جۆرە ژیانە ڕاهاتبووم و هەر تەنها منیش نەبووم لە هەژاری و بێبەختی لینگە ژەنەم

دەکرد، بەڵکو زۆرینەی ئەفغانەکان لێی بێبەری نەبوون، بەکورتی پێمخۆشنەبوو ئاوارەی سەر زەوییەکی غوربەت ببین، کەچی گول موراد دەسبەردارم نەبوو، ئەوەندەی باسی پارەو سەروەتی لە ئێراندا کرد و گاڵتەی پێکردم ناچار قایل بووم و بە هەزار دەردەسەریشەوە خانەوادەکەم ڕازیکرد و ئامادەی سەفەر بووین، بڕیارمان وابوو لە دووای چەند ساڵێك کارکردن و پارەی باش کۆکردنەوە بۆ زێدی خۆمان بگەڕێینەوە، لەنێو ئێران هەرچەندی بەشوێن کاری چاك و ئابروومەندندا گەڕاین، بە بێ هیوایی گەیشتین و لە کۆتاییدا ناچار بە کارە سەختەکانی وەکو خانووبەرەو چاڵ هەڵکەندن بووین،هەرچی پەیداشمان دەکرد لە خواردن وخۆراك و کرێی خانوو ئەم شتانەمان دەدایەوەو شتێکی کەممان بۆ دەمایەوە و وەك لێقەوماومان لێهاتبوو نەماندەزانی چیبکەین، لەلایەکەوە ڕووی گەڕانەوەشمان بۆ شاری خۆمان نەبوو تا ئەو کاتەی شەیتانی گول موراد دووبارە فریوی دامەوە، چونکە بە ئامانجەکەی واتە پارەداربوون نەگەیشتبوو پێشنیاری کرد بە جلی کرێکارییەوە لەسەر ڕێگای ئەو ئوتومبیلانەی کە یەك کەسیان تێدایە بووەستین و بە کوشتنی شوفێرەکەو دزینی ئوتومبیلەکەیی و شەق و شڕ کردن و فرۆشتنیان بە دەلاڵ و ماڵکرەکان بە پارەیەکی زۆر دەگەین، گول موراد ئەوەندەی گووت و سەراسووم بوو تا سەرەنجام ڕازی بە هاوکاری کردنی بووم، لە کاتێکدا بە تەواوی بوونمەوە لەم کارە شەرمەزارم، باوەڕبکەن لە یەکەمین تاوانەوە کە ئەنجامماندا ڕیسوابووین)) دین محەمەد کە بەم جێگایە گەیشت فرمێسکەکانی سڕییەوەو هەناسەیەکی بە ئاسوودەیی هەڵکێشا، وەك بڵێی بارێکی قورسی بەسەر شانیەوە هەڵگرتبوو، پاشان بەردەوام بوو: ((تەرمی شوفێرەکەمان بۆ ناو چاڵێکی دوورە دەستی بیابان فرێدا، ئامادەم شوێنەکەشتان پیشانبدەم)) دین محەمەد بێدەنگ بوو، بێدەنگیەکی تاڵی درێژ کە ئەوی بۆ جیهانی خۆی برد،کاتێ سەری بڵند کرد،غەمێکی قووڵ لە نیگای پەشیمانی دا دەبینرا: ((ئێستا دانم بە هەموو شتێکدانا و دەشزانم پەتی سێدارە چاوەڕوانمە، ئێستا دەزانم خانەوادەی کوژراو بە نیگەرانی و ئومێدەوە چاوی لە دەرگا بڕیوە تا پیاوی ماڵ بێتەوەو کۆتایی بە

چاوەڕوانی سەخت بێنیّ،لێگەڕێن بۆ دوواهەمین جار خزمانی نزیکی کوژراو ببینم، لەبەردەمیان بکەومە سەر ئەژنۆ، فرمێسک بڕێژم و داواشیان لێبکەم بمبەخشن و گەردنم ئازادکەن،بەداخەوە کە چارەنوسسازان چارەنوسی منیان بەجۆرێکی دیکە تۆمارکرد)) .

# کۆنە برین

دەنگی هاوارو گاڵە گاڵە دڕندەییەکان گوێی فەلەکیان کەڕ کردوو نەرم و نیانی هەوای نەورۆزی لەو سپێدە بەهارییە لەکەدار کردبوو، هەموو خەڵکی لادێ بە وردی و نیگەرانیەوە بۆ لای شوێنی شەڕەکە ڕایاندەکرد تا لە هۆکاری تێکچوونی خەوەکەی بەیانیان تێبگەن، هەندێك کە هەواڵەکەیان زووتر بیستبوو دەماری غیرەتیان جووڵابوو بەهەرچی کە بەر دەستیان دەکەوت بۆ ناو هەرایەکە چوون و بۆ لایەنگری لە ئێلّ و هۆزی خۆیان دەکەوتنە گیانی کەسانی بەرامبەرەوەو بیریان لە ئەنجامی کارەکەیان نەدەکردەوە، یەکێ بە گۆچان و یەکێ بە بێڵ و هەروەها بە دەست هێرشیان دەبرد و هەندێکیش بە دەستی خاڵی و تەنها بە مشتەکۆڵە و پێلەقە دەجەنگین، لەم نێوانەدا جار جارە دەنگی تەقەش دەبیسرا کە هەڵبەتە بەگشتی بێ وەڵام نەدەمایەوە، یەکێ لەسەر زەوی دەپلیشاوەو خوێن لە جێی گوللە فیچقەی دەکرد، بەڵام لەو گێرە و کێشەیە کەس سەرنجی تفەنگ بە دەستانی نەدا، لە گشت لایەکەوە دەنگی هاوار و ناڵە بەرزبۆوە، زۆرێك برینداربوون و هەوڵیاندەدا بەهەر شێوەیەك بێ لە ژێر دەست وقاچی ئەوانی دیکە ڕاکەن و لەو دژوارییە سەلامەت دەرچن، دەنگی هاوار و جنێوو قسە ناشیرینە شەرمهێنەکان کە هەردوولا بەیەکتریان دەگووت، سات بە سات زیاتر بەرز دەبۆوە تا ئەوکاتەی یەکێکیان کە دۆخەکەی زۆر بە نالەباری بینی بەپەلە پەیوەندی بەبنکەی مەڵبەندی ناوچەکەوە کردو لە مەسەلەی ململانێ و کێشەی نێوان دوو هۆزی ناسراوی گوند، واتە هۆزی جمشید خان و فرامرز خان ئاگاداری کردینەوە، زۆر زوو لەگەڵ تیمێ لە کارمەندان ئامادە بووین و بەرەو گوندەکە بەڕێکەوتین، خۆشبەختانە جاددە چۆڵ بوو توانیمان لە ماوەی چەند خولەکێك بە شوێنی شەڕەکە بگەین، بەڵام ئەو دیمەنەی لەبەر چاومان بوو، ئاه ڕۆحی دەرهێنان، شێوەی دڵ ڕووشێنی پێشچاومان هاوشێوەی مەیدانی شەڕ ژمارەیەکی زۆر بریندار لە سوچ و کەنار کەوتبوون و لەتاو ئازار دەیاننالاند و هەندێکیشیان پێویستیان بە کۆمەکی خێرای پزیشکی هەبوو،

بەپەلە هەنگاوە پێویستەکانمان نا و ئوتومبیلی فریاگوزاریمان داواکرد، ئینجا بە هاوکاری خەڵکی بێلایەنی گوندەکە لە خاڵی سەرەکی کێشەی هەردوو لاکەمان پرسی کە هێشتاکەش دەسەویەخەی یەکتربوون، هێور کردنەوەی بارودۆخەکە و گەڕاندنەوەی ئارامی بۆ گوندەکە هێندە سەختبوو ئاگام لە تێپەڕینی کات نەمابوو، کاتێ بەخۆهاتمەوە چەند کاتژمێرێ لە نیوەڕۆ تێدەپەڕی، هەندێك لە برینـدارەکان کە زامێکی وەهایان نەبوو لەگەڵ ئەندامانی خۆمان بەرەو ئەو دەرمانگایەنەمان ڕەوانەکردن کە چارەسەری سەرپێیان تێدایە، ئەگینا ئەوانەی دیکەمان بۆ نەخۆشخانەی شار گواستنەوە، وردە وردە خەریکبوو دۆخەکە بۆ حاڵەتی ئاسایی خۆی دەگەڕایەوە، هێشتاکە ماندوویەتیم لە بەڕێوەبردنی ئەم سەر ئێشەیە نەحەسابۆوە لە ڕێی هاوکارانمەوە لە مردنی یەکێ لە بەشداربووانی شەڕەکە ئاگادارکرامەوە، بە ڕێنمایی کارمەندان بۆ سەر تەرمی کابرای تەمەن نزیکەی سی و پێنج ساڵە بە ناوی هیدایەت ئامادەبووم کە بە قسەی خەڵکەکە سەر بە هۆزی ((فرامرز خان)) بوو بە سینەی کون و ئاوێتە بە خوێن لە سوچێکدا کەوتبوو گیانی دەرچووبوو، جەستە و جلەکانی دڕاوو خۆڵاوی ببوو، چەند جێیەکی دەست و قاچیشی شین ببۆوەو ئاوسابوو واپێدەچوو کوتکی گەورەی بەرکەوتبێت، بەپێی بۆچوونی پزیشك تەنها گوللەیەکی تفەنگ بەر دڵی کەوتبوو کاری تەواو کردبوو، لەو کاتی کێشەوهەرایەدا هیچ کەسێ بیری لە برینداراني ڕووداوەکە نەدەکردەوە، بەهۆی وەستانی دڵی دەم و دەست گیانی لەدەستدابوو، هەڵبەتە هەر بەوجۆرەی کە گومانم کردبوو، کوژراو سەرەتا بەهۆی چەند کەسێکەوە ببووە سەرچاوگەیەك بۆ لێدان و قسەی ناشیرین وە توانای هەموو جۆرە بەرگریەکی لەدەستدابوو، بەڵام گوللەکە ئەوەندە بەسەرنج و لێزانانە بەر دڵی هیدایەت نیشانەی گرتبوو دەتگووت تفەنگ بەدەست پێشتر کوژراوەکەی خستۆتە ژێر چاودێرییەوەو لە دەرفەتێکی گونجاودا لە دوورییەکی زۆر کەمی دڵیەوە سێرەی لێداگرتووە، ئەمەش ئەگەری کوشتنی بە دەستی ئەنقەست زۆرتر بەهێز دەکرد هێشتا تەرمی هیدایەت بە ئوتومبیلی فریاگوزاری نەگوازرابۆوە کە قیژە و هاواری ژنێك لە دوورییەکی کەم

بەر گویّ دەکەوت، زۆری نەبرد ژنێکی گەنج بەسەرو سینەی خۆیدا دەکێشاو چەند ژن و کچێکی دیکەشی لەگەڵدابوون گەیشتن و دریان بە خەڵکەکەدا و خۆیان بە تەرمەکە گەیاند، هەر کە چاویان بە جەستەی خوێناوی و بیّ جووڵەی کابرا کەوت،قیژە و زریکەی وایان لیّدەدا دڵیان دەکردی بە ئاو خۆیان پیّدادا و کەوتنە گریان، دیتنی ئەم دیمەنە بە سویّ یە حاڵی تێکدام و بە چاوانی تەڕەوە تەماشای ئەو دیمەنەم دەکرد و بیرۆکەیەك بۆ قووڵایی خۆی بردبووم کە چۆن دەبیّ کارەساتێکی وەها بێتە پێش و بەهۆی دەمارگیری کوێرانەی دوو هۆزەوە، خانەوادەیەك پیاوی ژیانیان لەدەست بدەن، پاش گواستنەوەی تەرمەکە بۆ شارو بەسەر خۆدا زاڵبوون، کەوتمە هەوڵی پشکنینی هۆکاری ڕووداوەکە، لێکۆڵینەوە بەراییەکان ئەوەیان پیشاندەدا کە هۆکاری سەرەکی ئەم هەرایە، جیاوازی دووکەس لە خاوەن کێڵگەکانی دوو هۆزەکە لەسەر پارچەیەك زەوی بووە کە هەر یەکەیان بانگەشەی موڵکایەتیان بۆ کردووە، کاتێکیش لە ڕێگای ئاشتیەوە بە ئەنجام نەگەیشتوون، کەوتونەتە دەسەویەخەی یەکتری و لێکیانداوە بۆ ئەوەی هەر کامێکیان کە هێزی بازوو توانای زۆرتری هەبیّ، لە کۆتاییدا ببێتە خاوەنی ئەم زەویە ! بێگومان هەر کام لە خاوەن موڵکان و جوتیاران خزم و خوێشانی خۆیان هەیە و ئاگاداربوون لە ڕوودانی ئەم هەرایە بۆیە یارمەتیانداون و بیّ ئەوەی لە مەسەلەکە حاڵی بن و بزانن یا بیر لە ڕێگا چارەیەکی دیکە بکەنەوە، تەنها هەڕەمەکیانە بیریان لە سەرکەوتنی شەڕەکەو زاڵبوون بەسەر کەسانی بەرامبەریان کردۆتەوە، هەڵبەتە ئەم دوو هۆزە پێشینەی هەراو کێشەی دیکەیان لە ڕابردوودا هەبووە و دوژمنایەتیەکەیان بۆ گوندەکانی دیکەی دەوروبەریش گوێزراوەتەوە بۆیە ڕیّ و شوێنی یاسایی گیرایە بەر، ڕاپۆرتەکانم ڕێکخست و قۆناغە سەرەتاییەکانی توێژینەوە تەواو بوو، تەرمی هیدایەت پاش پشکنینی ورد لەسەر دەستی پزیشکی یاسایی بە خانەوادەی جەرگ براویان درایەوەو لێکۆڵینەوەی ئێمەش لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد، لەو جێگایەی کە بەپێی بۆچوونی پزیشك، هیدایەت بەهۆی پێکانی گوللەی تفەنگێکی

ڕاو کوژرابوو، وای بۆچووم یەکێ لە خزمەکانی هۆزی جمشید خان بە تفەنگی ڕاو تەقـــــــــەی لێکـــــــــــردووەو کوشـــــــــــتوویەتی، لە یەکەمین قۆناغدا لـە برینـدارانی ڕووداوەکـە لێپرسـینەوەی تـەواومان ئەنجامـدا، کەچی هیچ کامێکیان لە مەسەلە سەرەکیەکە ئاگادار نەبوون یا ئەگەر شتێکیشیان دەزانی بێدەنگ دەبوون و ڕاستیەکەیان نەدەگووت، ڕەنگە ئـەم بێـدەنگ بوونـەش لە ترسی تورەیی ئەوانی دیکە بووبێ بە تایبەتی بەرپرسی هۆزەکـان کـە لەوانەیـە خۆیـان یـا خانـەوادەکانیان دەسـت لـە کـاری تۆڵەسێن بـدەن و دوور نیـە ئـاگری جـەنگێکی دیکـە لـە نێوانیانـدا هەڵبگیرسـێتەوە، کـاتێ لـە بەدەسـهێنانی زانیـاری لەلایەن بریندارو کەسانی دەسگیرکراو لـە ڕووداوەکـە نائومێـد بـووین، ڕوومـان لـە لێکۆڵینـــەوەی هونـــەری و توێژینـــەوەی وردی دیمـــەنی کارەســـاتەکە کـــرد، بـــۆ بەردەوامبوون و سەرکەوتن لە ئاشکراکردنی قاپۆرەی گولله هاوێژراوەکانی وەختی شەڕو زانینی جۆری ئەو چەکانەی کە گوللەی مەرگباری پێ هاوێژرابوو دۆزینەوەی ئەو چەکەی مەبەسـتمان بـوو لـەو ناوچـەیە زۆر ئاسـان بـوو، چـونکە دەمێـك بـوو خەڵکەکە تفەنگی ڕاویان وەلا نابوو کەڵکیان لێوەرنەدەگرت، ئەوانەی کە هێشتاش ئەو جۆرە چەکەیان بەکاردەهێنا تەنها بۆ سەیران و خۆشی و ڕاو بوو، لە گـەڕان و پشکنین بـۆ دۆزینـەوەی ئەوانـەی بڕوانامـەی تفەنگی ڕاویـان هەیـە ژمارەیـەك لـە گەنجانی کەم تەمەنی گوند بە کۆمەکمان هاتن کە ئاگاداری باشیان لە چـەکدارانی گونـدی خۆیـان هـەبوو، دوو کـەس لەوانـەی خـاوەنی ئـەو جـۆرە تفەنگـە بـوون دەناسران، یەکێکیان بەناوی عینایەت،،،،،لـە لێکۆڵینـەوەکان ڕاسـتگۆیانە گـووتی کە یەکەمیان تێکەڵی شەڕی هیچکام لەلایەکان نەبووە و هەردوو هۆزەکە لە خزمان و بنەماڵەی ئـەو بـوون، دووەمیـان لـە ڕۆژی ڕووداوەکـە لـە گونـد نـەبووە، بـەپێی پرسیارو گەڕانی کارمەندانمان قسەکانی ڕاست دەرچوون، بـەدووای کەسـی گومـان لێکراوی دووەمدا واتە فـەیروز چـووین، پیـاوێکی چـل سـاڵەیی کـە وا دەردەکـەوت عاشقی کێوو دەشت و ڕاوی ئاژەڵانی کێوی بوو، فەیروز بانگەشەی ئەوەی کرد کە تفەنگەکـەی بەقـەرز بەیـەکێ لـە خـەڵکی دێ داوە، بـەڵام کـاتێ ناوونیـشانی ئـەو

کەسەمان لێداوا کرد، زمانی تەتەڵەی کردو هەوڵی دا درۆیەکەی پینەبکات، هەر بۆیە بەجۆرێکی لەپڕ بۆ قسەی درۆیینی یەکەمی گەڕایەوەو بە سیمایەکەوە وەك بڵێی حەق بەوە گووتی تفەنگەکەم بەیەکێ لەوانەی هۆزی خۆمم بەناوی نەسیر فرۆشتووەو ئەویش لەڕۆژی شەڕو هەراکە لە لادێ نەبووە، قسە پێچەوانەکانی فەیروز شك و گومانی لا دروستکردم و ناچاربووم ناڕاستەوخۆ بیخەمە ژێر چاودێرییەوە، کاتێ سۆراغی نەسیرم لە خزمەکانی وەرگرت گووتیان: لە شەڕەکە بەسەختی بریندار بووەو ئێستا لە نەخۆشخانەیەکی شار کەوتووە، ناونیشانی نەخۆشخانەکەم وەرگرت و بۆ سەردانی چووم، نەسیر بە سەری پێچراوو دەست و قاچی شکاوەوە بە بینینم حەپەسابوو،هۆیەکەی لێ پرسیم و لە دووای بیستنی قسەکانی فەیروز پێکەنی و گووتی: ((ئاخر جەنابی ئەفسەر! خۆتان ناوبژیکارین، من ئەگەر چەکێکی وەك تفەنگم هەبا،یەکەمیان بەرگریم لەخۆم دەکردو بەم ڕۆژە نەدەگەیشتم، دووەمیشیان دەمێکە من دەستم لە چەکی گەرم نەداوە، جا چ جای ئەوەی بمەوێ یەکێکیشی پێ بکوژم، پاشان چ بیانوویەك هەیە تا بمەوێ تفەنگێکی ڕاو لە فەیروز بکڕم؟! لەهەموو ئەمانەش گرینگتر، دەبێ لە وەڵامی ئەو درۆ گەورەیەی فەیروز چی بڵێم کە بە ئێوەی گوتووە لە ڕۆژی شەڕەکە من لەوێ نەبووم، ئەی ئەگەر لەوێ نەبام ئێستاکە بەم جەستە لەت وپەتە لێرە چیمدەکرد؟ دەبینی چ درۆیەکی مندالآنەی بۆ جەنابتان کردووە؟! بەڵام ڕەنگە ئەم قسانەی کە دەمەوێ بۆتیان بکەم بە کەڵکتان بێت! فەیروز خۆی چەندین جار گوتوویەتی گیانی بە تفەنگەوە بەسراوەتەوە و لە ژێر کاریگەری هیچ هەل و مەرجێ لەخۆی دووریناخاتەوە! وا ڕێکەوت ڕۆژی ڕووداوەکە بە تفەنگی ڕاوەوە بینیم کە بە خۆشحاڵی و لەخۆبایی بوونەوە چەند کەسێکی بریندار کرد، دووایی لەپڕ ون بوو، لەوانەیە فەیروز دەستی لە کوشتنی هیدایەت هەبێ! دڵنیام هەموو خەڵکی لادێ لە ڕووداوی چەندین ساڵەی پێشوویان ئاگادارن و بە بیریان دێت، ئاخر فەیروزو هیدایەت لە مەسەلەیەکی عەشق بۆ یەکێ لە کچەکانی لادێ ڕەقیبی یەکتر بوون!))

دووباره بۆ سۆراغی فەیروز ڕۆیشتمەوه و داوام لێکرد ڕاستی بڵێ تا تاوانەکەی سوکتربێت، فەیروز به دەنگێکی توڕەو ئاگرینەوه وەڵامی دامەوەو بۆ چەندەمین جار نکوڵی له کوشتنی هیدایەت کرد، پێی دەڵێم: ((گرفتێك نیه فەیروز گیان! مۆڵەت دەدەن ماڵەکەتان بپشکنین؟! به دڵنیاییەوه ئەگەر شتێکی گومان لێکراو نەدۆزینەوه، بڕوامان به ڕاستگۆیی ئێوه زۆرتر دەبێت، هەر وەکو قسەیەکی بەناوبانگ هەیه دەڵێ، ئەوەی ڕابردووی پاکه له پرسینەوه بێباکه!))
فەیروز سەرەتا واقی وڕما بەڵام زوو بەسەر خۆیدا زاڵبوو به دڵێکی فراوانەوه ڕازی بوو، بەڵام دەمتوانی له نیگای تێبگەم دەیەوێ واپیشاندا که پشکنینی ماڵەکەی بەلایەوه گرینگ نیه و خەیاڵی ئاسوودەیە،له ڕاستی دا له پشت ئەو ڕواڵەته پشت گوێخەره ئاشوبێکی دەروونی هەڵگیرساندبوو هەرچەندی هەوڵی دەدا نەیدەتوانی دەنگی لەرزۆکی ئاسایی بکاتەوه، به کۆمەکی کارمەندانی هاوڕێم و ئەو سەرنج و فەرمانه داوەریانەی پێمانبوو، بست به بستی ماڵی فەیروزمان پشکنی و شتێکی به گومانمان بەرچاو نەکەوت،فەیروز که هێزو جورئەتی پەیدا کردەوەو خەیاڵی ئاسوده ببوو، دووباره به سیمایەکەوه وەك بڵێی حەق بەوه دەستی به زۆر بڵێی کردەوه: ((بینیتان جەنابی ئەفسەر؟! من ساڵەهایه لەم گونده ئابڕومەندانه دەژیەم،ئێستا چۆن بێم بەهۆی چەکێکی بێ نرخەوه هەموو ئابڕوو ڕەواجی چەندین ساڵەم بخەمه ژێر پرسیارەوه؟! خەڵکی زۆر باشم دەناسن، بەڵام هەموو کەسێك دوژمن و نەیاری هەیه! ئەم جۆره مرۆڤانه لەوانەیه بیانەوێ پلانێکم لێ بگێڕن،ئێوه که ئەزمونێکتان هەیه پێم سەیره گوێ له قسەی ئەوانه دەگرن،،،))
هەر بەو جۆره که له حەوشەی ماڵەکه تێدەپەڕیم و گوێم بۆ زۆر بڵێی و قسه تەواو نەبووەکانی فەیروز گرتبوو، چاوم به سووچێك کەوت، تەنورێکی گڵێنی کۆنه و پڕ له کۆتەره دار سەرنجی بۆ لای خۆم ڕاکێشام، له هاوڕێیانم پرسی: ((ناو ئەو تەنورەش گەڕان؟!)) گوتیان: ((چونکه پڕ له دار بوو نەمانتوانی به باشی بگەڕێین و هەر ئاوا سەرپێیی تەماشامان کرد)) نیگایەکی کاریگەرم له فەیروز کرد، به بیستنی ناوی تەنور ڕەنگ و ڕووی گۆڕاو دەمارەکانی دڵەکوتێ له چاوی

ترساوی بەدەرکەوت، بە هێواشیەوە گووتم: ((باشە مادام خۆم ئەمجارە ناو تەنورەکە بە وردییەوە دەپشکنم، ئێوە گرفتێکتان نیە کاك فیروز، ڕاستە؟!))

فەیروز خێرا بەسەر خۆیدا زاڵبوو بە دنگێکی بێ بایەخەوە گووتی: ((ئەوەی ڕاستی بێ بلێم چی؟! ئەوێ لە دارو تەختە زیاتر شتێکی دیکەی لێنیە تا کەڵکیان لێوەرگرن، دووایی ناچارم بە تەنها هەموو دارەکان بخەمەوە ناو تەنورەکە، بەڵام بۆ ئەوەی خەیاڵتان بە تەواوی ئاسوودە بێ بفەرموون!))

ناچار بووین تەنورەکە بەتاڵ بکەین، ئینجا بە وردی دیوارەکانی و خۆڵەمێشەکەی ناوی گەڕاین، لە دوواهەمین ساتدا دەستم بەر شتێ کەوت، وەختێ بە نیازی گەڕان خۆڵەمێشەکانی دەوروبەریم لابرد ئەوەی کە دەمویست پێی گەیشتم، تفەنگێکی ڕاو بە جۆرێکی شارەزایانە لە ژێر چڕی پووش و پەڵاش و خۆڵەمێش شاردرابۆوە، سەرم هەڵبڕی و پێکەنینێکی سەرکەوتوانەم بۆ فەیروز کردو ئەویش لە ترسان دەلەرزی، خەریکبوو ڕابکات، بەڵام هێشتا لەماڵەکەی دەرنەچووبوو لە چەنگاڵەکانی کارمەندان گرفتار بوو، چەند کاتژمێرێك دووایی، من و فەیروز لە ژووری لێپرسینەوە ڕووبەڕووی یەکتر دانیشتبووین و ئەو خەریکبوو بە دەنگێکی تێکەڵ بە پەشیمانی بەسەرهاتی ئەو ڕۆژە غەماوییەی دەگێڕایەوە: ((گوتیان لەنێوان دوو هۆز شەڕوهەڕا قەوماوە، منیش چاوەڕوانی دەرفەتێکی وەهابووم تا بە خەیاڵی خۆم سەرنجی خەڵکەکە بۆ لای خۆم ڕابکێشم و لەنێو خەڵکیدا بەناوبانگ بم و لە خوام دەویست، تفەنگم هەڵگرت و بەپەلە بۆ شوێنی شەڕەکە ڕۆیشتم، کاتێکیش مرۆڤ تفەنگ بەدەستەوە دەگرێت ناتوانێ تەقە نەکات، منیش بەحەزو تاسەوە چەند کەسێکم بریندار کرد، لەنێو ئەو قەرەباڵغی و شەڕە شەقە هەوڵمدەدا لە بەرکەوتنی شەلم کوێرم کەس نابوێرمی دارو کوتك و بێڵ و قوڵنگ ڕاکەم، چاوم بە هیدایەت کەوت لە سوچێکدا کەوتبوو لەتاو ئازار تلی دەدا، پێدەچوو کوتکێکی چاکی خواردبێ چونکە توانای هیچ کارێکی تەنانەت بەرگری لەخۆکردنیشی نەبوو، بە دیتنی هیدایەت بیرەوەری ڕقێکی کۆن لە خەیاڵم زیندوو بۆوەو کەوتمە بیری تۆڵەوە، سەردەمێ من یەکێ لە کچەکانی گوندەکەم خۆشدەویست، ئەویش کە باشترین هاوڕێم بوو ئاگای لەم عەشق و خۆشەویستیە هەبوو، زووتر دەستی خۆی وەشاندوو بۆ خوازبێنی ئەو کچە ڕۆیی و توانی

سەرنجی کچەکە و خانەوادەکەی بۆ لای خۆی ڕابکێشێ و بیخوازێت! هەر ئەو کچەی کە ئەمڕۆژانە بە تازیەباری مردنی مێردەکەی دانیشتووە و ڕۆژگاری ڕەش بووە! باشترین دەرفەت بوو، هیچ کەس ئاگای لە هیدایەت نەبوو، چاوێکم بە دەوروبەری هیدایەتدا گێڕاو تاشەبەردێکی گەورە کە چەند هەنگاوێ لێیەوە دوور بوو سەرنجی ڕاکێشام، خێرا بۆ پشت ئەو تاشەبەردە چووم و بۆسەم بۆ دانایەوە، ئەو کە ئاگای لە من بوو بە ترس و لەرزەوە دەستی بە هاوارو کۆمەك خواستن کرد، بەڵام لەنێو ئەو مەحشەرە گەورەیە کەس گوێی لێدەبوو؟! قاقایەکی مەستانەم بۆ کردو هاوارم لێکرد، ئیدی کارت تەواوە هیدایەت خان! تۆ عەشقەکەمت لێ ستاندم، منیش گیانت لێ دەسێنم!

هیدایەت بە داماوی و بێباوەڕییەوە لێم ڕاماو کاتێ بینی بڕیارەکەم بۆ کوشتنی بەڕاستیە، هەموو توانای خۆی کۆکردەوە و بە ڕاکێش ڕاکێش لە گوللەی تفەنگم ڕایکرد، بەڵام خۆم دووانەخست و بە نیشانەیەکی پڕ سەرنجەوە دڵیم کون کرد، بەجۆرێ کە پاش چەند لینگە ژەنەیەك لە جووڵە کەوت و هەناسەی نەما، منیش خەیاڵم ئاسوودە بوو  خێرا خۆم لە شوێنی شەڕەکە دوورخستەوە تا هیچ پاشماوەیەك لە دووای خۆم جێ نەهێڵم، یەکەمین کارێکیش کە کردم شاردنەوەی شارەزایانەی تفەنگەکە بوو لەنێو تەنوور، لە ڕاستیدا وامدەزانی بە کوشتنی هیدایەت مێشکم ئاسودە دەبێ، بەڵام خوا شایەتە کاتێ دەنگی ناڵە و گریانی ژن و دوو منداڵە بچووکەکەیم دەبیست لەخۆم بێزار دەبووم کە چۆن خانەوادەیەکم هەتیوو بێ سەرپەرشت کرد، تەنها لەبەر بەهانەیەکی گەمژانەو بێهۆشی؟! نەفرەت لە شەیتان کە کۆنە برینی عەشقی منی دووای ساڵانێك لە بوونمدا تازەکردەوە))

بەهۆی قسەکانیەوە دۆسیەی کوشتنی هیدایەت تەواو بوو فەیروزیش بۆ پشت شیشەکانی زیندان گوێزرایەوە تا داخی ئازادی لەدەست چوون بخوات و نەعلەت لە بەختی بەدی خۆی بکات، ئەم کارەساتە بووە هۆی ئەوەی هەردوو هۆزی بەناوبانگی ئەو گوندە تەواوی ڕق و کینەکانی ڕابردوویان وەلا بنێن و ناوچەکەیان پڕ لە بۆنی خۆشی و ئاشتی و برایەتی بکەن؟

# بلێسەکانی تورەیی

هەتاوی سووتێنەری هاوین هەموو شتێکی لە گەرمای خۆی تواندبۆوەو هەموو ڕۆحلەبەرێك لە هەوڵی پەیداکردنی شوێنێکی فێنك و خۆش بوو، کەمێ لە شار دوورتر لە یەکێ لە باغە پڕ دارو سەوزەکان کە لە ژێر گەرما وەنەوزی دەدا، پیاوێکی نزیکەی چل ساڵە، لە ژێر سایەی چڕی درەختەکان هەنگاوی دەنا و بیری لەو نەخشەیە دەکردەوە کە لە خەیاڵیدا هەبوو: ((دەبێ بیترسێنم تا کارەکەم لە دەست نەچووە!))

کەمێ قژی ماش و برنجی پشتی سەری داپۆشیبوو بەشی پێشەوەشی لە بێ موویی بریسکەی دەدا، برۆ چڕو ئەستورو ئاڵۆزەکانی، ڕەنگی قاوەیی چاوانی گەورەی تۆختر پیشاندەدا و لووتە گەورەکەشی بەجۆرێکی خراپ ناحەزو درێو پیشانیان دەدا، هەموو ئەمانە، سەرەڕای برینە جێماوەکانی لە برینی چەقۆ کە یادگاری ساڵانێکی پڕ کەف و کوڵی گەنجێتی بوون و سمێڵی بابڕی دەهۆندەوە و سیمایەکی درێوو زبریان پێدەبەخشی، کابرا پەشۆکاوو سەر لێشێواو دەستی بۆ گیرفانی برد و چەقۆیەکی باشی کە تێدا شاردبۆوە، دەستێکی پێدا هێناو دووبارە و چەند بارە، بیری لە سەرەنجامی کارێ کە دەیویست ئەنجامی بدات کردەوە، بەڵام دەنگی وڕەی ئوتومبیلێ کە بۆ ناو باغەکە هاتبوو لە نێوان درەختەکان ڕێك بۆ لای ئەو دەهات، ڕشتەی خەیاڵاتەکانی پچڕاند،ئوتومبیلی ژمارە ٤٠٥ ڕەش و مۆدێل بەرزێ بوو سێ کەسی تێدابوو، هەر بە نزیکی پیاوەکە گەیشتن ڕایانگرت و هەر سێ گەنجەکە لێی دابەزین کە جیاوازییەکی وەهایان لە تەمەندا لەگەڵ یەك نەبوو، یەکێ لە گەنجەکان بۆ بەردەمی چوو، بە دەنگێکی تێکەڵ بە ڕەوشت و نیگەرانیەوە سڵاوی کرد و دەستی بۆ لای کابرا درێژ کرد، بەڵام چۆنیەتی وەڵامی کابرا و نیگای سارد و دوور لە گاڵتەو زەردەخەنەکانی سەر لێوی گەنجەکەی دوورخستەوە، کابرا بە ئارامی خەریکی قسەکردن بوو لەگەڵ گەنجەکە، گەنجێکی دیکەشیان دەستی بە پێشەوەی ئوتومبیلەکەوە گرتبوو چاوی لە هەردووکیان بڕیبوو، کەمێ دوواتر،دەنگی مشت و مڕی کابرا و گەنجەکە تا دەهات بەرزتر

دەبوو، لەنێوان لق و گەڵاکانی درەختان دەنگی دەدایەوەو چۆلەکە هار و هاجەکان بە ترساوییەوە ڕایاندەکرد،لەپڕ بریسکەی تیغی چەقۆ لە دەستانی کابرا دەرکەوت و لە چاوانی گەنجەکەی دا و زەوی سەوز پۆشی باغ بە خوێنی تازە ڕەنگین بوو،،،،لە دووای تێوەگلانی کوشتن هەموویان هەڵاتن، سەروچاوی کابرای گەنج بە تەواوی سووتابوو پاشماوەی سووتاوی لە گشت ئەندامانی دیکەی لەشی بەرچاو دەکەوت، لە جلەکانیشی شتێکی وەها زۆر نەمابۆوە، بە کەمێ سەرنجەوە شوێنەواری لێدانی ژمارەیەك چەقۆ یا هەر شتێکی نوك تیژ بەسەرچەند جێگایەکی جیاوازی جەستەی لەڕولاوازییەوە دەبینرا، ئەگەر ئەو پیاوە تەمەن ناوەڕاستە پەیوەندی نەکردبایەو ئێمەی لە بوونی تەرمێکی نیوە سووتاو لە یەکێ لە کاولەکانی دەوروبەری شار ئاگادار نەکردباوە ئێستا تەرمەکە چارەنوسێکی دیکەی دەبوو، دەنگی ترساوی کابرا هێشتا لەنێو گوێم دەزرینگایەوە: ((ئەلو؟! سلاو جەنابی ئەفسەر! من ئێستا بەرامبەر تەرمێکی نیوە سووتاو وەستاوم کە،،،،ئەوەی ڕاستی بێ نازانم کێیە، چونکە سیمای بەهۆی سووتاوییەوە ناتوانرێ بناسرێتەوە، بەڵام دیار نیە کام مرۆڤی بێ ویژدان و بێ ئاگا لەخوا گیانی ئەمەی بەم ڕۆژە گەیاندووە،،،کاتێ بەسەر تەرمەکە گەیشتم،هیچ کەسێکم نەدیت،،،،))

پاش گەیشتنمان بۆ شوێنی تاوانەکە توانیمان قۆناغە یاسایی و هەماهەنگیە داوەرییە پێویستەکان ئەنجام بدەین، ڕاپۆرتی مەڵبەندی پزیشکی یاسایی لە چۆنیەتی کوشتنەکە سەرە داوێکی تازەی بە دەست تیمی توێژینەوەدا و هەندێ ڕەهەندی نوێی لەو ڕووداوە دڵتەزێنەی کە ڕوویداوە ئاشکرا کرد: ((سەرەتا کوژراو بە لێدانی ژمارەیەك بڕەر کە بە گشتی لە ململانێ و شەڕەکانی سەر شەقام بەکاردەهێنرێت مردووە، ئینجا بۆ شوێنێکی دیکەی کاولێکی داوێنی شار گوێزراوەتەوە هەڵبەتە پێش گواستنەوە، بکوژ یا بکوژان ئاگر لە تەرمەکە بەردەدەن تا تاوانەکەیان دیارنەبێ))

یەك دوو ڕۆژ دووای ئەم ڕووداوە، پیاوێك پەیوەندی بە ئاسایشەوە کردوو هەواڵی بزربوونی کوڕە بیست و چوار ساڵەکەی بە ناوی ((مالك)) بە کارمەندان

گەیاندووە، وەختێ تەرمی نیوە سوتاوو تازە دۆزراوەمان پێ پیشاندا ئاهێك لە ناخی بڵند بوو فرمێسك دەموچاوی تەڕ کرد چونکە توانیبووی کوڕی ئازیزی بناسێتەوە،لە دووای هەماهەنگی داوەری و وەرگرتنی مۆڵەت لە مەڵبەندی پزیشکی یاسایی، تەرمەکەمان بە خانەوادەکەی دایەوە، بەڵام لێکۆڵینەوەکانی پۆلیس بۆ پەردە لادان لەسەر ڕازی ئەم تاوانە ترسناکە هەر بەردەوام بوو، لە درێژەی توێژینەوەکان سەرنجمدا مالك دووای بەسەربردنی ماوەی سەربازی، لە دووکانێکی نۆژەنکردنەوەی پێویستیەکانی کارەبا وەکو شاگرد خەریکی کار دەبێ، جگە لە جگەرە کێشان وەکو حەزی خۆی هیچ ماددەیەکی دیکەی وەك تلیاکی بەکارنەهێناوە و پەیوەندیشی لەگەڵ خانەوادەکەی باش بووە، بەڵام کاتێ بۆ مەسەلەکە لەگەڵ خانەوادە و خزم و خوێشانی کوژراو بۆ بنج و بناوانی چووم بۆ کۆمەڵێك خاڵی جیاواز دەگەڕایەوە، وەکو ڕووداوی عاشقانەی مالك و کچی مامی، وادەرکەوت مالك پەیوەندی بە ((مهین)) ی کچی ڕەسولەوە دەبێ و چەندین جار مامی لە مەبەستەکەی لە خواستنی مهین ئاگادار کردۆتەوە، بەڵام هەمووجار مامی بە توندی و ناسازەوە ناڕەزایی خۆی ڕادەگەیاند، لێکۆڵینەوەی دۆسیەکانی پێشووی ڕەسولیش وایان پیشاندەدا کە لە ڕابردوودا زۆر سەر بە کێشەو دۆخە بووە و هەر بۆیەش چەند جارێك بۆ ئاسایش و دادگا بانگ کراوە، ئینجا لە ڕێ و ڕەسمی حەوتەمی مالك بۆ سۆراغی ڕەسول ڕۆیشتم، بەڵام هاوسەری گووتی: ڕەسول لە ماڵەوە نیە،یەك دوو جاری دیکەش لە دیداری ڕەسول بێبەش بووم، بەڵام بە خستنە ژێر چاودێری ماڵەکەیی و کاتی هاموشۆکانی بۆ ماڵ و وەرگرتنی مۆڵەتی یاسایی بۆ چوونە ناو ماڵەکەیانەوە، سەرەنجام شەوێ بە سۆراغیەوە چووین و لە ژێر زەمینی ماڵەکەی دۆزیمانەوە، بە دیتنی کارمەندانی پۆلیس حەپەسابوو، بە هاوارەوە سەرزەنشتی ژنەکەی دەکرد: ((مەگەر پێم نەگووتی بەهیچ جۆرێ نابێ بهێڵی پۆلیس بۆ ناو ماڵ بێ؟!)) من زووتر لە هاوسەری دەستم بە قسەکرد: ((هاوسەرتان هیچ کەمتەرخەمییەکی نیە کاك ڕەسول! چونکە ئێمە زۆر تامەزرۆی دیتنی جەنابتان بووین، فەرمانی دادوەریمان وەرگرت و بە خزمەتت

گەیشتین، بۆچی چەند جارێك پێشتر بەهەر بیانوویەك با لە ڕووبەڕوو بوونەوەمان خۆت گێل دەکرد؟! مەگەر هیچ گرفتێ هەیە لەوەی ئێمە نابێ تۆ ببینین و ئاگاداربین لێت؟))

ڕەسول کە جەستەی هاتبووە لەرزین بەپەلە هەوڵی دەدا ڕازیم بکات کە وازی لێبێنم،بەڵام من بۆ سەر مەسەلە سەرەکیەکەم چووم و گووتم: ((بزانە کاك ڕەسول! لەبەرئەوە ئێمە بەدووای تۆداهاتووین کە لەبارەی مەرگی مالکی برازاتان چەند پرسیارێکتان لێبکەین، بەئەرك نەبێ ئامادەبن تا بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس لەگەڵمان وەرن)) ڕەسول ڕەنگی پێنەماو بە قورسی تفێکی قووتدایەوە، ئەم سیما تێکچوونە لەناکاوەی نەیتوانی خۆی لە چاوی تیژبینم بشارێتەوە، ڕەسول لە پرسینەوە جۆراوجۆرەکان چەندین جار سوێندی خوارد کە هیچ شتێ لە مەرگی مالك نازانێ و ئێستاش بەهۆی مردنی بەئازاری برازاکەی لە حاڵەتێکی ڕۆحی گونجاودا نیە، بەڵام کاتێ بە بەڵگەی زیندووەوە دەست تێدابوونیمان لە ڕووداوی مەرگی مالك بۆ سەلماند، بۆ ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بوو کەوتە بیرکردنەوەی قووڵەوە، پێدەچوو بیر لەو ساتە تاڵ و سەختانەی گیاندانی مالك بکاتەوە، بەڵام دووایی زاری بۆ دانپیانان هەڵێنا: ((مالك پەیوەندی لەگەڵ مهینی کچم هەبوو زۆر پێداگری لەسەر خواستنی دەکرد،بەڵام من لەبەر چەند هۆیەك ناکۆك بووم لەگەڵیان: یەکەمیان ئەوەبوو مالك ئیش و کارێکی وەهای نەبوو بەو جۆرەی کە خۆیی و باوکی دەیانگووت تەنانەت سەرمایەی تەواوی بۆ دەستپێکی ژیانێکی سەربەخۆش نەبوو، ئەی باشە چۆن دەتوانێ بە شاگردانەیەکی کەم سکی ژن ومنداڵی تێر بکات؟! دووەم خاوەنی بڕوانامەیەکی بەرز نەبوو تەنها تا پۆلی دووەمی سەرەتایی ئەویش بە هەڕەشە توندەکانی باوکی وانەی دەخوێند و دووایی وازی لە قوتابخانەش هێنابوو، لە کاتێکدا مهین لە بەشی ئاودێری زانکۆ دەیخوێندو بەم زووانە بڕوانامەی بەکالۆریۆس وەردەگرێت، بۆیە من ئامادەنەبووم شوو بە کەسێك بکات کە لە هەموو ڕوویەکەوە لەخۆی نزمتربێ! منیش وەك هەر باوکێکی

دیکە خۆشبەختی کچەکەمم دەویست! ئێستاش مهین هیچ پەیوەندییەکی بە مالکەوە نەماوە))

لێم پرسی: ((جا دەبێ بۆ خۆشبەختی کچت برازاکەت بکوژی؟ نەتدەتوانی بە زمانێکی شیرینەوە حاڵیبکەی کە ئەوو کچەکەت بە کەڵکی یەکتر نایەن و ڕازییکەی واز لەم مەسەلەیە بێنیّ؟ )) ڕەسول بە داماویەوە سەری بادا: ((پێمگووت جەنابی ئەفسەر، زۆریشم پێگووت! هەر لەو ڕۆژەی کە مالك لەگەڵ خانەوادەکەی بۆ خوازبێنی مهین هاتن چەندین جار ناڕەزایی خۆم بۆ ئەم هاوسەرگیریە دەربڕی و گووتم ئەم مەسەلەیە لە بەرژەوەندی هیچ لایەکتان نیە، بەلأم نە خۆی وە نە خانەوادەکەشی ڕازیبوون، جەنابی برا گەورەکەم کە چەند ساڵێك لە من و خوشك و براکانی دیکەم گەورەتربوو بەڵگەی ئەوەی دەهێنایەوە کە هەموو کەسێك لە سەرەتای ژیانیان تووشی کۆسپ و تەگەرە دەبێ بەلأم دوویی هەموویان وەلا دەنێن و خۆشی بە ژیانیان دەدەن، لە لایەکی دیکەوە بەڵێنی کچە مام وکوڕە مام بە ئاسمانەکانەوە بەسراوە و لەم قسانە! بەلأم نە پێداگری مالك و نە قسەکانی کاکم و نە ناوبژیکارانی دیکەی خزمان نەیانتوانی بۆچوونەکەم پیّ بگۆڕن، ڕەنگە هەر ئەم سەرسەختیەش بووبیّ کە ڕقی مالکی هەستاندو بۆ ڕازیکردنم لە ڕێگای دیکەوە بۆ ناو بابەتەکە هاتەوە، کات و ساتی بۆ نەبوو هەموو دەم ڕێگای پێدەگرتم و سووربوو لەسەر قسەی خۆی، منیش هەموو جار لە خۆمم دووردەخستەوە، وە دووایی لە زمانی مهین بیستم کە ئەویشی بێزار کردووەو چەندین جار بۆ سەر ڕێگای زانکۆی چووەو خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕیوە، ئەمانەش بوونە هۆی شەرمەزاری و خەجاڵەتی کچەکەم لەلای هاوپۆلەکانی، کارەکە وایلێهاتبوو کە هەموو خەڵکی گەڕەك و دۆست و بێگانە لە مەسەلەی عەشقی مالك بۆ کچەکەم ئاگاداربوون تەنانەت ئەویان بە دەزگیرانیشی دەزانی، بینیم ئەگەر کار وا بڕوا ئەو کاتە ناچارم لە ژێر فشاری دەوروبەرو قسەکانی خەڵکی ڕازی بم کچەکەمی بدەمیّ و بە دەستی خۆم کچەکەم بەدبەخت بکەم، هەر بۆیە ڕاوێژم لەگەڵ دۆستێکی هاوکارم بە ناوی ((کامەران)) کردو بڕیاربوو سەرەتا بە قسەی خۆش مالك لەو بڕیارەی پاشگەز بکەینەوە ئەگەر هەر سوور بوو ئەوا هەڕەشەی بە مەرگ لێدەکەین، من سەردەمێك لەو گەنجانە بووم کە پێشینەیەکم

لە شەڕانگێزی و چەقۆکێشی لەنێو گەڕەکدا هەبوو دەمزانی ئەم کارە کاریگەری ڕاستەوخۆی دەبێ، پەیوەندیم بە مالیکەوە کردو کاتی دیدارم لە یەکێ لەو باغانەی کە پەیوەست بە باوکی کامەران بوو لە دووری شار دانا و داوام لە کامەران و یەکێ لە هاوڕێیانیشی بە ناوی ((ئەتابك)) کرد کە بۆ شوێنی دیاریکراو ڕێنمایی بکەن، کاتێ مالك هات بە ڕاستی و دوور لە گاڵتەوە بەپێی ڕەوشتی ئەو خزمایەتیەی لە نێوانمانە داوام لێکرد دەست لە من و کچەکەم هەڵبگرێ و بەدووای چارەنوسی ژیانی خۆیدا بڕوات، بەڵام ئەو هەر پێداگری لە مەسەلەکە کرد و ڕایگەیاند تا بە مهین نەگات یەخەم بەرنادات، هەرچی من دەمگووت بۆ ئەوە بوو کە چارەسەری گرفتەکە بکات، کاتێ بینیم قسەی خۆش چارەی دەردی من ناکات بە تورەییەوە چەقۆم دەرێناو هەڕەشەم لێکرد، کەچی ئەو تەنها پێکەنی و بە گاڵتەوە گووتی: ئەگەر دەوێری لێمدە و بمکوژە! چونکە تاکو زیندوو بم عەشقی مهین لە دڵما دەمێنێ و بۆ گەیشتن بەو هەرچی لە دەستم بێ دەیکەم، تەنانەت ئەوەش لەوانەیە بکەم بۆ گەیشتن بەو چەقۆشت لێبدەم،،،ئەوەی ڕاستی بێ قسەکانی مالك بە تەواوی وروژاندمی، تا دەهات تورەیی و ڕق و نیگەرانیم پتر دەبوو ئەمەش وایدەکرد زیاتر هەست بە لاوازی و بێ دەسەڵاتی خۆم بکەم، ڕەنگە بڕوانەکەن ئەگەر بڵێم خۆشم نازانم چۆن دەسەویەخەی بووم، لەپڕ دنیام لەبەر چاو تاریك بوو بە هاوارێکی بەرزەوە چەقۆکەم تا دەسکەکەی بۆ نێو قووڵایی دڵی بردو تێیدا خولاندمەوە، دەنگی ناڵەی بە سوێی مالك بەرزبۆوە، هەناسەی نەماو کاسە چاوی لەبەر فوارەی خوێن دەرپەڕیبوو دەست و جلەکانمی سوور کرد، بەڵام من حاڵەتی ئاسایی خۆم لە دەستدابوو سروشتی دڕندانەم بێداربېۆوە، تەنانەت هاوارەکانی (کامەران و ئەتابك) یش کە دەیانەویست ڕێ لەم کارە دڵتەزێنە بگرن،نەیتوانی کارم تێبکات، هاوارم دەکرد: بڕۆ بمرە! ون بە! لەگەڵ هەر هاوارێك چەقۆکەم قایمتر لە پێشوو لە جەستەی دەدا، کامەران و ئەتابك بە هەزار زەحمەتی منیان لە مالك جوداکردەوە، لەپڕ چاوم لە دیمەنی بەرامبەرم بڕی، مالك لە شەپۆلی خوێن لینگە ژەنەی دەکرد و دوواهەمین هەناسەکانی هەڵدەکێشا، چەقۆی خوێناویم هێشتاکە بە دەستەوە بوو، قاقای شێتیم لێدەداو بەسەر مالك دا هاوارم دەکرد: ها ئێستا دەڵێی؟! دیسان هەر دەتەوێ مهین بخوازی؟! مالك

هەموو هەوڵی خۆی کۆکردەوە تا سەری بۆ لام سوڕاند، لە یەك ساتدا نیگام بەر نیگای کەوت کە بۆنی مەرگی دەدا، نازانم لە قووڵایی چاوانی سوورو فرمێسکاوی چی بوو کە دڵمی لەرزاند،لێوە شەقبووەکانی گرمۆڵە بوون و لەرزین، بەبێدەنگ ناوی مهینی دێنا و دەمی دەجوڵاوە، دووایی لە کاتێکدا کە هێشتا پێکانی نیگای ڕوو لە من بوو، هەناسەی بۆ هەتایە نەماو چاوانی لە خاڵێکی نادیار بڕی و منیش چەقۆی دوو دەمم لە جێگایەك داناو پلانی دووایيم جێبەجێ کرد، هێشتاش باوەڕم نەدەکرد بەدەستی خۆم برازاکەم بەم ڕۆژە بگەیەنم، (کامەران و ئەتابك) یش ترسابوون و سەرزەنشتی منیان بەهۆی تێوەگلانم لەم کارە دڵتەزێنە دەکرد، بەلام کامەران عەقڵی لە من و ئەتابك باشتر کاریدەکرد، پێشنیاری کرد بۆ ونکردنی تاوانەکە سەرەتا تەرمەکە بسووتێنین و پاشان بۆ جێگایەکی نەزانراو بیگوێزینەوە تا کەس هەست بەم ڕووداوە نەکات، (ئەتابك) یش بێ ئەوەی بیەوێ هاوبەشی تاوانی من بوو،بەپەلە دەست بەکاربوو، لەتەواوی ئەو ماوەیەی کە بە هاوکاری ئەوان پاشماوەی تاوانەکەم پاك دەکردەوە و لە حاڵەتی سووتانی تەرمی مالك ڕامابووم، لەو خەیاڵەدابووم بە چ شێوەیەك وەڵامی براکەم و خانەوادەکەی بدەمەوە، جەنابی ئەفسەر! باوەڕبکەن بە دەست خۆم نەبوو، لەو بڕیارەمان هەرگیز بە نیازی کوشتنی کەسێ نەبووین،بەلام مالك خۆی سەری خۆی خوارد،ئێستاش داواتان لێدەکەم مەسەلەی دەست تێدابوونی من لە کوشتنی مالك با براکەم نەزانێ، چونکە تا کۆتایی تەمەن لەبەردەمی کاکم شەرمەزارم)) بەلام بەداخەوە کە هەتاو هەرگیز لەپشت هەور نامێنێتەوە و براکەم زۆر زوو بکوژی ڕۆڵەکەی دەناسێت، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشاو لە ژووری لێ پێچینەوە هاتمە دەر، لەکاتێ کە چاوم لە ئاسۆ دوورە دەستەکانی ئاسمانی شینی بێ کۆتایی بڕیبوو، بیرم کردەوە: (( شەیتان چەند ئاسان بۆ نێچرەکانی داو دەنێتەوە، خۆش بە حاڵی کەسێ کە چاوی بینایی هەبێ و نەبێتە دیلی!))

# عەشقی مینو

دەنگی هات و هاوارە گڕو بەردەوامەکانی کابرا لەگەڵ ناڵە تێکەڵ بە پاڕانەوەکانی ژنێك کە جار هەبوو بە هۆی هێرشی پیاوەکە قیژەیەکی کەمی لێدەدا و ئاوێتەی گریانی بەسوێی منداڵە کوڕە چوار ساڵیەکەی دەبوو لە بەیانی ئەو جومعە هاوینی یە کە تەمەڵی دەکردی خەڵکی گەڕەك لەخەوی خۆشی سپێدە بوون، دەنگی دەدایەوەو سەرنجی ڕێبوارانی ڕادەکێشا، ((مینو)) ژنێکی گەنجی بیست و حەوت ساڵەبوو لە کاتێکدا هەوڵی دەدا لە ژێر پەلامارە یەك لە دووای یەکەکانی مێردە بیست و حەوت ساڵەکەی ڕابکات، بۆ لای کوڕەکەی غاریدا و لە باوەشی کردو هاواریکرد: ((بەخوا هیچ پارەی دیکەم لە ماڵدا نیە فرشاد، هەرچی هەبوو دوێنێ پێمدای تا قوزەڵقورتی پێ بکڕی، دەست لە من و ئەم منداڵە بێ گوناهە هەڵگرە!))

((فرشاد)) دەستە ڕەق و تەقەکانی بە چوارچێوەی دەرگاوە گرت و بە زەحمەتەوە گووتی: ((بەڵێ گیانەکەم من دەزانم تۆ چ مارمێلکەیەکی و چەندەت پارە هەیە!))

فرشاد ئیدی نەیتوانی بەردەوام بێ، جەستەی لەرزۆکی کەوتە داهێزران و دەستەکانی لە دەوری لەشی کردە ئەڵقەو خۆی هەڵگلۆفی، بە دیتنی کەوتنی فرشاد تا ئاستێك خەیاڵی ئاسوودەبوو، هەستیکرد لێوی ژێرەوەی دەسووتێت، تازە سەرنجی گەرمی خوێنی لە سووچێکی دەمی دەدا، بە قۆڵی کراسەکەی خوێنەکەی سڕیەوەو دەستی لەسەر قڵیشاوی لێوی دانا، لەپڕ سەرنجی کوڕە بچووکەکەی داو گووتی: ((چیە ئازیزم، هەرگیز نیگەران مەبە، من حاڵم باشە، باوکت نەخۆشەو پێویستە پشوویدات، ئەوەندە مەگریە ئازیزی دڵم))

((ئەمیر)) گووتی: ((ئاخر دایە،،،،بابە ش،،،،پارەی لە تۆ دەوێ،،،،تا بڕوات،،،،بۆ لای مامە جەلال و،،،،قوزەڵقورتی لێبکڕێ،،،،باشە بۆچی،،،،دیسان لە من و تۆ،،،،دەدا،،،،بەسەرمان هاواردەکات،،،،من دەترسم،،،،))

دەنگی گریانی ئەمیر توندتر بوو،ڕقێکی گەورە چەنگی لە قورگی مینو گیر کردبوو،بە ئارامیەوە شکست و فرمێسك دەموچاویان تەڕکرد، ئەمیری بچکۆلە هەوڵیدا بە دەستانی بچووکی پێش بە لافاوی فرمێسکەکانی دایکی بگرێت: ((دایە،،،توخوا مەگریە،،،ئەگینا منیش دووبارە دەگریەمەوە !)) مینو بە زەحمەت پێکەنینێکی تێکەڵ بە گریانی بۆ ڕۆڵەکەی کردو دەستە بچووکەکانی گرت و ماچیکردن، هەر لەو ساتەدا دەنگی ناڵەی فرشاد سەرنجی دایك و کوڕی ڕاکێشا:

(( مینو توخوا تو گۆڕی باوکت فریامکەوە، خەریکە دەمرم، پارەیەکم بدەیە تا بڕۆم و ون بم، با منداڵەکەمان بەم زووییە هەتیونەبێ)) مینو لە کاتێکدا هەوڵی دەدا بەزەیی بەم حاڵەی مێردەکەی دا نەیەتەوەو نەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو، گووتی: ((بۆچی پارەی شتەکانت لە من دەوێ بڕۆ هەر لەو جەلال و هاوڕێ ناپیاوانەت وەربگرە کە تۆیان خستە ئەو ڕۆژەوە))

فرشاد دووا هاواری بەرزی بەسەریدا کرد: (( ون بە ! خۆت ئەمە باش دەزانی کە ئەوان ئەم شتانە بە قەرز نادەن، بەڵام قەیناکا دەڕۆم لە خۆیان وەردەگرم، فرشاد هەر بەوجۆرەی کە دەیناڵاند و تلی دەدا، کەوتە کۆکە و خیزە خیز))

ئەمیری بچکۆلە بە ترس و لەرزەوە دایکی ڕاتەکاند: ((دایە،،،بابە ببینە،،،گوتی خەریکە دەمرم، دایە بۆ لای دکتۆری ببە با نەمرێ)) مینو بە هێمنی فرمێسکەکانی سڕیەوە و دەستی کوڕەکەی گرت و لە کاتێ کە بۆ چێشتخانەی دەبرد بە میهرەبانیەوە گووتی: ((نا ئازیزم، هەرگیز نیگەران مەبە، باوکت بەقەستی وادەکات تاکو بەزەییمان پێیدا بێتەوە، ئێستا خۆی باش دەبێ، جارێ تۆ وەرە لێرە دانیشە تا پارووە نان و پەنیرێکت بۆ بکەم)) ئەمیر خەریکی خواردن بوو مینوش بە بێزاریەوە لە چێشتخانەکە چووەدەرەوە، هەموو جێگایەکی بە دووای فرشاد بەچاو بەسەرکردەوە، بەڵام هیچ دیار نەبوو، خێرا بۆ لای ئەو پەنجەرەیە ڕۆییشت کە بەسەر کۆڵاندا دەیڕوانی و تەماشای دەرەوەی کرد، فرشادی دیت بە نەعل و هەمان جلی چڵکنی ماڵ و سەروچاوی شێواو دەستی بە دیوارەوە گرتووەو بە قورسی هەنگاو دەنێ بۆ لای ماڵی جەلال کە لە

سەری کۆڵان بوو دەڕۆیشت، بۆ ژووریٚ گەڕایەوەو لە زۆر هیلاکیان پشتی بە دیواردا و بە ئارامی دانیشت، ماندوویەتی لە ڕاددەبەدەر،بیٚ خەوییە یەك بە دووای یەکەکانی و خەیاڵاتی ئازاردەر خەوی لە چاوانی گەورەی هەڵگرتبوو ئێستا لەجێی چاوانی دوو کاسەی خوێن هەبوون، دەستی بە چوارچێوەیەکی شکاو کەوت کە لەولاوەتر کەوتبوو، وێنەیەکی لەنێوان وردە شووشەکان هەڵگرتەوەو لەبەردەمی خۆی ڕاگرت، کچێکی گەنج و دڵشاد بە جلی سپی بوکێنی یەوە هیچی لە فریشتەی خەونەکان کەمتر نەبوو ڕوخساری پاکی لە ژێر ڕووپۆشی ڕەنگاوڕەنگ ئێجگار جوان بوو، لەسەر قەنەفەیەك دانیشتبوو پیاوێکی گەنج لە نیگاو سیمایەکی سەرنج ڕاکێش و پیاوانە شەپۆلی دەدا، بە کراسێکی سپی و چاکەت و پانتۆڵێکی شینێکی ئامالّ ڕەش کە گیرفانەکەی بە گوڵی سووری گەورە نەخشێنرابوو، لە پشت سەریەوە وەستابوو، ئاه ئەو ڕۆژانە عەشقی مینو و فرشاد قسەو وێردی ناو خێزان بوو، نەیزانی چەند کاتژمێرێك بەم شێوەیە تێپەڕی لەپڕ دەنگی هاوارەکانی فرشاد پڕ بە ماڵەکە دەنگی دایەوە و مینو لەجێی خۆی ڕاچڵەکی و لە هاتنە ژوورەوەی ناکاوی فرشاد زراوی چوو، ئەمیری بچکۆلە بەپەلە بۆ لای دایکی ڕایکردو خۆی لە پشتەوەی شاردەوە، لەپڕ فرشاد هاواری کرد: ((هەر ئێستاکە یان ئەو ئاڵتونەی بە گەردنتەوەیە پێمدەدەی یا بە گیانی منداڵەکەمان دەتکوژم)) مینو بە بیستنی ئەم هەڕەشەیە ترسا،خێرا دەستی لەسەر ملوانکەکەی داناو بە زەحمەتەوە گووتی: ((چیە فرشاد وەها خۆت لێمان شێت کردووە، چۆن هەر وا لە گۆترە سوێند بە گیانی ئەمیر دەخۆی؟ ئەم ملوانکەیە یادگاری باوکی خوالێخۆشبوومە! دەتەویٚ چیبکەی؟)) هێشتا قسەکانی مینو تەواو نەببوون کە فرشاد بە توڕەییەوە پێی بڕی: ((من سەرخۆشم و لەم قسانە تێناگەم، زووبە و بمدەیە!)) پاشان هێرشی بۆ لای مینو برد، مینو باشترین ڕێگای دەربازبوونی لە ڕاکردندا بینیەوە،بەڵام تا بەخۆکەوت،بووە نیشانەی مشتەکۆڵەو شەقەکانی مێردەکەی، ئەمیر کە بە توندی بەر دیوار کەوتبوو، دەگریا، لە ساتێکدا مینو خۆی لە ژێر دەستی ڕزگارکردو بەپەلە بۆ لای چێشتخانە ڕایکرد، بەڵام هێشتاکە بەویٚ

نەگەیشتبوو کە فرشاد لە پشتەوە دەستی لە قژی گیرکردو فرێی دا سەر زەوی؛ مینو لەتاو ئازار فرمێسکی هاتە خوار و قیژاندی: (( وازم لێبێنە بێ ویژدان! ئەگەر بشمرم ئەمەت پێنادەم))

ئەم وەڵامەی مینو ئاگری تورەیی فرشادی پتر کرد، لەپڕ بریسکەی گوڵدانی کریستاڵی سەر مێزی چێشتخانەی بەرچاوکەوت و بیرۆکەیەکی شەیتانی بە مێشکیدا هات، بەپەلە بۆ لای گوڵدانەکە چوو ئینجا هەڵیگرت و بەتەواوی هێزییەوە بەسەری مینوی دا کێشا، گوڵدان بوو بە چەند پارچەیەك و هاواری بە سوێی مینو لەناو ماڵەکە دەنگی دایەوە، فوارەی خوێن بەسەروچاوی دا هاتە خوارو ئەم ناوەی سوور کرد، ئیدی مینو بە زەحمەت دەجوڵایەوە، بەڵام فرشاد کە لە هیچ شتێ حاڵی نەبوو، بۆیە چەکوشێکی ئاسنینی لەلای بەفرگرەکە هەڵگرت و یەك بە دووای یەك بەسەری مینوی دا دەکێشاو هێزو تواناى لێبڕی، مینوی نیوە گیان لە ژێر پەردەی خوێن کە پێش چاوانی گرتبوو تیلە چاوێکی لە فرشاد ئینجا لە کوڕە بچوکەکەی کرد  کە حەپەساوو تۆقیو لەبەردەرگای چێشتخانەکە تەماشای ئەم دیمەنەی دەکرد، پێکەنینێکی تاڵ و لێڵی بۆ کردو کەوتە سەر زەوی و بۆ هەمیشە چاوانی لێکنا، فرشاد بێ ئەوەی گوێ بە هاوارەکانی کوڕەکەی بدات، ملوانکە زێڕەکەی کە بە خوێن سوور ببوو لە گەردنی مینو کردەوەو شوشتی و لە ماڵ چووە دەر، کاتێ بۆ ماڵ گەڕایەوە، هاوسەرەکەی نوقمی خوێن و کوڕە بچووکەکەشی هەروا بە گریانەوە بە پشت سەری دایکیەوە دیت، لەپڕ زۆر بەسەیری ڕاچڵەکی، لە دووای ئاشکرابوون کابرای گەنج خۆی بە فرشاد - ج دەناساندو لەسەر نەمانی هاوسەرەکەی بە ناوی مینو و نیشانەکانی باڵایەکی مام ناوەندی و لاواز، تیمێك لە کارمەندانی سوپا بەرەو مەسەلەکە چوون، ئەنجامی لێکۆڵینەوە بەراییەکان پیشانیاندا کە ناوبراو هەموو ڕۆژ ناکۆکی لەگەڵ هاوسەرەکەی هەبووە، بابەتی سەرەکی ئەم ناکۆکی و ناسازییەش هۆگربوونی فرشاد بووە بە هەموو ماددەیەکی بێهۆشکەر، نزیکەی دوو هەفتە پاش ڕاگەیاندنی ئەم نیشانانە بە مەڵبەند و بنکەکان، هیچ سەرە داوو پاشماوەیەك لە مینو

بەدەست نەهات، لە پشکنینیماڵەکەی فرشاد کە لەسەر شێوازی کۆن و ژوورەکان گومبەتی بوون هیچ شتێکی جێی گومان بەرچاو نەدەکەوت و واپێدەچوو لە کەل و پەل خالّی بیّ،کاتیّ هۆکاری ئەم چۆڵیەیان لە فرشاد پرسی، بە رقەوە گووتی لەبەر هۆگربوونم بە تلیاك ناچار بە فرۆشتن و مامەڵەکردن بە کاڵاکانی ماڵەوە بووم بۆ ئەوەی ماددەی بێهۆشکەری پیّ دابین بکەم، لەکاتی دووبارە پشکنینەوەی ماڵەکەیان یەکیّ لە ژنەکانی دراوسێیان لەگەڵ کوڕێکی منداڵی سیّ چوار ساڵان هاتە ژوورو بە نیگەرانیەوە پێی گووتم: ((جەنابی ئەفسەر، لەو ڕۆژەی کە دایکی ئەم منداڵە نەماوە (مینو خانم)، باوکی ئەوەی بەمن سپاردووە، شەوان خەوی نیەو هەر مێردەزمە دەبینیّ و لە خەو ڕادەپەڕیّ و بانگی دایکی دەکات، هەتا چەند جارێکیش پێمی گووتوە دایکم لە ئەنباری ماڵەکەمانە، ئەمڕۆش ئەوەندە گریاوە و دایکی بانگ کردووە ناچاربووم بۆ لای جەنابتانی بهێنم))

نیگایەکم بە کوڕیژگەکە داگێڕا، منداڵێکی لەڕولاواز کە لە قووڵایی چاوانی ڕەشی غەمێکی گەورە خۆی حەشاردابوو، ڕووبەڕووی دانیشتم و بە میهرەبانیەوە لێم پرسی: ((کوڕم ناوت چیە؟))

کوڕیژگەش لە ڕوخسارم ڕامابوو بە تورەییەوە گووتی: ((ئەمیر)) بە پێکەنینێکی ساختەوە گووتم: ((ئەمیر گیان دەزانی دایکت لە کوێیە؟)) ئەمیر سەری وەك نیشانەیەکی ڕازیبوون ڕاوەشاند، بە سەرسامیەوە درێژەم بە قسەکانمدا: ((باشە دەی دایکت لە کوێیە؟)) ئەمیر بەدەست ئاماژەیەکی بۆ ئەنباری ماڵەکەیان کردو بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گووتی: (( دایکم لێرەدایە! باوکم دایکمی لەویّ داناوە))

بیّ باوەڕانە چاوێکم لە کارمەندانی هاوڕێم کرد، ئەمیر خێرا کەوتە گریان و بۆ لای ڕایکرد و هاواری کرد: (( دایە،،،،دایە! )) ئینجا خۆی لەو خاك و خۆڵە گەوزاند، بیّ خۆدوواخستن فەرمانم بە کارمەندان دا ئەو بەشە هەڵکەنن، هەرچەندی خاکەکەمان زیاتر هەڵدەکەند، گریانی دڵتەزێنی ئەمیر پتر دەبوو سەرەنجام ئەوەم بینی کە باوەڕم نەدەکرد، تەرمیّ نوقمی خوێن و خۆڵی ژنێکی گەنج بە جلە

خوێناوییەکانیەوە لە ژێر قورسایی خاك ئارامی گرتبوو،هەر کە ئەمیر چاوی بە تەرمەکە کەوت، خۆی پێدادا و وەکو هەوری بەهار فرمێسکی دەڕشت، تەرمەکەمان لە ماڵ دەرێناو بۆ پزیشکی یاساییمان گواستەوە، منداڵەکەمان بەگریانەوە بۆ خانەوادەی مینو نارد و بێ وەستان فرشادمان لە ماڵی یەکێ لە هاوڕێیانی کە خەریکی کێشانی هیرۆیین بوو دەسگیرکرد، کاتێ لەگەڵ فرشاد لە ژووری لێکۆڵینەوە ڕووبەڕوو بوومەوە بە تووڕەییەوە لێم پرسی: ((بۆچی ئەم کارەت کرد، ئەو دایکی منداڵەکەت و هاوبەشی ژیانت بوو،چۆن دڵت هات؟))

فرشاد هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو چاوی لە خاڵێکی نادیار بڕی و بە دەنگێکی لاوازەوە دەتگووت لە ژێر چاڵەوە قسەدەکات، دەستی پێکرد: ((خۆشم نازانم چیمکردووە، تەنها کاتێ ملوانکەی مینوم برد و بە جەلالم دا و لەبری ئەوە بڕێکی زۆرم ماددەی بێهۆشکەر وەرگرت و بەکارمهێنا ئینجا بۆ ماڵێ گەڕامەوە، ڕوخساری بێ گوناهـ و پڕ لە فرمێسکی ئەمیرم دیت لە تەنیشت تەرمی دایکیەوە دانیشتبوو نەدەجوولا، ئەوسا تێگەیشتم چیمکردووە، بەلام کاتی بیرکردنەوە نەبوو، یەکەمین شت کە بە مێشکی ئالۆزم دا هات، شاردنەوەی تەرمی مینو بوو لەنێو ماڵەکە، باشترین جێگاش ناو ئەنبار بوو، زوو دەست بەکاربووم و لەپێشچاوانی فرمێسکاوی ئەمیر تەرمەکەم شاردەوە، وای کە کوڕەکەم چیدەکرد، چەند بەسۆز بانگی دایکی دەکرد، وای کە من چەندە بێ بەزەیی بووم و چەندەم مشتەکۆڵە بەسەروچاوی دا کێشا و هەڕەشەم لێکرد تا هیچ شتێ بە کەس نەڵێ، باوەڕبکەن ساڵانی ڕابردوو من عاشقی مینو بووم، عەشقی مینو ژیانی پێدەبەخشیم، بەداخەوە کە هاموشۆی هاوڕێیانی خراپ و خووگرتوو بە ماددەی بێهۆشکەرم کرد و تەواوی ژیان و بوونم فەوتا، هەرگیز بیرم نەدەکردەوە بۆ مەست بوونم کوشتن ئەنجام بدەم و لە پێش چاوانی ترساوی پارچەی جگەرم هاوسەرم بشارمەوە، فرشاد هاواریدەکرد نەفرەت لە تلیاك، لە سێدارەم بدەن تا هەموو بزانن سزای بکوژی دڵڕەق وەکو من مەرگە،فرمێسکەکانی هاتنە خوار))

دۆسیەی تەواوی فرشاد بە پێی داخوازی یاسایی و داوەری بۆ زیندان دەبێ تا لە پشت شیشە ئاسنینەکانی زیندانەوە چاوەڕوانی سزای خۆی بێت!!

# بكوژان دەگريەن

((بەهرۆز)) ی سی و پێنج ساڵە، جارێکی دیکەش ئەو نەخشەیە کە لە خەیاڵی خۆی کێشابووی تێپەڕی، کاتێ یادی ((راحلە)) ی هەمیشە دەم بە پێکەنین و کورسی یە ڕەوڕەوەدارەکەی کە ساڵانێك هاودەم و بەشێ لە ژیانی بوو، کەوتەوە بیر، گیانی لەرزی و نێوچەوانی پڕ چرچ و لۆچی ئارەقی شەرمیان دەردا و لەبەر خۆیەوە گووتی: ((ئاخر بڵێ کابرا! ئەم ژنە کەم ئەندام و پەککەوتەیە چ خراپەیەکی لەگەڵ تۆ کردووە کە وەها دەتەوێ بەڵایەکی بەسەردا بێنی؟ جگە لەوەی لە ڕۆژی یەکەمەوە کە پێت لە ماڵەوەی دانا، وەکو خوشك و مرۆڤێکی میهرەبان ڕەفتاری لەگەڵ تۆ کردووە هەتا ئامادەبوو لەو خۆراکەی کە ئەوو پەرویزی برا بچووکەکەی دەیانخوارد، پێت بدات، واتە تۆ بەم ئەندازەیە بێ بەزەیی و سۆز بووی ڕێزی نان و نمەکیشیت لەیادچۆوە، ماڵی دنیا دیارە ئەوەندە مرۆڤ کەڕ و کوێر دەکات تەنانەت خۆشەویستی بێ سنوری مرۆڤەکانیش نەبینێ و بۆ گەیشتن بەچەند پارچە ئاڵتوونێك دەست لە هەموو کارێ دەدات، پەرویزی برای راحلە کارێکی چاکی نەکرد کە متمانەی بە تۆ کردو وەکو کرێچی نوێ قبوڵی کردیت تەنانەت کەمێ لە کەل و پەلی ماڵەکەشیانی پێدای تا باشتر بژیت، هێشتا دوو مانگ نابێ کە بۆ ئەم ماڵە هاتوویی و خۆشت بە چاوی خۆت بینیت لەم ماوە کەمەیەدا ئەم خوشك و برایە چەندەیان خۆشەویستی بۆت هەبووە، لەبەرچی پلانێکی وەها شوومت هەیە؟ بۆچی بیر لە تاوان دەکەیتەوە؟))

بەڵام هێشتا ئەم خەیاڵە دروستانە مێشکی ئەویان سەرقاڵ نەکردبوو کە دووبارە شەیتان لە بن گوێی هەڵخوێندەوە: ((مەگەر نەبوونی مەستی و کێشانی ماددەی بیهۆشکەر و بێکاری و بێ پولی سۆزو بەزەیی دەناسن؟! گوناهی تۆ چیە کە پەرویزو خوشکەکەی تۆ بە برای خۆیان دەزانن و متمانەیان پێت هەیە، تۆ بە سکی برسی و گیرفانی خاڵیەوە بۆ بەدبەختیش هۆگری ماددەی بێهۆشکەر بوویی، دەبێ لە بیری پارەدابیت تا زیاتر لەم دۆخە نەمێنیەوە،تێدەگەی؟ ئینجا تا درەنگ نەبووە دەست بەکار بە! ئێستا باشترین دەرفەتە، دەتگووت شەیتان بە

دیارییەوە وەستاوەو دەڵێت: هەستە بەهرۆز دووایی پارووی چەور لە دەست دەدەیت و حەسرەت هەڵدەکێشی!))

بەهرۆز لە کاتێکدا بیرو خەیاڵاتی ناکۆك و هەمەجۆر کە هێرشیان بۆ مێشکی هێنابوو بێزارو پەست ببوو،هەستایە سەرپێ و بە پانایی ژوورەکە دەهات و دەچوو، نزیك نیوەڕۆی هاوین بوو گەرمای پروکێن جەستەی مرۆڤیان شەلاڵ لە ئارەق دەکرد، بەهرۆز دەیزانی کە تا یەك دوو کاتژمێری دیکەش پەرویز نایەتەوە و ئەم ماوەیەش باشترین دەرفەت بوو بۆی تا پلانەکەی جێبەجێ بکات، خەیاڵی ماندووی بۆ چەند مانگێکی پێشوو گەڕایەوە: ئەو بۆ دۆزینەوەی خانوویەکی گونجاو کە تەنها ژوورێکی خنجیلانەی هەبێ بۆ نوسینگەی سەر شەقامی پەرویز ڕۆیشتبوو، وە بەهۆی نەبوونی پارەی تەواوەوە نوقمی بیرو خەیاڵاتی ئازاردەر بوو،سەرنجی پەرویزی دا کە لەگەڵ خاوەنی نوسینگەکە قسەی دەکرد، ئەوەندە لە قسەکانی پەرویز حاڵی بوو، کە ئەو لەگەڵ راحلەی خوشکی پەککەوتەی زۆر ئازار دەچێژێ دەیەوێ نهۆمی هاوئاستی ماڵەکەیان بێ وەرگرتنی پارەی پێشەکی، بە مرۆڤێکی بەڕێزو جێ متمانە بەکرێ بدات، بەهرۆزیش کە لەم دەرفەتە باشتری دەسنەدەکەوت و لەگەڵ پەرویز کەوتە گفتوگۆو ئەوەندە باسی خۆی کرد و لە دەست گرفتەکانی دنیا دەیناڵاند، سەرەنجام سەرنجی پەرویزی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و ئەویش ڕازی بوو بۆ بەکرێدانەکەی، هەڵبەتە بەهرۆز لە بارەی هۆگربوونی بە ماددەی بێهۆشکەر و پێشتر زیندانیبوونی شتێکی بە پەرویز نەگووتبوو،تەنها ئەوەی پێگووتبوو کە کرێکاری کۆمپانیایەکی خزمەتگوزارییە و ژن و منداڵیشی لە شارەکەری دراوسێیان ژیان بەسەر دەبەن و دەیەوێ بە زووترین کات بۆ ماڵی تازەی بەکرێگرتوویان بهێنێ، بە زمان لوسیەوە توانی دڵی میهرەبانی پەرویز نەرم بکات و ژوورێ لە ماڵەکەیان بەکرێ بگرێت، بەلام هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە خشڵ و ئاڵتوونی راحلە سەرنجی بەهرۆزیان ڕاکێشا، لەگەڵ ئەوەش هەوڵی دەدا کە نەبێتە کۆیلە بەدەست سۆزو میهرەبانیەکانی راحلە و وەسوەسە شەیتانیەکانی؛ بەلام بیرکردنەوە درێوەکانی وەها گوشاریان بۆ هێنا تا

دوواجار نەخشەی کوشتنی راحلەو دزینی زیڕەکانی لە مێشکی دا گەڵاڵە کردو ئێستا کاتی جێبەجێکردنی پلانەکەی بوو چونکە پەرویز لەماڵ نەبوو راحلەش بەتەنهابوو، بەهرۆز چیدیکە نەیتوانی بەرەو ڕووی شەیتان بووەستێتەوە، بە هێواشی قادرمەکانی بڕی و بە پشت دەرگای ژووری راحلە گەیشت، بۆنی خۆشی قاورمەی گۆشت بەسەوزەوە لە ڕاڕەوەکە بڵاوببۆوە و حەزی خواردنی بەهرۆزی دەوروژاند، وەختێ لە دەرگای دا دەیزانی راحلە زوو دەرگا دەکاتەوەو وەك هەمیشە فەرمووی بۆ ژوورەوە لێدەکات و خۆشەویستی خوشکانەی بۆ دەردەبڕێ، بەلأم چاوەڕوانیەکەی زۆری نەبرد و دەنگی راحلە لەپشت دەرگاوە هات: ((کێیە؟)) بەهرۆز بەپەلە وەلأمی دایەوە: ((بەهرۆزم خوشکێ گیان!)) دەرگا کرایەوەو ڕوخساری میهرەبانی راحلە کە غەمێکی قووڵ لە چاوە ڕەشەکانیدا شەپۆلیاندەدا، لە چوارچێوەی دەرگا بەدەرکەوت، راحلە بە دیتنی هەموو ڕۆژەی بەهرۆز ڕاهاتبوو، سلأوێکی شەرمنانەی کردو لە بەرامبەر دەرگا لاکەوت و بۆ ژوورەوە بانگی کردو هەستی راحلە وەك ئەوە بوو کە براکەی دەبینێ، بریسکەی سەرسامکەری ملوانکەی ئەڵماس و بازنە ئاڵتونیەکانی راحلە، دووبارە سەرنجی بەهرۆزیان ڕاکێشایەوەو بۆ ئەنجامدانی خێراتری پلانەکەی هەڵیانخڵەتاند، لە ساتێکی گونجاودا کە راحلە پشتی لەو بوو، بەهرۆز پەلاماریداو دەستە زبرو پانەکانی خۆی لەسەر دەم و لوتی راحلە بەتوندی دانا، ڕەنگ و ڕووی راحلە یەکەمجار زەرد ئینجا شین هەڵگەڕاو بێ باوەڕانە بە چاوانی دەرپەڕیویەوە لە بەهرۆز ڕامابوو، بەلأم تۆزقاڵێ سۆزو جوامێری لە بوونی ئەو مرۆڤە بێ ویژدان و نمەك بە حەرامە نەبینی، بەڵکو هەستی بە سێبەری شوومی مەرگ بەسەرخۆیەوە دەکرد، بێ ئومێدانە لینگەژەنەی دەکرد و بە هاوارە خنکاوەکانیەوە داوای کۆمەکی لە پەرویز دەکرد، بەلأم زۆری نەبرد کە دەست و پێ ئیفلیجەکانی راحلە لەسەر کورسیە بە ڕەوەڕەوەکەی شل بوون و هەناسەی گەرمی بۆ تاهەتایە نەماو دۆسیەی ژیانی لەم دنیا جەنجاڵەدا بە دووا وێستگە گەیشت، کاتێ خەیاڵی بەهرۆز لەبارەی مردنی راحلەوە ئاسوودەبوو، خێرا خشڵ و ئاڵتوونەکانی لێکردەوەو

بەپەلە ماڵەکەی بۆ دۆزینەوەی پارەو شتە گرانبەهاکانی دیکە بەسەر یەکداداو پشکنی، لەپاش چەند خولەکێك بە گیرفانی پڕەوە لە ماڵ ڕایکرد، لەپشت مێزی ئیش و کارم دانیشتبووم کە سەربازێك بۆ ژوورەوە هات و گووتی چەند ساتێ پێش ئێستا پیاوێك بە پەشۆکاوییەوە پەیوەندی پێوەکردووین و هەواڵی کوشتنی خوشکە پەککەوتەکەی پێ ڕاگەیاندووین و ناوونیشانی شوێنی ڕوودانی تاوانەکەی لەسەر مێزەکەم دانا، ئەوەی کە لە ماڵی پەرویز چاوەڕوانمان دەکرد، جەستەی بێ گیانی ژنێکی پەککەوتە بەناوی راحلە بوو  بە دیتنی لەسەر کورسیەکی ڕەوڕەوەدار هەستێکی ناشی لە خەیاڵی دڵڕەقی بکوژی بێ ویژدان دڵی زامدارکردین، لەم نێوانەدا پەرویز بەڕاستی لە حاڵێکی دڵتەزێن دا بوو لە بەینی فرمێسك و ئاه، بەهرۆزی کرێچی ماڵەکەیان وەکو گومانلێکراو باس دەکرد، ئینجا لە ڕاپۆرتی دیمەنی کوشتنەکە، بە بەڵگەی ئەوەی هیچ نیشانە و شتێکم بەرامبەر بەهرۆز نیە، بە هاوکاری پەرویز بۆ ئەو نوسینگەیە چووین کە بەڵێننامەی نێوان ئەوو بەهرۆزی تێدا مۆرکرابوو، کۆپیەکی کارتی کۆتایی خزمەتی بەهرۆزمان دۆزییەوە و سەرنجماندا کە بەهرۆز بۆ خاڵێکی نادیار هەڵاتووە، تەماشای کۆپی کارتی بەهرۆزمان کرد بۆ ئەوەی بزانین جێگا و ڕێگا و شوێنی کاری لە کوێیە، کەوتینە لێکۆڵینەوە هونەری یە ئاشکراو نادیارەکان، سەرەنجام دووای تێپەڕینی پانزە ڕۆژ بەهرۆزمان لە ماڵی یەکێ لە خزمانی لە گوندەکانی باشووری شار دەستگیر کردو بە برێك شت و مەکی دزراوەوە بەرەو ئاسایشمان برد، بەهرۆز لەبەرئەوەی لە کوشتنی راحلەی پەککەوتە وەك دووچاری گوشارێکی ڕۆحی ببوو بە قسەی خۆی لە کاتی ناپاکی گەورە، بیست ساڵ لەخۆی پیرتر دەردەکەوت، زۆر زوو دەمی بۆ دانپیانان کردەوە و بە هاوارەوە گووتی:

((خۆزگە زووتر سزاتان بدابام، نەفرەت لە حەزو ئارەزووەکانم،نازانم چۆن وەك شەیتان ئەم تاوانە پیسەم ئەنجامدا، ڕاستە کە من بکوژم  بەڵام ئازاری ویژدانم هەیە، پەککەوتەیەکی قوربەسەرو بێگوناهم کوشت، دۆزەخ جێگامە و پەتی سێدارە هەقی منە))

ڕۆژێ کە پەرویزو بەهرۆز لە ئاسایش بەرامبەر یەکتری دانیشتن، بەهرۆزی شەرمەزار و خەجاڵەت لە کاتێکدا کە فرمێسکی هاتبوونە خوار و سەری داگرت و ڕووی نەبوو تەماشای پەرویز بکات،پەرویز بە تورەییەکی تێکەڵ ڕسواییەوە پێی گووت:

((بۆچی ئەم کارەت لەگەڵمان کرد کاك بەهرۆز؟ ئەمە وەڵامی خۆشەویستیە بێ سنوورەکانی من و راحلە بوو بۆ تۆ؟ ئێستا لە من گەڕێ، بۆچی خوشکی یەککەوتەو نەخۆشم کە تەنها هاودەم و هاوبەشی ساتەکانی تەنیاییم بوو دەبێ ببێتە قوربانی چاوچنۆکی و حەزەکانی تۆ؟ بۆچی؟ بۆچی؟))

بەهرۆز دیاربوو لەگەڵ هەر قسەیەکی پەرویز چزوویەك بە دڵیدا دەچوو، ئاهێکی هەڵکێشاو دەستی بە گریان کرد، بەڵام بەداخەوە فرمێسکی سەر گۆناکانی بکوژ هیچ سوودێکیان نەبوو، من بینیم کە بکوژانیش دەگریەن، لەسەر داخوازی حاکم دۆسیەی بەهرۆز بۆ زیندان گوێزرایەوە تا لە پشت حەساری تەنیایی زیندان دیلی بیرو خەیاڵاتی پوچی شەیتانی نەبێ و خوێنی مرۆڤی بێ گوناه نەڕژێنێتە سەر زەوی، بەڵام دەنگی گریان و ناڵەکانی بەهرۆز بەجۆرێ لە ئاسمانی ئاسنینی زیندان بەر گوێی زیندانیەکان دەکەوت، هەموویان لەگەڵ یەکتر ورتە ورتیان دەهات کە چ دنیایەکی سەیرو زور تێپەڕو نهێنی ئامێزە،سەیرکەن چۆن بکوژان دەگریەن،،،،،؟

# قەلەڕەشی شووم

کە لە زیندان هاتە دەر، چاوێکی بە شەقامی قەرەباڵغ و خەڵکانێك کە لە هات و چۆ دا بوون گێڕاو نیگایەکیشی لە ئاسمانی شین کرد، هێشتا سەخت بوو بۆی کە باوەڕبکات سەردەمی زیندانی بەسەرچووەو ئازادە، لێوانی گۆشتنی کە لە ژێر سمێڵی بابڕی شاردرابۆوە، لێکبوونەوەو زەردەخەنەیەکی دڵخۆشکەر ڕوخساری ڕەق و تەقی ڕوناك کردەوە، دەسکێکی چەرمی بچووکی پێبوو بەبێدەنگ گوشی و بە هەنگاوە ئارامەکانی لە پەنا دیواری بڵند و چیمەنتۆی زیندان کەوتە ڕێ و ئامانجی ئەوەبوو کە دووای ئازادبوونی یەکەمجار پارەیەکی چاك بە دەست بێنێ و بە گیرفانی پڕەوە بۆ ماڵەکەی بڕواتەوە، دڵی بۆ خانەوادەکەی توند ببوو بەلاّم بۆ دیداریان پەلەی نەبوو، لە چەند ڕۆژێك پێش ئازادبوونی چەندین جار لە تەنهایی دا پلانەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە دیقەتەوە بەسەرکردبۆوەو تەنانەت سەرنجی بەشە لاوەکیەکانیشی دابوو، هەر لەو بیرۆکانە دابوو کە دەنگی بەرزی یەکێك لە دنیای خۆی ڕایکێشایە دەر: ((هێی، مهران قەلەڕەش؟! دوواجار ئازاد بووی؟)) کە ئاوڕی دایەوە، یەکێ لە هاوڕێ کۆنەکانی دیت لە ناو تاکسیەکی شڕ دانیشتبوو بە ڕوویەکی خۆشەوە تەماشای دەکرد،بۆ لای ڕۆیشت و لە دووای سلاّوو هەواڵپرسی لە تەنیشتیەوە دانیشت: ((کاك مەحمود دەبینم سەرقاڵی بە کارو کاسبی خۆتەوە! کاری پێشووت چی بوو؟!)) دیارە وازت لە کاری هەڵە هێناوە؟

ئەمیش لۆچی خستە نێوچەوانی و گووتی: (( ئەی بابە ئەو کارە بەدبەختی بوو هەر بۆیە بە ناچاری ڕووم لە گواستنەوەی گەشتیاران کرد، کاتێ ژن و منداڵت هەبوو، ئامادەی بۆ خەرجی و ژیانیان هەموو کارێك بکەی! وە کە باسی لوقمەی حەرام و حەلاڵ دێتە پێش مەسەلەکە شتێکی دیکە دەبێت!))

ڕستەی دووایی وەکو کوتکێ بوو کە بەسەری مهران قەلەڕەش داکێشرا: ((ڕاست دەکەی کاك مەحمود، بەلاّم بۆ من ئیدی کار لە کار ترازاوە، لەو کاتەی خۆم ناسیوە دەستم لە کاری هەڵەدا بووەو هەر بەو پارەیەش نانم بۆ ژن و منداڵەکانم پەیداکردووە،ئیدی هیچ کارێکی دیکە نازانم و لە دەستم نایەت!))

هادی لەکاتێکدا کە خەریکی ڕێکخستنی میلی ڕادیۆی لۆریە بارهەڵگرەکەی بوو، چاوی لە جاددەی بێ کۆتایی بەردەمی خۆی بڕیبوو، دووا مژی لە جگەرەکەی داو دووکەڵ لە دەم و لووتیەوە دەهاتە دەر، چاوی ماندووی کەوتە سەر وێنەیەك کە بەسەر ئاوێنەکەوە لکێنرابوو، خۆیی و هاوسەری میهرەبانی و کچە شەش ساڵی و دەساڵیەکەی کە هەموو بە پێکەنینەوە لە دوور ڕامابوون، دووبارە چاوانی لە جاددەی پێچاوپێچ و بێ کۆتایی بڕیبوو، لەسەر یەکێ لە پێچەکان چاوی بە پیاوێکی گونیە بە دەست کەوت کە چاوەڕوانی ئوتومبیل بوو، هەر کە کابرا لە دوورەوە ئەوی دیت هاتە ناوەڕاستی جاددە و هەردوو دەستی بۆ بەرزکردەوە تا ڕایگرێت، هادی ناچاربوو بووەستێت، ڕێبوارەکەش بەپەلە سەرکەوت و هەربەوجۆرە بە زمانێکی سەیرو دەنگێکی خنکاوەوە قسەی دەکرد لەلایەوە دانیشت، هادی دەستی بە ڕۆیشتن کردەوەو بۆ ئەوەی سەری قسەیەك بکاتەوە پرسی: ((ئێوەش بۆ شار دەڕۆن؟!)) ڕێبوار دەموچاوی تەواو داپۆشیبوو تەنها چاوانی بە قووڵداچوو سووری دەبینرا، وەك نیشانەیەك بۆ ئەوەی قسەکەی ئەو بسەلمێنێ سەرێکی بۆ ڕاوەشاندو هیچی دیکەی نەگووت، هادی هەستی بە نیگا سەنگین و سەرنجە وردەکانی کابرای بۆ سەر خۆی هەست پێ دەکرد و درکی بە شتێکی باش نەکرد، بۆ شکاندنی ئەو بێدەنگیە قورسەی کە بەسەر ئاسمانی بچووکی ژووری لۆریەکە زاڵبوو، بۆ بەقسەهێنانی گەشتیار دەستی بە قسە کرد: ((هەڵبەتە دەمێك بوو لەسەر جاددە وەستابوویی و چاوەڕوانی ئوتومبیلێك بوویی؟ هەقی خۆتە چونکە ئەم جاددە زۆر چۆڵە و زیاتر لۆری و ماشینە گەورەکان پێیدا دێن و دەچن، پێموایە نیشتەجێی یەکێ لەو گوندانەی دەوروبەری، وانیە؟)) هادی بێ وەستان قسەیدەکرد، بەلاّم دەتگووت مۆری بێدەنگیان لە دەمی کابرای نەناس دابوو، هادی مەتارەی چای هەڵگرت و خەریکی چا تێکردن بوو، لەناکاو کابرا دەستی بۆ ژێر جلەکانی بردو بە جۆرێ کە هادی نەیبینێ شتێکی دەرێناو ئامادەی هێرش بوو، هەر کە هادی بۆ لای ئاوڕی دایەوەو پەرداخە چایەکەی بۆ ڕاگرت، لەپڕ ساردی تیغی چەقۆی لەژێر گەردنی خۆی هەست پێکرد و ڕەنگی پێنەما،

کابرای نەناس بە دەنگێکی خنکاوو هاوشێوەی مرەمرِ لەژێر لێوەوە گووتی: ((لێخورە بۆ ناو شوێنێکی خۆڵاوی، ئەگینا سکت هەڵدەرِێنم! )) هادی مەترسی مەرگی لە پەنا گوێی دا دەدیت، لە ساتێکدا بریاریدا فەرمانەکانی ئەو بە تەواوی بەجێ بهێنێ و لە دەرفەتێکی گونجاودا لە شەری رزگاری بێ، ئەوەبوو بە دەمی وشکبووەوە لە ترسان گووتی: ((هەرچی تۆ بڵێی بەسەرچاو،،،تەنها ئەو چەقۆ نەعلەتیەم لێدوورخەوە!)) پاشان بێ وەستان بۆ جاددەی خۆڵاوی سورایەوە، کابرا دەمامکەکەی لەسەر دەم و چاوی لابردو هەر بە دەست وچەقۆوە دەیویست پەرداخە چایەکە هەڵگرێت کە هادی زۆر بە خێرایی پەلاماریدا، دوو پیاو لەناو ژوورێکی وا بچووکی لۆری دەسەویەخەی یەکتربوون، هادی هەوڵی دەدا چەقۆکەی لێوەربگرێ و چەکی بکات، بەڵام کابرای نەناس بەهێزتربوو لەو، تەنگی بە هادی هەڵچنی بوو بۆ هەر کارێ کە دەیویست، سات بە سات تواناى هادی بۆ ململانێ کەمتر دەبۆوە،،،

لەناکاو هاوارێکی کوشندە لە دڵ و گیانی هادی دەنگی دایەوە و ناڵەی بە ئاسمان گەیاند و بە هەردوو دەست سکی هەڵدراوی خۆی کە خوێن فوارەی دەکرد لەناوی گرت،خوێن تەواوی ئەم ناوەو سەر کورسیەکەی داپۆشی، هادی لە تاوان تلی دەدا، بەڵام کابرای نەناس چونکە دەمامکی شەرِانگێزی لەسەر روخساری بوو، بواری نەدەدا و یەك بە دووای یەك چەقۆی لێدەداو جەستەی هادی کون دەکرد و قاقای لێدەدا، زۆری نەبرد چاوە کەم تینەکانی هادی لەسەر وێنەی خانەوادەکەی گیرسایەوە و پەردەیەکی لەرزۆك لە فرمێسك برژانگی تەرِکرد، پێش ئەوەی دووا هەناسە هەڵبکێشێ، دەنگی گرو زبری کابرا هاوشێوەی زەنگی مەرگ لە گوێی دا زرینگایەوە: ((بەداخەوەم بۆت کاکەی گەنج، بەڵام باشترە ناوی من لەگەڵ خۆت ببەیتە گۆرِەوە، من مهران قەلەرِەشم! تێگەیشتی؟! مهران قەلەرِەش!))

گۆرِەپانی میوەو بارە تەرِەی چەقی شار وەك هەمیشە پرِ پرِ لە خەڵك بوو، هەر لەو کاتەدا لۆرییەك بە شووتیەوە گەیشت، پاسەوان و بەرپرسی کۆڵکێشان بە نیگایەکی خێرا و زۆر زوو کامیۆنەکەی ناسیەوەو لە ژوورەوە هاواریکرد:

((سلاّوكاك هادی، ئەم چەند ڕۆژە لە كوێ بووی؟! دیسان وەك هەمیشە بارەكەت شووتی گەورەو درێژە؟)) بەلاّم بە تەواوی حەپەسانەوە بینی لە جێی هادی پیاوێكی چوارشانەو سمێڵەستوور لە پشت سوكانی كامیۆن دانیشتووەو ڕوخساری خوێن گرتوو شێواو بوو، پاسەوانەكە هادی زۆر باش دەناسی و دەیزانی لۆرییەكەی هەرگیز نەدەدایە دەست كەس، كابرای نەناس دابەزی و بۆ لای پاسەوان هات و گووتی: ((من یەكێ لە هاوڕێیانی كاك هادیم، ئەوەی ڕاستی بێ هادی ئەمڕۆ حاڵی باش نەبوو، هەربۆیە من لەجیاتی ئەو بارەكەم هێنا)) یەكەمین شتێ كە بە خەیاڵی پاسەواندا هات، پەیوەندی كردن بە پۆلیس بوو، بێ خۆ دوواخستن پەیوەندی بە پۆلیسەوە كردو خێرا دایخستەوە، چونكە كابرا هاتە ژوورو گووتی: (( ئێستا ئەگەر دەكرێ چەند كرێكارێك بانگ بكەن تا بارەكەم خاڵی بكەنەوە)) كابرای پاسەوان بە ناچاری سەری بادا بۆ ئەوەی تا پۆلیس دێت شوفێرەكە سەرقاڵ بكات، بۆیە بە قسەوە خەریكی كرد، زۆری نەبرد دەنگی ئاژێری ئوتومبیلی پۆلیس لەو شوێنەدا دەنگی دایەوە و شوفێرە نەناسەكە بە ئاشكرا ترسانی پێوە دیاربوو، خێرا لە جێگاكەی هەستایە سەرپێ و بە دەنگێكی سەیرەوە پرسی: ((چی ڕوویداوە كە سەروچاوی پۆلیس لەم ناوەدا پەیدابووو؟!)) پاسەوان لە تەواوی ئەم ماوەیەدا سەرنجی هەڵسوكەوتی كابرای شوفێری دابوو ئێستا دڵنیاببۆوە لەوەی ئەم ماستە موویەكی تێدایە، بە توڕەییەوە پێی گووت: ((لە جێگاكەت دانیشەوە كاكی نەناس لەوانەیە پۆلیس ئیشی بەخۆت هەبێ!)) شوفێرەكە تووشی شۆك ببوو، بە ترس و دڵەڕاوكێوە لە پاسەوان ڕاماو بە پێكەنینێكی ماناداری ئەو لە هەموو شتێ تێگەیشت، ئێستاش درەنگ نەبووە، لە ساتێكی گونجاودا هێرشی بۆ سەر پاسەوانەكە بردو فڕێی دایە سووچێكەوە، لە ژووری پاسەوانی هاتەدەرو هەلاّت، بەلاّم بە جۆرێكی نەخوازراو لەنێوان قەرەباڵغی ئەم هەموو خەڵكەی لەوێ بوون گرفتار بوو، بۆیە چاپوك و ئازایانە پاڵی بە خەڵكەكەوە دەناو ڕایدەكرد، بەلاّم چونكە شارەزای ڕێگاكە نەبوو بۆ سووچێك كە میوەیەكی زۆریان لێدانابوو ڕۆیشت و چەند جارێك هەڵەنگووتی، سەرەنجام

بەربۆوە، ئازاری قاچی هەراسانی کرد و کاتێ بەخۆهاتەوە بە دیتنی چەند کارمەندێکی پۆلیس کە چواردەوریان گرتبوو، ئاهێکی لە داخ و پەژارەوە هەڵکێشا، کە چەند زوو ڕیسوای خەڵك بووم، ((مهران، ناسراو بە مهران قەلەڕەش! باشی مهران قەلەڕەش؟! سەیرە دۆسیەیەکی چەند سەنگین و ڕەنگینت هەیە! کارە هەڵەکانت بە هەموو جۆرو بەشێکەوە لەنێو دۆسیەکەت ڕیزبوون کە دوواهەمینیان قاچاغی ماددەی بێهۆشکەر بووە، هەندە لەمێژنیە لە زیندان بەربوویی، بەلاّم بە ئێمەت نەگووت مەسەلەی ئەو کامیۆنە شووتیە چیە؟!))
مهران قەلەڕەش سەری بڵند کردو بە سیمایەکەوە وەك بڵێی هەق بەوە هاواریکرد: ((هەڵەیەك ڕوویداوە جەنابی ئەفسەر! ئەو کامیۆنە هی خۆمە، مەبەستم ئەوەیە تازە لە یەکێ لە خزمانم کڕیوە! لەوەی کە دەمەوێ لێرە بەدوواوە بە باربردن لوقمەیەکی حەلاّڵ لەسەر سفرەی ژن و منداڵم دانێم تاوانە؟!)) بە هێمنیەوە گووتم: ((ئەی کە وایە لە خزمێکت کڕیوە! بۆچی بە پاسەوانەکەت وانەگووتبوو؟ مەسەلەی هاوڕێیەتی تۆو هادی شوفێری ڕاستەقینەی کامیۆن چیە؟!)) مهران قەلەڕەش هاتەوە قسە: ((دەزانی چیە؟ ئێوە دەتانەوێ بەهەر شێوەیەك بێ بە سەرپێچی کردنێ تاوانبارم بکەن و دووبارە بمنێرنەوە گۆشەیەکی زیندان!)) بە زەبر و زەنگێکەوە گووتم: ((کاك مهران تۆبەی گورگ مەرگە! خۆشت باش دەزانی نەبوویی بە مرۆڤ،ئەگینا بە جارێك چوونە زیندانەوە دەبووایە ببیتە مرۆڤ و ئێستاکە خەریکی ماڵ و ژیانی خۆت دەبووی، ئینجا لە پرسیارەکانم ڕامەکەو چەواشەم مەکە، ڕاستی مەسەلەکەم بۆ بگێڕەوە! چ بەلاّیەکت بەسەر شوفێری کامیۆنەکەدا هێناوە؟!))

مهران قەلەڕەش کەمێ سەری خوراندو دیسانەوە بێدەنگ بوو، بەلاّم ئەم بێدەنگیە زۆری نەخایاند و دوواجار دانی بە ڕاستیەکی تاڵدا دانا کە پێمخۆشنەبوو گوێم لێیبێ: ((جەنابی ئەفسەر کوشتم و تەواو، هەرئەمەیە! ))

دەستەکانم توند بە مێزەکەدا کێشاو گووتم: ((کوشتت؟! هەر ئاوا ئاسان؟! خۆت دەزانی بەکوێ دەگەی کە بۆ ماڵی بێ نرخی دنیا ئامادەبووی گیانی کەسێ

بکێشی، ئەو کەسەش نان پەیداکەری خانەوادەکەیەو هەزاران چاو لە چاوەڕوانیدانە، بیٚ ئەوەی بیر لەمانە بکەیتەوە؟! وای بەحاڵت، وای بە ئەنجامی کارت!)) مهران قەلەڕەش چەند ساتیٚ بە دەم و چاوی سوورهەڵگەڕاو لیٚم ڕامابوو بیٚ ئەوەی بچووکترین کاریگەری قسەکانم بە نیگاو ڕەفتارییەوە دیاربیٚ، دەستی بە گێڕانەوەی ڕووداوەکە کرد: ((کە کار لەکار بترازیٚ، چ بەلاٚیەك بیٚ چ سەد وەکو یەکە! من زۆر لەمێژە ژیانم لە ڕێگای کاری هەڵەوە بەسەردەبەم، جا چ جیاوازییەکی دەبێت دزی بکەم یان پیاو بکوژم! من لەگەڵ بۆنی پارە مەست دەبم و دەچمە دنیایەکی دیکەوە! لە دوواجاری سەردەمی گیرانم، لەزیندان سەرنجم لە کارەکانمدا تا ئێستا هەمووی هەر لە ڕێگای هەڵەکارییەوە بووە، بۆیەش بڕیارمدا پێش بەو کامیۆنە گەورەیە بگرم کە هەر شوفێرەکەی تێدابوو تا پارەی لیٚ بسێنم، چونکە دەمزانی شوفێری ئەم جۆرە لۆریانە بەگشتی پارەی باش لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن، هەڵبەتە ماوەیەکی زۆر بوو خەریکبووم کارم لەسەر ئەو پلانە دەکرد و تەواوی ڕێگاکانی کۆتایی شاریشم پشکنی بوو، لە ئەنجامدا دوێنیٚ بەیانی بۆ دەسپێکی کارم جلی کرێکارانم پۆشی و پێشم بەم کامیۆنە گرت و لە دەرفەتێکدا هەڕەشەم لە شوفێرەکە کرد تا هاوکاریم بکات، بەلاٚم ئەو ویستی فێڵم لێبکات، دوواجار ناچاربووم بە چەقۆ لێیبدەم، ئینجا بۆ جاددەیەکی ناسەرەکی لێمخوڕی و تەرمی شوفێرەکەم بۆ چاڵێك فڕێدا کە هەر لەو نزیکانە بوو،ناو کامیۆنەکەم لەخوێن پاك کردەوەو لە کۆتاییدا سەرکەوتووبووم، چونکە نزیکەی یەك ملیۆن تومانم لە ژێر کورسی شوفێر دۆزییەوە، ئەمە بۆ سەرەتای کارم خراپ نەبوو، چاوچنۆك بووم، بڕیارمدا یەکەمجار بارەکە بفرۆشم دووایش کامیۆنەکە بە پارەیەکی باش، ئینجا بە گیرفانی پڕەوە بۆ لای خانەوادەکەم بگەڕێمەوە، هرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە پاسەوانی کۆلکێشان گومانم لێبکاو پۆلیس ئاگادار بکاتەوە، وەك چۆن بیرم نەبوو لەم ڕێگایەوە پارەم پەیداکردووە، زۆر زوو ئاشکرا بووم و دەسگیربووم))

مهران قەلەڕەش پاش ئەوەی شوێنی تەرمەکەی دیاریکرد، دەستی بە پێکەنینێکی توڕەو نەفرەت ئەنگێز کرد کە وێنەی دەنگی قاڕەقاڕی وشکی قەلەڕەشی پیرو ڕەش لە بێدەنگی ساردی باغی پاییزی نەبوو، لە ژێر لێوەوە ورتەی دەهات: ((تۆ ئەوەندە لە زەلکاوی گوناھ نوقم بوویی کە ناتوانی هەست بە خوێنی بێ گوناھ و ئاهی هەتیو بکەی، چونکە زۆر زوو داوێنگیرت دەبێ و قوڕی ڕەشت بەسەردا دەکا!))

دۆسیەی کوشتنی هادی تەواوبوو مهران قەلەڕەشیش بە تاوانی کوشتنی ئەنقەست و دزی بۆ دادگا نێردرا تا دیسانەکە درێژە بە ژیانی نەفرەتباری بداتەوە لەنێو چوار دیواری بێ ڕۆح و ساردی زیندان و لە چاوەڕوانی سزاکەی بێت و ساتە ئازاردەرەکانی ژیانی بگوزەرێنێت.

# گومڕایانی دۆزەخ

پیاوێکی لەڕولاواز و قژ لوول کە ڕووبەڕووم دانیشتووە، یەك سات نیگای لەو کەلەپچەیەی کە لە دەستانی دراوە هەڵدەگرێ و وەك بڵێی تازە لە خەوێکی قورس بێدار بووبێتەوە، مات و مەلول سەرتاپای ژووری لێپرسینەوە کە هیچ کەسێکی جگە لە من و ئەو لێ نیە، تەماشا دەکات، هەڵسوکەوت و ڕەفتاری سەیر دێتە بەرچاو، بەهەرحاڵ بە ئارامی سەری قسە دەکەمەوە:

- کاك ئەبی، خۆت ڕووداوەکە بیّ کەم و کوڕی بگێڕەوە، حەزناکەم لە ددمتەوە گوێم لە درۆ بێ چونکە پاشان بە زیانی خۆت کۆتایی دێت! بفەرموو،،،،

ئەبی نیگایەکی تێکەڵ بە بێبایەخی لە من دەکات و بە ساردییەوە دەپرسێ:

- بۆ نموونە دەبێ بڵێم چی؟ بڵێم چۆن سەری کیانوشمان لەقوڕێ نا ؟ چین ئەوانەی لێمان دزی یا،،،،

تامەزرۆیانە گووتم:

- ئافەرین، کاك ئەبی پێویستە هەموو ئەو شتانە بە ڕاستی ڕوونبکەیتەوە، بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین لە سووککردنی سزاکانت کۆمەکت بکەین، هەڵبەت دەشیکەین، ئێستا قسەکانت بکە تا لەناو بەڵگەی توێژینەوە لە تاوانبار بەجۆرێ بنووسم کە ئیدی بڕیار نەبێ پێ بە خواری دابنێ و ناچاربم بەڵگەی توێژینەوەکە بگۆڕم، ئەبی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو یاری بە دەستە قوفڵ بووەکانی دەکرد، لەوکاتەدا گووتی: بەسەرچاو جەنابی ئەفسەر، ئێستا کە دوواجار بڕیارمدا هەموو مەسەلەکە پیاوانەو بەڕاستی دەگێڕمەوە، بنووسە!

- من و کیانوش و شەهرام زۆر دەمێك بوو هاوڕێ بووین، لەنێو کاری کڕین و فرۆشتنی شتە کۆن و ئەنتیکەکان و لەمجۆرانە، تەنانەت کە پارەیەکمان لەو ڕێگایەوە دەخستە گیرفان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە لەنێوانماندا بەشماندەکرد، هەرسێکمان لەم بارودۆخە ڕازیبووین، بەڵام حەیف چاوچنۆکی زۆر چاوی کیانوشی کوێر کرد و ناچاریکرد بەجۆرێکی شاراوەو لەبنەوە لە بەڵێنی پاشگەزبێتەوە، ماوەیەك بوو سەرنجی هەڵسوکەوت و ڕەفتارە گوماناوییەکانیم دابوو، هەستم

دەکرد لە ژێرەوە خەریکە شتێك دەکات و ناشیەوێ ئێمە بزانین، هەڵبەتە ڕەنگە ئەمە مافی خۆی بێ کە نەیەوێ نهێنی ژیانی تایبەتی بە ئێمە بڵێ، بەڵام کاتێ هەستمکرد خەریکە لە ڕێی دەلاڵی و کڕین و فرۆشتنەکانەوە پارەیەکی وەها چاك لە گیرفانی دەنێ و ئیشی بە ئێمە نیە کە نزیکترین هاوڕێی بووین، گەلێك توڕەبووم، سەرەتا شەهرام لە زۆری ڕەوتی ڕووداوەکە ئاگادار نەبوو، بەمەبەستی هاوکاری لەگەڵ خۆم ورووژاندم، کاتێ هاتە ژێربار بڕیارماندا بەجووتە کیانوش بخەینە ژێر چاودێرییەوە و لە دەرفەتێکی گونجاودا مەچەکی بگرین، ئەوەی ڕاستی بێ جەنابی ئەفسەر! چاومان بە دەوڵەمەندبوونی هەڵنەدەهات، چاوەڕێمان دەکرد هەر کارێکی کە دەیکات ئێمەش لە مەسەلەکە ئاگادارکات! بەکورتی کاتێ وردتر سەرنجی کیانوشماندا تێگەیشتین کە بووەتە خاوەنی ئامێرێکی پێشکەوتووی دۆزینەوەی گەنج و بەهۆیەوە دەتوانێ شاراوەترین شتی کۆنەو گرانبەها لە ناخی زەوی ئاشکرابکاو بە فرۆشتنی نایاساییان پارەیەکی زۆرو زەبەندی دەسکەوێ، هەڵبەتە من و شەهرامیش بەمە ڕازی نەبووین، هەربۆیە بە جووتە کەوتینە بیرکردنەوە لەم مەسەلەیە، نازانم چۆن شەیتان بۆ ژێر کلێشەمان چوو بیرۆکەی کوشتنی کیانوشمان بە خەیاڵدا هات، دەبێ دان بەوەشدابنێم کە ئەم پلانە یەکەمجار بەخەیاڵی منداهات، وەختێ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەمەم لەگەڵ شەهرامدا باسکرد، زۆر ترساو بەتوندی بەرپەچی دامەوە، خۆشم بەتەنها نەمدەوێرا، خوا دەزانێ بەهەزار فێڵ و تەڵەکەبازی تا شەهرامم ڕازیکرد لەگەڵم بێ، بڕیارماندا لە نیوەشەودا کە کاتی چالاکیە شاراوەکانی کیانوش بوو پلانەکەمان جێبەجێ بکەین، ئەو شەوەی کە دەستمان بە خوێنی کیانوش سووربوو شەوێکی تاریك و تەماوی بوو! هەستم دەکرد هەزاران جووتە چاو من و شەهرام دەبینن، پێموابوو هەموو شتێك خەریکە قسەمان لەگەڵدەکات و لە ئەنجامی کردەوە شووم و ناپیاوانەکەمان ئاگادارمان دەکاتەوە، بەڵام هەوڵمدەدا زۆر گوێ بەم شتانە نەدەم و بیر لەو کاتە بکەمەوە کە دەبمە خاوەنی ئەو ئامێرە بە نرخەی گەنج دەدۆزێتەوەو پارەو پولم دەستدەکەوێ، کاتژمێرێ پێش نیوەشەو لە شار

دەرچووین و لە خاڵێکی زۆر دوورتر کە شوێنەواری هیچ ئادەمیزادێکی لێنەبوو، لە ناوەڕاستی ئەو دەشتە وەستاین و لە شوێنێکی گونجاودا خۆمان شاردەوە، دڵمان لەناو دەستمان بوو، بە ئاشکرا ترس و لەرزینم پێوە دیاربوو ئارەق گشت گیانی تەڕکردبووم، حاڵی شەهرامیش زۆر لە من باشتر نەبوو، چەند جارێك بە بن گوێمی دا هەڵدا کە ناتوانێ دەست لە کاری کوشتن بدات و تاکو ئێستاکە تەنانەت مریشکێکیشی سەرنەبڕیوە و دووربووە لەم کارانە و،،،کەچی وەختێ بەڕاستی داوام لێکرد تا بەهۆی هاوڕێیەتی دێرینەمان لەم کارەدا تەنیا جێم نەهێڵێ، بێدەنگ بوو لە چاوەڕوانی دا دانیشت، دەنگی وڕەی ئوتومبیلی کیانوش لەنێو ئەو دەشتەدا دەنگی دایەوەو بێدەنگی و چۆڵەوانی جاددەی تێکشکاند، ئێمەی لەجێی خۆمان ڕاچڵەکاند، بۆ دوواجار پلانەکەم لە خەیاڵی خۆم تاووتوێ کردەوەو سواری ئوتومبیل بووم و بە سوڕانەوەیەك پانایی جاددەکەم گرت، چونکە دەمزانی ئەم کارە کیانوش ناچاردەکات بووەستێ و بۆ ڕێگاکردنەوە و ناسینی شوفێرەکە دادەبەزێ، چۆنم دانابوو هەر واشبوو، بەڵام پێش ئەوەی کیانوش دەرفەتی ئەوە پەیدابکات تا بۆ لای ئوتومبیلەکەمان بێ، من و شەهرام دەم و چاومان بە گۆرەوی داپۆشیبوو لە پشت گردێك بۆسەمان بۆ دانابۆوە، لەپڕ هێرشمان بۆ هێناو بەر چەقۆماندا و خستمانە سەر زەوی، قوڕبەسەرە هەتا بواری هاوارکردنیشی نەبوو، تەرمەکەیمان لە سندووقی دوواوەی ئوتومبیل داناو کەوتینە پشکنینی ئوتومبیلەکەی، بڕێکی زۆر شت و مەکی دێرینە و گرانبەها لەگەڵ ئەو ئامێرەی مەبەستمان بوو دۆزیمانەوە، هەموومان هەڵگرت و ویستمان ڕابکەین، کەچی دووبارە شەیتان بۆ بن سەرم هاتەوە، بیرمکردەوە ئەگەر بەمجۆرە و هەروا لە ناوەڕاستی جاددە ئەم ئوتومبیلە بە تەرمەوە جێ بێڵین و بڕۆین، درەنگ یا زوو هێزەکانی پۆلیس دەیدۆزنەوەو گومانمان لێدەکەن چونکە لە هاوڕێ نزیکەکانی ئەوین، باشترین شت بۆ لەناوبردنی تاوانەکەمان سووتاندنی ئوتومبیلەکە بوو بە تەرمەوە! شەهرام ئامادەنەبوو بۆ ئەمە بەڵام دەمزانی ترسنۆکەو بە بچووکترین شت ڕامی دەکەم، بۆیە هەڕەشەم لێکرد ئەگەر یارمەتیم نەدات ئەویش دەکوژم و

لەگەڵ کیانوش دەیانسووتێنم، شەهرامی قوربەسەر، یەکەمجار بەتەمای هاوبەشیکردنم لەم کارە نەبوو، بەڵام من ناچارمکرد وئێستا ئەویش خەریکە داری چاوچنۆکی و پیسی من دەخوات، بەکورتیەکەی ئوتومبیل و لاشەکەمان بۆ خاڵێکی نەزانراو بردو ئاگرمان تێبەردا و بەقسەی خۆمان ئیشەکەمان تەواوکردو ئەوەی دەمانویست بەدەستمان هێنا، کەچی لەوە بیٚ ئاگابووین مۆبایلی کیانوش لەو دەشتەدا لە تەنیشت ئوتومبیلەکە جێمابوو ئێوەش بە کەڵك وەرگرتن لە دوواهەمین پەیوەندییەکانی کیانوش کە وەڵامی داوینەتەوە دەماندۆزنەوەو دەسگیرمان دەکەن،،،

ئەو لەکاتێکدا دەستانی دەلەرزی و بەڵگەی لێپرسینەوەکەی واژوو دەکردو لەپاش کۆتایی قسەکانی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو بەردەوام بۆوە:

ـ لە منداڵی بیستبووم خوێنی مرۆڤی بێگوناه بەفیڕۆ ناڕوات، بەڵام باوەڕم نەدەکردو نەمدەزانی ئەمە مانای چیە؟ کەچی ئێستا تێگەیشتم، ئێستاش دەزانم چی چاوەڕوانی من و شەهرامە، دەزانم کە دەبیٚ تەواوی تەمەنم لەکویٚ ببەمەسەر و حەسرەت بۆ حاڵی خۆم هەڵبکێشم، بەڵام تازە چ سوودێکی هەیە کە کار لە کار ترازاوەو خوێنی کیانوش داوێنی گرتووین، من و شەهرام لە گومڕایانی دۆزەخین چونکە دەستمان بە خوێنی باشترین هاوڕێمان سوور بووە، هەرگیز پێم وانەبوو لەژیانمدا کەس بکوژم و مافی ژیان لەیەکێك بستێنمەوە، هەڵبەتە ئەبی ڕاستی دەکرد، تەنها چەند کاتژمێرێك پاش ڕووداوی ترسناکی کوشتنی کیانوش، بەهۆی ئەو ئوتومبیلانەی بەوێدا ڕەت دەبن کە سەرنجی لاشە و ئوتومبیلی سووتاو لە ڕێگای جاددەی باکوری شار دەدەن ئاگادارکراینەوە، سەرەتا وادەرکەوت هیچ پاشماوەیەك لەو جۆرە تاوانە بەجێنەماوە تاکو پەی بەم ڕووداوە ترسناکە ببەین، وێنەی دیمەنەکانمان گرت و گشت بەڵگەوشوێنەوارەکانی تاوانەکەمان ڕێکخست و ئامادەکر و ئێسقانی لاشەی کیانوشمان بۆ تاقیگەی تاوان گواستەوەو چەند ڕۆژێك دوواتر لەڕێگای خزمە نزیکەکانیەوە تەرمەکەمان پێدانەوە، لایەنی پەیوەندیدار بۆ توێژینەوە لە چۆنیەتی ڕووداوەکە و بەدەسهێنانی سەرە داویٚ، پاش هەماهەنگی

یاسایی لەڕێگای هەواڵگری پەیوەندی تەلەفۆنی کوژراوو لێکۆڵینەوە هونەرییەکانەوە بە پلانێکی نەخشەکێشراو ئەبی و شەهرام بێ ئاگا لەخۆیان دەستگیر دەکەین، ئامێرەکەو شت و مەکە کۆن و گرانبەهاکانیش دەدۆزینەوە، زۆر زوو نهێنی تاوانی جاددەکەی تەنیشت شار ئاشکرابوو، بکوژانی کیانوش دەگیرێن، ئەو ڕۆژە پاش تەواوبوونی دۆسیەکە بە ئەبی دەڵێم: تۆ کە تەمەنت سی ساڵە، بۆچی دیلی هەڵەیەکی گەورە بوویت لە ژیانتدا، شەهرامی هاوڕێشت بە یەکجاری بۆ ناو ئەم ڕووداوە پەلکێش کرد؟

ئەبی بە ئەفسوسەوە سەرێکی باداو گووتی:

- چاوچنۆکی و تێرنەبوون لە ماڵی دنیا جەنابی ئەفسەر! هەر ئەم پارە پیسە کوێری کردم و عەقڵی لەکارخستم.

خوایە کەسی دیکە کۆیلەی باق و بریقی دنیا نەبێ، دۆسیەکە تەواو دەکەین و ئەبی و شەهرامیش بەپێی یاسا بۆ زیندان دەنێرین تاکو چاوەڕوانی فەرمانی سزاکەیان بن، باشە بەڕاستی نرخی ئەم دنیایە چەندە تا بەهۆیەوە شەیتان دەستە میهرەبانەکانمان بە خوێن سوور بکا و ئاگری دۆزەخ لە قیامەتدا بکەینە چارەنوسی خۆمان؟

# لە پەنای شەودا

بایەکی لەسەرەخۆ پەڵە پەڵە هەورێکی ڕەشی لەلای خۆرئاواوە بەپێش خۆی دەداو بۆنی بارانی پاییزی لە هەوادا بڵاودەکردەوە، دەنگی باڵ لێکدانی باڵندەیێ لەگەڵ ((قاڕەقاڕ)) ی ماندووی ئەو قەلەڕەشانەی کە لە دوورەوە دەفڕین، بێدەنگیەکی تێکەڵ بە خەوەنوچکە ئاقاری سەوزی شاری لە دووا کاتەکانی پاشنیوەڕۆی یەکێ لە ڕۆژەکانی سەرەتای پاییز دەشکاند، لە کۆتایی ئاسۆ کە زەوی تاریك و ئاسمانی شین، هاوشێوەی دوو دڵدار و دولبەر بەیەك دەگەیشتن، دووا پاشماوە ی سووری خۆر لە ڕوخساری شار کاڵ دەبۆوە، دەرگای پەرژینێکی گەورەی باغ بەهۆی باغەوانێکی پیرو گرژەوە کرایەوە و ئوتومبیلێکی ڕەش سەرنجی ڕادەکێشا، لە کاتێکدا کە دوو کەسی تێدابوو لە باغەکە دەرچوون و بە کوێرە ڕێیەکی خۆڵاوی نێوان باغ و کێڵگەکاندا کە پاش چەند پێچ و خولانەوەیەك بە ڕێگای قیرتاوی شار دەگەیشت، ڕۆیشتن، شوفێرەکە گەنجێکی ڕووخۆش و لێهاتوو بوو کە تەمەنی لە بیست و هەشت ساڵ زێتر نەدەبوو، چاویلکەیەکی تۆز لێنیشتوو ڕەنگی چاوانی دەشاردەوەو بەهۆی دەسەڵاتی تەواوییەوە لەسەر شوفێری، سوکانەکە لە دەستانی پان و گرێداری وەك موم دەخولایەوە، لە کورسیەکەی تەنیشتی گەنجێکی دیکە دانیشتبوو کە تەمەنی کەمێ لە شوفێرەکە زیاتربوو سەرو جل و ڕووکاری کەسێتیەکی باڵاتری پێدەدا، لەکاتێ کە بەجۆرێکی ڕێك جگەرەی لە سووچێکی لێوی دەهێناو دەبرد، نیگای پەرێشانی کە ڕەگیان لە تووڕەیی دا شاردرابۆوە بە دیمەنەکانی دەرەوەدا دەگێڕاو لەخۆڕا سەری با دەدا، کە کەمێك لە باغ دوورکەوتنەوە، گەنجەکە مژێکی دیکەی لە جگەرەکەدا و فلتەرەکەی لەسەر شووشەکە فڕێدایە دەرەوە و سەری قسەی کردەوە: ((لەخوا بەزیادبی ئەمساڵیش بەرهەمی باغەکەمان باشە، دەبێ هەرچی زووترە دەست بەکاربین بۆ کۆکردنەوەو چنینەوەی ئەمە وێڕای ئەوەی ئەرکی باغەکە بۆ هەمیشە یەکلابکەینەوە)) پاشان چاوێکی لە شوفێرەکە کرد کە پێدەچوو بێبایەخانە ئوتومبیلەکە بهاژووا، بە دەنگێکی دوور لەگاڵتەوە گووتی: ((بزانە بەهرام خۆت

باش دەزانی کە چەندین ساڵە ئەم باغە بێ سەرپەرشت ماوەتەوە، نە باوکی من و نە باوکی تۆ لە حەق و مافەکانی سەرەتایان خۆشنابن، من وای بەباش دەزانم ئێمە وەکو کورە گەورەکانی هەردوو خانەوادە پێویستە هەرچی زووترە ئەم فیتنەو پەشێوییە کۆتایی پێ بێنین، ها تۆ دەڵێی چی؟))

بەهرام چاویلکەکەی لابرد و لە گیرفانی کراسەکەی دانا و هەربەوجۆرەی کە هەستی لە لای شوفێرییەکەی بوو گووتی: ((من هیچ قسەیەکم نیە شەهروز، بەڵام ئەرکی ئەم باغە زۆر دەمێکە یەکلابووەتەوە، هەموو خەڵکی دەزانن کە باوکی من لە باوکی تۆ بەشی زیاتری لەم باغە بەردەکەوێ، هەڵبەتە کەمێ زیاتر لە نیوەی ئەوە ! منیش دەبینم کە تەواو ئەو لەسەر هەقە، بەهانەیەك نابینم تاکو لە بۆچوون و مافی ئەو پاشەکشێ بکەم))

شەهروز چاوەڕوانی قسەیەکی وەهای لەلایەن کورە مامەکەیەوە نەدەکرد، چەند ساتێك بە حەپەساوی لێی ڕاماو دووایی خێرا جگەرەیەکی دیکەی داگیرساندەوەو بە تورەییەوە گووتی: ((بەڵام بەهرام گیان، کورە مامی چاکم! باوکی هەردووکمان وەکو یەك و بێ جیاوازی لەم باغەدا زەحمەتیان کێشاوە، ئیدی چۆن دەبێ باوکت بانگەشەی ئەوە بکات کە زیاتر لەنیوەی بەردەکەوێ؟ ناکا تۆش بتەوێ ئەم شەڕو ناکۆکیە کۆن و بەسەرچووە بە لاساری درێژە پێبدەی؟ لەڕاستی دا خۆتدەزانی لەم هەموو دەردەسەرییەی بەهۆی بەشکردنی ئەم باغە نەعلەتیەوە بۆ هەردوو خانەوادەو هەتا خێزانەکانی دیکەش دروست بووە و بۆتە هۆی ساردی پەیوەندی و هاموشۆمان، ماندوو نەبووی؟ وەرە لە کەری شەیتان دابەزەو بەجووتە دانیشین تا بەیەکجاری مەسەلەکە چارەسەر بکەین))

بەهرام بە ئاشکرا بڵێسەکانی تورەیی بەچاوانی ماندوویدا دیاربوو بەهۆی قسەکانی شەهروزەوە، وردە وردە ئوتومبیلەکەی هێواش کردەوەو بە دەنگێکی تورەو زەبرەوە پێی گووت: (( شەهروز، جارێکی دیکە ئەم بابەتە مەکەوە! هەر ئێستا هەردووکمان لە ژێر درەختە پڕ فستەقەکانی باغ ڕاکشابووین و قسەی خۆشمان دەکردو پێدەکەنین، تۆش وەکو من چاك دەزانی کە هەق بە باوکی منە،

بلّیّ بزانم، ئەو کاتەی ئەم دەشتە سەوزە دەشتێکی چۆلّ و وشك وبرینگ بوو وەك ئێستا تەڕو تێراو نەبوو، کیّ بوو کە بە ڕاسپاردەی ئاغاجانی خوالێخۆشبوو بێڵی لەسەر شانی داناو بە سۆراغی ئەو زەوییە چەند هکتاری و کاکی بە کاکیە بیّ ئاوو گیایە هات و شەوو ڕۆژ کاری تێداکردو ئارەقەی ڕشت تا یەکەمین نەمام لە خاکدا ڕەگ داکوتیّ؟ باوکی من بوو یا باوکی تۆ؟ کیّ بوو لەبەرخاتری ئەوەی کە دەبوو ئاو بە باغەکەدا تێپەڕیّ  دەسەویەخەی خاوەن موڵك و باغەکانی دەوروپشتمان بوو چەند مانگیّ لەم دەرگاو ئەو دەرگای داو هات و چۆی کرد تا دوواجار بە تەنیا ئەو سەرئێشانەی چارەسەر کرد؟ باوکی من بوو یا باوکی تۆ؟ ئەگەر بمەویّ باسی ئەو زەحمەتیانەت بۆ بکەم کە باوکم لەم باغەدا کێشاویەتی ئەوا هۆنراوەیەکی هەفتا دێڕی دەبێت، هەر هیچ نەبیّ تۆ کەمێك ویژدانت هەبیّ و کارە بێماناکانی باوکت دووبارە مەکەوە))

لەوکاتەدا بەهرام چاوی لە بەرامبەر خۆی بڕیبوو بە بڕوا بەخۆبوونەوە بەرگری لە بیروڕای باوکی دەکرد، شەهروز بە توڕەییەوە دەرگای داشبولەکەی کردەوەو بیّ ئامانج چاوێکی پێداگێڕا، بەڵام لەناکاو چاوی کەوتە سەر تیغێکی ڕایەخ بڕین کە لەنێو وردەواڵەکانی دیکە بریسکەی دەدا و بیرۆکەیەك وەك بروسکە بە مێشکیداهات، بەڵام هەوڵیدا ئەمە لەخۆی دوورخاتەوە، هەربۆیە دەرگاکەی داخستەوە، لە کاتێکدا بە دەنگی گاڵتە ئامێزی بە هرام و سووربوون لەسەر بیروڕاکانی باوکی توڕەببوو، شەهروز لەژێر لێوەوە نەڕاندی: (( بزانە بەهرام، ڕێزی خۆت بگرە و بەم جۆرە دەربارەی باوکم قسەمەکە ! ڕاستە باوکم چەند ساڵێك لە باوکی تۆ بچووکترە، بەڵام زۆرباش ئەمەم لە یادە کە هەر لە ڕۆژەکانی یەکەمەوە کە بە قسەی تۆ ئەم زەویە ڕووتە هێشتا نەببووە باغ، شان بە شانی باوکی تۆ کاری کردو ئارەقەی ڕشت و ماندووببووە، ئەویش دەتوانیّ وەکو براکەی داوای بەشی زیاتر بکات))

وردە وردە دەمەقاڵیان زیادبوو، هەریەکەیان هەوڵیدەدا قسەی خۆی بەڕاست بزانیّ،تازە بۆسەر جاددەی قیرتاو هاتبوون کە دوواجار بەهرام بە بێتاقەتیەوە

سەری باداو بۆ کۆتایی هێنان بەم دەمە دەمە گووتی: ((باشە دەی با ئەم مەسەلەیە هەر وا بمێنێتەوەو چارەسەر نەبێ، تا بزانین لە داهاتوودا چی دێتە پێش)) ئینجا هەناسەیەکی پڕ دەنگی لە سینەی دەرکردو بۆ چەند ساتێك چاوانی داخست،،،شەهروز گووتی: ((بەڵام من پێموایە ئەم گرفتە هەر لێرە چارەسەر دەبێت، کێ دەڵێ کە هەموو باغەکە بەشی من و خانەوادەکەم نیە؟)) بەهرام بە هێواشی گووتی: " ئەوە بەڕاستە، چۆن؟ " دووایی بۆ لای کوڕەمامەکەی گەڕایەوە، بەڵام پێش دیتنی ئەو شتێك چاوەکانی ئازارداو بواری نەبوو بەتەواوی ببینێ کە چیە،،،،

چەند خولەکێك بەسەر بانگی ئێوارەدا تێپەڕیبوو کە بە ئاسایش ڕادەگەیەنرێ ئوتومبیلێکی لەو حاڵەو لەو ڕەنگە لە سەرەتای جاددەی شار سووتاوەو هیچ هەواڵێك لەسەرنشینانیەوە نیە، کارمەندان بێ وەستان بەرەو جێگاکە بەڕێدەکەون، خۆشبەختانە بە گەیشتنی ئەوان و هەوڵی بەردەوامیان ئاگر دەکوژێتەوەو بەشێ لە ئوتومبیلەکەش بەسەلامەتی لە بڵێسە سەرکێش و سووتێنەرەکانی ئاگرەکە دەردەچێت، یەکەمین شتێ کە تێیدا سەرنجیان ڕادەکێشێ، جەستەیەکی نیوە سووتاوی شوفێرێکە کە سەری لەسەر سوکانەکە دانابوو، پاش کوژاندنەوەی ئاگرەکە، تیمێك لە سەرانی دەزگای هۆشیاری بۆ شوێنەکە دەچن و سوود لە پاشماوەی تاوانەکە وەردەگرن و لە درێژەی پشکنینەکان تیغێکی ڕایەخ بڕی بە خوێن سووربوو پاشنەی پێڵاوێك و شووشەیەکی خاڵی کۆلا کە پێدەچوو پڕ لە بەنزین بووبێ لە ئوتومبیلەکە دوورتر کەوتبوو، دەدۆزنەوە، هەرچەندە لەبەر زۆر سووتانی دەم و چاوی شوفێرەکە بەباشی نەدەناسرایەوە، بەڵام ژمارەی ئوتومبیلەکە کۆمەکێکی گەورەمان پێدەکاو دووای پرسیارکردن لە ڕێنمایی شوفێری خاوەنەکەیمان بۆ دەردەکەوێت، کە گەنجێکی بیست و هەشت ساڵەیە بە ناوی بەهرام ـ ب،هاوسەردارەو کارمەندی هونەری یەکێ لە کارگەکانی دەوروبەری شار بووەو ئوتومبیلەکەش هی خۆی بووە، لێکۆڵینەوە لەم لایەنەوە دەست پێدەکات، بە پێی ئەو دەسەڵاتە یاساییەی

هەمانبوو، ئوتومبیلەکەمان بۆ گەراجێك و جەستەی کوژراویشمان بۆ ساردخانەی پزیشکی یاسایی گواستەوە، پزیشکی یاسایی هۆکاری مردنەکەی بۆ برەرێکی نوك تیژ دەگەرێنێتەوە کە لە دڵ و مل و سینەی دراوە، وە بەم ئەنجامەش دەگات کە کوژراو بواری نەبووە هەناسەش هەڵبکێشێ چونکە دەم ودەست مردووە و ئینجا بۆتە خۆراکی ئاگریش، سەرەتا ئەگەری چۆنیەتی رێکەوتی ڕووداوەکەمان بە خەیاڵدا دەهات، بەڵام بە سەرنجدان لە نەبوونی هیچ هۆکارو بەڵگەیەك لەم بارەیەوە گریمانەکەی رەت دەکردەوە، ئەگەری دووەمیان ئاگرگرتنی لەخۆڕای ئوتومبیلەکەبوو بە هۆی نوقسانی هونەرییەوە کە تا رادەیەك مێشکمان ماندوو دەکات، بەڵام بوونی پاشنەی جێماوی پێڵاوێك و هەروەها شووشەیەکی کۆلا کە بۆنی بەنزینی لێدەهات، ئێمەی بەم ئەنجامە دەگەیاند کە ئاگر گرتنی ئوتومبیلەکە ئەنقەست بووەو وادیاربوو کەسێکی دیکە دەستی لە ڕووداوەکەدا هەیە، ڕۆژی دوایی تەرمی بەهرام پاش پشکنینی پزیشکی یاسایی و ئەنجامدانی رێ و شوێنە یاساییەکان بە ناردنی بروانامە بەمەبەستی شاردنەوەی بۆ خانەوادەکەی بەرەو ساردخانە دەگوێزرێتەوە، لەگەڵ ژمارەیەك هاوکارم بۆ ماڵی بەهرام بەرێدەکەوین، کە لە دەرگامان دا دەنگی شادمانەی منداڵێك لە حەوشە زرنگایەوە " وەی گیان، بابە هاتەوە!)) لەگەڵ بیستنی دەنگی کچۆڵەکە زۆر بێتاقەتدەبم و ڕقێکی ئەستوور قورگم دەگرێت،چاوێکم بە ئاسمانی هەوریندا گێڕا کە چاوەڕوانی پەلەپیتکەیەك بوو تا هەموو دڵتەنگیەکانی بە دڵۆپە بارانەکان بکاتە دیاری زەوی، دەبێ حاڵی چۆن بێ کە هەواڵی مردنی باوکی بەم کچۆڵەیە بدەم؟ خۆزگە ئێستا لەجێی من ئەو لە پشت دەرگابوایە تا منداڵەکەی بە دیتنی کامەران بێ و لە باوەشی گەرمی دا ئارام بگرێ، چەند ساتێ دواتر دەرگا کرایەوەو سیمای کچۆڵەیەکی نزیکەی چوار ساڵان لە دیار چاوانی پڕ فرمێسکم دەرکەوت، کچۆڵەکە بە دیتنم لە جێی خۆیەوە حەپەسا و خەندە لەسەر ڕووی نەماو سڵاوی لێکردم و بە زمانێکی شیرینەوە پرسی: " ئیشتان بە کێیە؟ " بە زەحمەت پێکەنیم و ڕووبەڕووی دانیشتم تا باڵامان وەکو یەك بێ، ئینجا گووتم: " سڵاو خانمی

بچکۆلە،ناوت چیە؟ " ئەمیش گووتی: " بەهار! " پێمگووت: " وەی وەی چەند ناوێکی خۆشە! بەهار خان برۆ بە دایکت بڵێ بۆ بەر دەرگا بێت! "

هێشتا بەهار هەر لەبەردەرگابوو کە ژنێکی گەنجی چارشێو بەسەر لەگەڵ کچێکی دیکە کە چەند ساڵێك لە بەهار گەورەتر بوو بۆ بەردەممان هاتن و بە ڕەووشتەوە سڵاوی کرد: " بفەرموو جەنابی ئەفسەر،مەگەر گرفتێك هاتۆتە پێش؟ " وام پێ باشبوو بێ پێشەکی ڕاستیەکە بڵێم، لە کاتێکدا خەیاڵم بە دووای ئەو وشانەدا دەگەڕا کە هێورکەرەوە و تێکەڵ بە دڵنەوایی بێ تاکو ئەو هەواڵە ناخۆشەی پێدەربرم، بێ ئەملاو ئەولاڕاستی ڕووداوەکەم پێگووت: " پێویستە بۆ ساردخانەی پزیشکی یاسایی لەگەڵمان بێن، خوا سەبووریتان بدات" ژنەکە ڕەنگی سپی بوو شەپۆلێك لە ترس و نیگەرانی چاوانی غەمگین و ڕەشی پڕکرد: " جەنابی ئەفسەر چی بووە، چ بەلایێ بەسەر مێردەکەمدا هاتووە؟ بەهرام تووشی کارەساتی ئۆتومبیل بووە؟ توخوا بڵێ بزانم چی ڕوویداوە؟ "

ژنەکە لەسەریەك تکای دەکرد تا قسە بکەم، منیش چاوم لەو دوو کچۆڵە بێگوناهە بڕیبوو کە ترس و تۆقینی دایکیان بۆ ئەوانیش گوازرابۆوە،گووتم: " زۆر بەداخەوەم خانم! مێردەکەت،،،" ژنە هاواریکرد: " یا قەمەری بەنی هاشم! بەهرام،،،بەهرام،،،" لەکاتێکدا بەهارو خوشکەکەی بە ماندانا بانگ دەکرد، دەست لە دەستی یەك دەگریان، خێرا خێرا سواری ئۆتومبیلی پۆلیس بوون و بۆ ساردخانەی پزیشکی یاساییان دەبەین.

لە یەکەم نیگادا باوەڕی نەکرد ئەم تەرمە نیوە سووتاوو خوێناوییە مێردە گەنجەکەی بێت، لەپڕ دەنگی هاوارو قیژەی نەماو مات و حەپەساو لێی ڕامابوو، کاتێ فرمێسکی هاتەخوار، لەناخی دڵەوە قیژاندی و بە نینۆك دەم و چاوی خۆی ڕنیەوە، قوربەسەرە ئاگای لەخۆی نەمابوو تا دوو کەس لە هاوکارانی بەهەر شێوەیەك بوو لە تەرمەکەیان دوورخستەوە، کچەکان دەگریان و دەیانگووت: " بابە گیان! بابە گیان! " دڵی بەردیان دەتواندەوە، منیش لەگەڵ وان دەگریام و بەزەییم بەم منداڵانە دادەهاتەوە، لێکۆڵینەوە لەبارەی بکوژ یا بکوژانی بەهرام بێ

خۆدوواخستن دەست پێدەکات و هەر لەو کاتەدا ئەوە دەستنیشان دەکرێت کە کوژراو لەگەڵ چەند کەسێ لە خزم و ئاشنایانی بەتایبەت کەسانی باوکی بەهۆی میراتەوە ناکۆکیان هەبووە، لە درێژەی توێژینەوەکان بەم ئەنجامە دەگەین کە شەهروز کوڕە مامی بەهرام بووەو هەمیشە هاوڕێیەتی و خزمایەتی خۆی لەگەڵی پاراستووە، بەڵام بەهۆی شەڕی میراتەوە هیچ کاتێ لەگەڵ بەهرام ئەمەی لەبیر نەکردووە تا وردە وردە وایلێهاتووە بووە بە ڕقێکی قووڵ و ئەستوور و چەن ڕۆژێ لەمەوبەر لەگەڵ یەکتریان بینیبوون، لە پرۆسەی توێژینەوەکەدا هیچ شوێنەوارێکم لە بارەی شەهروزەوە لەنێوان خزمانی دا نەدەبینی و بڕیارمدا بەدوایدا بڕۆم، دەرکەوت پاش کوشتنی بەهرام شەهروز هەڵاتبوو، وەك ئەرکی سەرشان و پێویست بۆماڵی شەهروز دەڕۆین، بەڵام خۆی لەوێ نیەو هاوسەرەکەی بە واق وڕماوی وەڵامی پرسیارەکانمان دەداتەوە، وادیاربوو لەو شەوەی شەهروز بەهرامی کوشتبوو بۆ ماڵێ هاتۆتەوەو بێ وەستان و بێ ئەوەی خانەوادەکەی تێبگەن جلەکانی دەگۆڕێ و وا لە هاوسەرەکەشی دەگەیەنێت کە بۆ ئەنجامدانی کارێکی گرنگ ڕوخسەتی لە کارگە وەرگرتووەو بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بۆ ماڵی یەکێ لە هاوڕێیانی دەڕوات، ئیدی لەو ڕۆژەوە بۆ ماڵێ نەگەڕاوەتەوە، تەنها جارێك نەبێ پەیوەندییەکی تەلەفۆنی کورت بۆ ماڵێ دەکاو هەواڵی زوو گەڕانەوەی خۆی پێیاندەدات، بەپێی فەرمانی یاسایی ماڵی شەهروز بە وردی دەپشکنرێ و لە ژێر زەمینەکەیان کارمەندان بەسەرکەوتوویی کراسێکی شین کە پەڵە پەڵەی خوێنی پێوەیە لەگەڵ جووتێ پێڵاوی کۆنە کە پاشنەی یەکێکیان لێبۆتەوە دەدۆزنەوە، بەجۆرێکی شارەزایانە لەژێر گشت کەل و پەلە کۆنەو شتەکانی دیکە لە سووچێکدا شاردرابوونەوە، ئێمەش هەموو ئەم شتانە بۆ بەڕێوەبەرایەتی هۆشیاری دەبەین و پەڵە خوێنە وشکبۆوەکان بۆ دیاریکردنی گرووپی خوێنەکە بەرەو تاقیگا دەنێردرێت، تاقیگای تاوان ڕایدەگەیەنێت گروپی خوێنەکە هەمان گروپی خوێنی بەهرامە، ئەمە شك و گومانی ئێمەی لەبارەی دەست تێدابوونی شەهروز لە ڕووداوی کوشتنی بەهرام کاڵ کردەوەو دڵنیابووینەوە، بەخێرایی تاقمێکی تایبەت

له کارمەندانی پشکنین پێکدێ و تەواوی ئەو شوێنانەی کە ئەگەری لەوێبوونی شەهروزو ڕەتبوونی بەوێدا هەیە وە تەلەفۆنی ماڵەوەشیان لە ژێر چاودێری دادەنرێت، پاش سێ ڕۆژ لەناکاوو لەیەکێ لە نیوە شەوەکانی پاییز زەنگی تەلەفۆنی ماڵی شەهروز لێدەدات،کاتێ هاوسەرەکەی بە ترس و لەرزەوە تەلەفۆن هەڵدەگرێت، دەنگی شەهروز لەلایەکی دیکەی هێڵەکەوە بەر گوێ دەکەوێ کە هەواڵی دوو کوڕەکەی دەپرسێت ئەمە جگە لەوەی بە پرسیارگەلێك هاوسەری بێزار دەکات و ئینجا تەلەفۆن دادەخاتەوە، بەلأم هەر ئەو پەیوەندییە کورتە سەرە داوێ لە شوێنی خۆ بزرکردنی بەدەستەوە دەداو هەر ئەو شەوە گروپێکی تایبەتی پۆلیس بەرەو شوێنی مەبەست ڕۆیشتن و لە هەوڵێکی دەسەوبەجێدا شەهروز لە خانوویەکی گڵ و کای کۆنە و بێ ئاگا لەخۆی دەستگیر دەکەن، تویژینەوە لەگەڵ شەهروز زۆر بەپەلە دەست پێدەکات، لە سەرەتادا بەتوڕەییەوە نکوڵی لە دەست تێدابوونی کوشتنی کوڕەمامەکەی دەکردەوەو وای پیشانیش دەدا هیچ زانیارییەکی لە بارەی بکوژانەوە نیە،بە پیشاندانی جلە خوێناوییەکان و پێڵاوی بێ پاژنە کە لەماڵەکەیمان دۆزیبووەوە دانی بە تاوانەکەی دانا:

((بەڵێ من بەهرامم کوشت، بەلأم خوا ئاگادارە نەمدەویست ئیشەکە وای لێبێت، شەڕوناکۆکی بەینی من و بەهرام باوکمان بوون،مەسەلەی موڵك و میراتی چەندین ساڵەی پێش ئێستا، ئاغاجانی ئێمە واتە باپیرە گەورەی باوکی من و بەهرام لە ڕۆژانی دوایی تەمەنی، شەوێکیان هەموو منداڵەکانی بۆ دابەشکردنی میرات بانگهێشت کردووەو بەشی میراتگری هەر یەکێکیانی لەبەرچاوی ئەوانی دیکە ڕادەگەیەنێ تا ئەو کاتەی سەرەی باوکی من و باوکی بەهرام دێت کە تەنها کوڕانی ئاغاجان بوون، ئاغاجان سەرەڕای دیاریکردنی بەشە میراتی هەردووکیان، باغێك کە سەردەمێ بوو زەوییەکی وشك وخاڵی بوو بە هەوڵ و ماندووبوونی باوکم و مامم ئاوەدان ببۆوە، بەجۆرێکی یەکسان بەسەریاندا دابەش دەکات، بەلأم مامم (باوکی بەهرام) بەو بیانووەی کە ئەو زەحمەتی زیاتری بۆ باغەکە کێشاوە بۆیە شیاوی بەشی زۆرترە، ئەم بەشکردنە قبوڵناکا، باوکی منیش کە بارودۆخەکە بە

زیانی خۆی دەبینێ، ئەمیش داوای خێرو بێرو سوودی خۆی دووبارە کردۆتەوەو ناکۆکی نێوانیان هەر لەو کاتەوە سەرچاوەی گرتووە، بەلاَم بۆ باشکردنی مەسەلەکە وابڕیاربوو لە دەرفەتێکی گونجاودا بە ئامادەبوونی باوکم و مامم ئاغاجان ئەم گرفتە چارەسەر بکات، بەلاَم بە مردنی لەناکاوی شەوێکی ئاغاجان ئەم مەسەلەیە هەر وا دەمێنێتەوە، بۆیەش ئەم ناکۆکیە تاکو ئێستا لەنێوان ئەم دوو برایە هەر بەردەوامەو ناوبژێکردنی ڕیش سپیەکانی خانەوادەو دۆست و ئاشنایانیش لەم مەسەلەیە بێ ئەنجام بووە،بە درێژایی ئەم سالاَنە باوکم ئەم مەسەلەیەی وەها لەمە گەیاندبوو کە پێمان وابوو بەڕاستی هەق بەوە لە دواییدا، کاتێ من و بەهرام وەکو کوڕانی گەورەی هەردوو خانەوادە بۆ گفتوگۆ پێکەوە دانیشتین، هەریەکەمان قسەکانی باوکمان دووبارە دەکردەوە و زیاتر بەرەو ئاقاری ناکۆکی دەچووین،ئەو ڕۆژە ترسناکە هەرگیز لەبیر ناکەم، خەریکبوو لە سەردانی باغەکە دەگەڕاینەوە کە سەری قسەمان لەبارەی بەشکردنی باغەکە کردەوە، بەلاَم من لەم بارودۆخە تەواو ماندوو ببووم، بڕیارمدا بەهەرجۆرێ بێ وایلێبکەم بەقسەکانم ڕازی بێ، هەربۆیە لەوپەڕی تووڕەبوون لەخۆڕا تەماشای نێو داشبولەکەم دەکرد کە چاوم بە بڕەرێکی ڕایەخ بڕی کەوت، هەلَمگرت و هەڕەشەم پێ لە بەهرام کرد تا هەرچی زووترە و لەنێو ئەم ئوتومبیلە دەبێ چارەسەری ئەم مەسەلەیە بکەین ئەگینا دەتکوژم! خوا دەزانێ لەو ساتەدا تەنها دەمویست بیترسێنم و ناچاریکەم بەزۆر تا بەقسەکانم ڕازی بێت،هەتا بیرۆکەی کوشتنیش منی دەلەرزاند، لەڕاستیدا بەهرام باوەڕی نەدەکرد من دەست لەکاری وەها بدەم، بۆیە سەرەتا بە حەپەساوییەوە لە تیغەکەی نێو دەستم ڕاماو ئوتومبیلەکەی ڕاگرت و ئینجا بەبێ تۆزقالێك ترس و بێبایەخانەوە گووتی: دەتەوێ گرفتەکەمان بەم جۆرە چارەسەر بکەین؟ ئەگەر دەوێری لێمدە، بەلاَم من هەرگیز مەبەستی لێدانم نەبوو،کاتێ بەهرام منی بە دوودلَیەوە بینی، گالَتەی پێکردم و قسەی وای پێوتم کە ورووژاندمی و ناچاریکردم، لەساتێکدا خوێن بەری چاوانی گرتم و بەتەواوی توانامەوە تیغەکەم لە دلَی دا، هاوارو نالَەی منی ڕاچلَەکاند، لە کاتێکدا ئەو

دەستی لەسەر برینی دڵی دانابوو کە خوێن فیچقەی دەکرد تێیدا و لەتاو ئازار تلی دەدا، بەچاوانی کەم پڕشنگی تەماشایەکی کردم و بە ئەفسوس و دەنگێکی پـــچڕاوەوە گـــــووتی: "زۆر،،،زۆر هەڵـــەت کرد،،،شــــەهروز! خـــوا لێــــت خۆشنابێ،،منداڵەکانمت،،،،هەتیوکرد! ئینجا کۆکەیەکی کردو خوێن لە دەمیەوە هاتەدەر،" گەلێك ترسابووم، بۆنی خوێن لەسینەی بەهرامەوە دەهات و نێو ئوتومبیلەکەی پڕکردبوو حاڵی تێکدەدام، بەهرام هەر وا ئازاری دەچەشت و خەریکبوو هەناسەبڕکە دەبوو،ئەوەندە ترساوو بێتاقەت ببووم تەنانەت هێزی بیرکردنەوەو بڕیاردانیشم نەبوو بەلام،،،،،،

لەناکاو بیرۆکەیەك بەخەیاڵمدا هات، ئەگەر بەهرام نەمرێت هەڵبەتە ئەم ڕووداوە بۆ هەمووان بەتایبەتی خانەوادەکەی باسدەکات و ئیدی ئابڕوو شەرەفم دەچێت، لەلایەکی دیکەوە بەمردنی بەهرام مەسەلەی باغەکە ئاسانتر یەکلایی دەبۆوە، چەند باش بوو هەموو باغەکە بۆ من دەمایەوە و لەمەش چاتر نەبوو،،،،،

لەکاتێ کە بەهرام دووا هەناسەکانی هەڵدەکێشا و بە دەنگێکی کزەوە ناوی " بەهار " و " ماندانا" ی دێنا،تیغە خوێناوییەکەم خێرا هەلگرتەوەو لەسەریەك دەستم بە لێدانی جەستەی بێهێزی کرد تا بەیەکجاری هەناسەی نەما، سەری کەوتە سەر سوکانەکەو جووڵەی نەما، بۆ چەند ساتێك بە حەپەساوییەوە تەماشای بەهرام و تیغی خوێناویم کردو هێشتا لەو کارەی ئەنجامم دابوو باوەڕم نەدەکرد، بەلام کاتێ هاتمەوە هۆش خۆم بە دڵەکوتێوە ئەم ناوەم بەسەرکردەوە، جاددە لەو کاتی ئێوارەیە چۆڵەوانیەکی دلگیری هەبوو، بڕیارمدا پلانەکەم تەواوبکەم، خێرا دابەزیم و بە کەمێك بەنزین و چەرخەکەم ئاگرم لە ئوتومبیلەکە بەردا و کشامەوە دوواوە، بەلام هێندە بزێو بووم تا پاشنەی یەکێ لە پێلاوەکانم لە داوێنی جاددە گیربوو لێبۆوە،منیش بەپەلە بەسەر ئەو قیرەدا ڕۆیشتم و لەتاو ئازار دەمنالاند، بەلام چونکە ئەگەری ئەوەم دانابوو یەکێك بەدیارکەوێ، بێ ئەوەی سەرنجی برینەکانی دەموچاوم بدەم بەرەو باغ و کێڵگەکان ڕامکردو بەهەر دەردەسەرییەك بوو بە پێیان خۆم گەیاندەوە ماڵێ، دنیا تەواو تاریك ببوو ژن و

منداڵانم لە ژوورەوە بوون و کەس لە حەوشە نەبوو، بەپەلە بۆ ژێر زەمین ڕۆیشتم و جلەکانم گۆڕی و دەست و دەموچاوم شووشت و بە درۆ بە هاوسەرەکەم گووت کە بۆ ئەنجامدانی کارێکی گرنگ دەبێ چەند ڕۆژێ لەشار دوورکەومەوە، ئەوەی ماوەش خۆتان دەیزانن،،،،)) شەهروز هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێ و بێدەنگ دەبێ، ئاهێك هەڵدەکێشم و پێی دەڵێم: " بەهرام ڕاستی کرد کاك شەهروز! هەڵەیەکی ئێجگار گەورەت کرد! جەرگی خانەوادەکەیت سووتاند، ڕق و کینەی هەردوولات قووڵتر کردەوە، لە هەمووشی بەژانتر خێزان ومنداڵانی خۆت لە بەخشینی سێبەری باوکایەتی بێبەشکرد، بەداخەوە کە نەتتوانی بەسەر حەزی ناخت دا زاڵ بی، شەهروز، کە دوو دڵۆپە فرمێسك لە گۆشەی چاوانیدا دەبریسکایەوە دەیسرێت و بە بێدەنگی چاو لە ئاسمانی خۆڵەمێشی پاییزو پۆلێکی ڕەشپۆشی پەڕەسێلکەکان و ئاوازی غەمگینیان دەبڕێت و دیسان ئاهێکی پەشیمانی هەڵدەکێشێتەوە کۆرپەیەك کە بووە قوربانی دەست کورتی هێشتا دوو هەفتەی بۆ کۆتایی ساڵی کۆن و هەڵاتنی خۆری نەورۆز مابوو، بەڵام بۆنی خۆشی بەهار لە کۆڵان و شەقام و ماڵاندا یاری بە هەستەکانی مرۆڤ دەکرد، لە پشت پەنجەرەی ژوورەکەم لە بەڕێوەبەرێتی هۆشیاری وەستابووم کە لە دەرگایانداو یەکێ لە کارمەندان گووتی: " خانمێك لە دەرەوە وەستاوەو ئیشی بە جەنابتانە، وادیارە دەیەوێ شتێکی گرینگ بڵێ،" لەکاتێ کە سەرگەرمی تەماشای ئاسمانی شین و ساف بووم، گووتم بابێتە ژوورەوەو لە پشت مێزەکەم دانیشتمەوە، زۆری نەبرد ژنێکی کامڵ هاتە ژوورو بەپەلە بۆ لام هات و بە دەنگێکی پچڕاوەوە گووتی: " سلاو کوڕم، ئای وای لەم خەڵکە بێ بەزەییە! ئەوە چ سەردەم و زەمانێکە! ئاخر چ مرۆڤێکی عاقڵ دێت و منداڵەکەی فڕێدەداتە ناو ئاوو بێ ئەوەی لەخواش بترسێ بەجێی بێڵێت؟!،،،"

ژنی قوڕبەسەر وەها پەشۆکاوو گەرمداهاتبوو هەر دەیگووت و دەیگووتەوە تا هەناسەبڕکە بوو، منیش ئارامم کردەوەو پەرداخە ئاوێکم پێداو بەڕوویەکی خۆشەوە داوام لێکرد دوور لە بێتاقەتی وبێزاری هەرچی دیتوویەتی یا بیستوویەتی

بۆم بگێڕێتەوە، ئینجا ئاوەکەی خواردەوەو دەستی بە زۆر بلێی کردەوە: " ئەمڕۆ کە هەوا پاش هەفتەیەك بەفروباران خۆش ببوو بڕیارمدا بۆ شت کڕین بڕۆم، لە ڕێگای گەڕانەوەی سەر شەقام کە ماڵەکەم لەوێیە، دیقەتی شتێکم لەناو جۆبیارێکدا کە هەر بە مەلۆتکەی منداڵان دەچوو، سەرەتا وامزانی چاوم ڕەشکەو پێشکەی کردووە، بەڵام کاتێ بۆ پێشەوە چووم و بە سەرنجی باشترەوە تەماشام کرد دیتم کۆرپەیەکی بێگوناه کە پێدەچوو هەفتەیەك نەبووبێ لە دایك بووە، پێشی ڕەوتی ئاوەکەی گرتووە، هەڵبەتە ئاوەکە ئەوەندە زۆریش نەبوو کەچی منداڵە بەخت ڕەشەکەی دەست بەجێ خنکاندبوو، منیش دەم و دەست بۆ دوکانەکانی ئەم ناوە ڕۆیشتم و مەسەلەکەم تێگەیاندن و ئومێدەوار بووم کۆمەکم بکەن، هەموویان گوتیان دێین تاکو بە هاوکاری هەموومان تەرمی ئەم منداڵە بێگوناهە بۆ خانەوادەکەی بنێرینەوە، خەڵکی چەندە دڵیان ڕەق بووە،،،،"

ناونیشانی شەقامەکەم لێوەرگرت و لەگەڵ چەند کەسێك لە کارمەندان بەرەو شوێنەکە ڕۆیشتین، ئەو ژنە میهرەبانەش بۆ ڕێنمایی و تێگەیشتن لە ئەنجامی مەسەلەکە لەگەڵمان هات، کاتێ بە شوێنی مەبەست گەیشتین و بە سۆراغی تەرمی منداڵەکەوە چووین، لە نیگای یەکەمدا سەرنجی شین هەڵگەڕاوی دەم و چاوو خنکانیمدا لە ئاودا، ئینجا دووای ڕاپۆرت نووسین و ئەنجامدانی قۆناغە یاساییەکان و قسەی کەسانی شایەتحاڵ، جەستەی کۆرپەکەمان بۆ پشکنین و دووابیش پزیشکی یاسایی نارد، ژنەکە زۆر پێداگری لەسەر ئەوە کرد کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانمان ئاگاداری بکەینەوە، هەتا ژمارە تەلەفۆنی ماڵەکەشیانی پێداین و منیش بەڵێنم پێدا لە چۆنیەتی ڕووداوەکە ئاگاداری بکەمەوە، پزیشکی یاسایی دووای پشکنینی تەرمەکە ڕایگەیاند کۆرپەکە تەنها سێ ڕۆژ تەمەنی بووە و هۆکاری مردنەکەشی لەئاودا خنکاوە، هەوڵی پێویست بۆ ناسینی خزم و کەسانی نزیکی منداڵەکە درا و کارمەندان بەهۆی گیرەی ناوکی کۆرپەکە بۆ ناسینەوەی دایك و باوکی پەیوەندییان بەچەند نەخۆشخانەیەکەوە کرد، بەڵام بە ئەنجام نەگەیشتن، لەم کێشەو بێشەیەدا ڕۆژێك تەلەفۆنێکیان بۆ شوێنی کارەکەم کرد،

کاتێ وەڵامم دایەوە دەنگی پڕ وزەو توانای ژنێکم بەرگوێ کەوت: " سڵاو کوڕم! منت لەبیر ماوە؟ توانیتان دایك و باوکی بێ بەزەیی ئەو ساوایە بدۆزنەوە؟ " زۆر زوو دەنگی ژنە کامڵەکەم ناسیەوەو دووای سڵاوو هەواڵپرسی لەکاتێ هێشتا لەو خەیاڵەدابووم کە ئەو چۆن ژمارەی شوێنی کارەکەمی دەستکەوتووە، بە نائومێدییەوە گووتم: " بەداخەوە بەهیچ ئەنجامێك نەگەیشتین،،،" ژنەکە بە خۆشحاڵیەوە گووتی: " ئاساییە کوڕەکەم، دوێنێ بەیانی کە لەگەڵ ژنانی دراوسێمان دانیشتبووم و لەهەر دەرگایەکمان دەدا، یادی ئەو ڕووداوەم دەکەوتەوە بیر و مەسەلەکەم بۆ گێڕانەوە، یەکێ لە ژنەکان گووتی کە برازایەکی تازە بووەتە خاوەنی کوڕێك، پاش لە نەخۆشخانە دەرچوونی بۆی باسکردووە لە نەخۆشخانەدا یەکێ لە ژنەکان وەك بڵێی لە هاتنە دنیای منداڵەکەی خۆشحاڵ نەبووەو هەمیشە لەگەڵ چواردەورو پەرستارانی بەشەکە شەڕو هەرای کردووەو تەنانەت ئامادەنەبووە شیریش بە کۆرپەکەی بدات، بەکورتی کاتێ برازای ژنەکەی دراوسێمان هۆکاری ئەو نیگەرانی و پێناخۆشبوونەی لێ پرسیوە، زۆر بێ ڕەووشتانە گووتویەتی ئەمە پەیوەندی بەتۆوە نیە، بەڵام چەند خولەکێ دووای ئەوە داوای لێبوردنی کردووە و گووتویەتی چونکە خاوەنی پێنج منداڵی دیکەشم تاقەتی منداڵ بەخێوکردنم نیەو بڕو بیانووی لەم جۆرانە،،،،،دوواجار مشتەکۆڵەیەکی توندی بەسەری کۆرپە بێگوناهەکەی داکێشاوەو گووتویەتی دەتکوژم تا لەشەڕت ڕزگارم بێت،،،"

لە دەنگی گەرم و سەرنجڕاکێشی ژنەکە پێکەنینم گرتبوو، بەڵام خاڵێکی گرنگم لە ماوەی قسەکانیدا بۆ ئاشکرابوو، ئێجگار خرۆشابووم و پێش ئەوەی ژنەکە قسەکانی تەواوبکات، داوام لێکرد برازای ژنەکەی دراوسێیانیم پێ بناسێنێ و بە وردی ناونیشانەکەم بداتێ، ئەویش بە دڵێکی فراوانەوە ڕازی بوو، بە هاوکاری گەرم و گوڕی ئەم ژنە کامڵە و بەدوواداچوون و توێژینەوەکان، بەرپرسی گەورەی دایکان و بەشی منداڵبوونی ئەو نەخۆشخانەی مەبەستم بوو پێی گووتم کە گیرەی ناوکی کۆرپە خنکاوەکەی لێبوو، بێ وەستان ڕێ و شوێنی یاساییمان بۆ

وەرگرتنی ناونیشانی چەند منداڵێك كە هەفتەی پێشوو لەو نەخۆشخانەیە لەدایك ببوون گرتەبەر، كارەكانی دیكەش كارمەندان زۆر بەباشی ئەنجامیانداو پەیوەندیان بە یەكە یەكەی ناونیشانەكانی وەرمانگرتبوون كردبوو تا لە دوواجاردا لە یەكێ لە گەڕەكە هەژارنشینەكانی باشووری شار پەردە لەسەر نهێنی ڕووداوەكە لابرا، كاتێ پەیوەندیمان بەوێوە كرد هیچ هەواڵێ لەبارەی باوكی كوڕیەكەوە نەبوو، داوامان لە كچێكی تازە پێگەیشتووكرد بانگی دایكی بكات كە بە ترس و لەرزەوە تەماشای دەكردین، چەند ساتێ دوواتر ژنێكی لەڕولاوازو ڕەنگ پەڕیو كە خۆی بە چارشێوێكی پینەدارو سپی بۆوە داپۆشیبوو، بۆ بەر دەرگا هات و لە پشتەوەش نیوە ڕووی سێ منداڵی پەشۆكاو دەركەوتن كە لە گۆشەو كەنارەوە بە دزییەوە لێمان ڕامابوون، دووای ئەوەی پێمگووت لەبەرچی بۆ ئێرە هاتووم و داوام لێكرد منداڵەكانیم پێ بناسێنێ، ڕەنگی تێكچوو، چاوانی تەڕ بوون و بە زەحمەت گووتی: " بەداخەوە منداڵێكم چەند ڕۆژێ بەرلە ئێستا بە نەخۆشی مردو مێردەكەم هەڵیگرت و بێ ئەوەی من و منداڵانم ئاگامان لێبێ لە جێگایەك شاردوویەتیەوە" جارێكی دیكە بەڵگەی لێكۆڵینەوەكەم خوێندەوەو ڕووم لە ژنەكە كردو گووتم: " بەڵام كارمەندانی بەشی لەدایكبوونی نەخۆشخانە سەلامەت بوونی كوڕیەكەی ئێوەیان بە ئێمە گووتوە، باشە چۆن دەبێ هەر لەو چەند ڕۆژە وا نەخۆشیەكی ناچاری تووش بووبێ و دەسبەجێش مردبێ؟! " ژنەكە نیگایەكی كلۆڵی لێدزیم و سەری داگرت و بەتوندی گووتی: " بەهەر شێوەیەك بێ من ئێستاكە منداڵم نیە تا پیشانتانی بدەم، ئێستاش داواتان لێدەكەم تا مێردەكەم نەگەڕاوەتەوە و چەقەو هەرای نەناوەتەوە لێرە بڕۆن! "

بە هێمنی و ڕەووشتەوە گووتم: " بەڵام ئێوە دووای لەدایكبوونی كوڕیەكەتان هەمیشە ئازارتانداوەو هەتا لەبەرچاوی هەمووانیش لە نەخۆشخانە هەڕەشەت كردووە تا لەناوی ببەن و،،،،منیش بۆ سەلماندنی قسەكانم شاهیدی ڕاستەقینەم هەیە،" ئینجا چەند هەنگاوێ لە ژنەكە دوورتر لەنێو ئوتومبیلی پۆلیس ژنە شایەتحاڵەكە بەمنداڵەوە چاوەڕوان بوو؛ داوام كرد بێتە ئێرە، كاتێ ژنەكە هاتە

پێش سەرنجی ترس و نیگەرانیەکی زۆرم لە ڕوخسارو نیگای ئەودا خوێندەوە، ژنە گەنجەکە دووای چەند ساتێ بە دڵنیاییەوە گووتی: " جەنابی پۆلیس خۆیەتی! هەر ئەم ژنەبوو کە بەدڕەفتاری لەگەڵ کۆرپەکەی دەکردو دەیویست ئەو ساوا بێگوناهە بکوژێت! " ڕووم لە ژنەکە کرد کە خەریکبوو دەلەرزی ئینجا لێم پرسی: " هێشتاکەش ناتەوێ پێمان بڵێی کە چ بەلأیەکت بەسەر منداڵەکەت هێناوە؟! " ژنەکە دەموچاوی لەنێوان دەستە ڕەق و تەقەکانی شاردەوەو لەبەردەرگا کەوتە سەر ئەژنۆو فرمێسکی هاتنە خوارو بەناڵەوە گووتی: " بەخوا نەمدەویست ئەمە بەسەر جگەرگۆشەکەم بێنم، هەر لەو ڕۆژەی هەواڵی دووگیانیەکەم بە ڕەزای مێردم گووت، ئیدی ئەو زۆر بەتوندی ڕووبەڕووم بۆوەو بەرپەچی دامەوە و بێ ئەوەی ساتێکیش ڕابمێنێ ڕایگەیاند کە بەهیچ شێوەیەك ناتوانم خەرجی منداڵی شەشەم بدەم و هەر ئەو پێنج منداڵە بۆ حەوت پشتم بەسە، هەڵبەتە ڕاستی دەکرد چونکە گەشتیار دەگوازێتەوە، لە ماوەی ئەم دوانزە ساڵە تاکو ئێستا پێنج منداڵمان بووە، ئەمیش بۆ پەیداکردنی پارووە نانێك هەر لە بەیانیەوە تا شەو ڕادەکات و زەحمەتی دەکێشێ و نایەڵێ هەژاری و دەست کورتیمان پێوە دیاربێ، کاتێ دیتم ئەو پێی خۆشنیە بڕیارمدا لەبارخۆمی ببەم، بەلأم دەتگووت لەچارەنووسی وادیاربوو کە بە سەلامەتی بێتە دنیاوە، کوڕێکی ساغ و سەلامەت و جوانکیلە، بەلأم هەر لەیەکەم ڕۆژەوە ڕەزا هەڕەشەی لێکردم، ئەگەر بە منداڵەوە بێتەوە ماڵێ ڕێگات پێنادەم و لێك جیادەبینەوە، ئەم قسەیەی ئەو زۆر ترساندمی هەر بۆیە لەیەکەم ڕۆژەوە بەرامبەر کۆرپەکەم توند بووم و لێی بێزاربووم، هەڵبەتە ئەمە کرۆکی مەسەلەکە بوو، من دایکم کام دایك ئامادەیە ستەم لە جگەرگۆشەکەی بکات؟! ئەوکاتانە من هۆش و مێشکم لەسەرخۆم نەدەما  کە منداڵەکە برسی دەبوو دەگریا، چەند مشتەکۆڵەیەکم پێدا دەکێشا و پەرستارەکان ئەم ڕەفتارانەی منیان بۆ حاڵەتێکی دەروونی و بێزاری کاتی منداڵبوون دەگەڕاندەوە، تا ئەو کاتەی چاکبوومەوەو لەگەڵ ڕەزا لە نەخۆشخانەوە بۆ ماڵێ بەڕێکەوتین، مێردەکەم دووبارە دەستی کردەوە بە لۆمەکردن و بەدڕەووشتی و هەڕەشەو،،،،منیش لەم

چەند ڕۆژەدا لە خەیاڵێکی ئازاردەرو نێوانی دوو ڕێگا مابوومەوە و چیدی نەمتوانی بەرگە بگرم، لەپڕحاڵەتێکی شێتانەم هاتە سەرو بۆخۆشم نەمزانی چیدەکەم، بەسەر ڕەزادا هاوارم کرد، هەرلێرەدا جێم بێڵە! ڕەزا گێژو وێژ ببوو، بە شك و گومانەوە گووتی: " دەتەوێ بەم شەوە بۆ کوێ بڕۆی؟! دیسان بە تورەییەکی زیاترەوە هاوارم کرد: پێم گووتی هەر لێرە جێم بێڵە ئەگینا منداڵەکەت بۆسەر جاددە فرێدەدەم تا دەسبەجێ بمرێ! مێردی قوڕبەسەریشم ترساو وەستا، لە ئوتومبیلەکە دابەزیم و لەناکاو سەرنجی جۆگە ئاوێکم دا کە دوو هەنگاو لەولاتربوو، بەپەلەو بێ دوواکەوتن بەرەو لای ئاوەکە چووم و مەلۆتکەکەم لەناودانا، لەکاتێکدا دووا نیگا خەماوییەکانم لە ڕوخساری ئارامی ساوا نووستووەکەم دەکردو دڵیشم لەتاوا دەگووشرا، بۆ لای ئوتومبیلەکە گەڕامەوە، بەدرێژایی ڕێگا تا گەیشتمەوە ماڵێ هەر دەگریام و ڕەزاش لە بێدەنگیەکی ئازاردەر چووبووە قووڵایی بیرکردنەوەوە، هیچ کامێکمان قسەمان نەدەکرد، بەڵام دەمزانی کە هەردووکمان لەم کارە زۆر پەشیمان بووین، ئەو شەوە تا بەیانی مێردەزمەم دیت، بەیانی ڕۆژی دووایی داوام لە ڕەزا کرد سەرێك لە کۆرپەکەمان بدات و ئەگەر هەر وا بە زیندوویی مابۆوە بۆم بێنێتەوە، ڕەزاش چاوەڕوانی داخوازییەکی وەهابوو، زۆر تامەزرۆیانە بەسۆراغیەوە چوو، بەڵام بەدەستانی خاڵی و چاوانی پڕ فرمێسکەوە گەڕایەوەو گووتی " لەوێ نەماوە، هەر دەتگووت دنیایان بەسەرمدا کاول کردووە، قیژاندم و گریام، سەروچاوی خۆم ڕنیەوەو لەسەر یەك فرمێسکم هەڵدەڕشت، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو، پاش چەند ڕۆژێ ڕەزا گووتی کە کارمەندانی پۆلیس بەدووای مەسەلەکەدا چوونەو پرسیاریان لە خەڵك و پیشەوەرانی وێ کردووە ئەویش بینیویەتی و تێگەیشتووە کە منداڵی نازەنینمان بەهۆی ڕەوتی بەردەوامی ئاوەکە خنکاوە، جەنابی ئەفسەر! ئەگەر داوای بەڵگەی ئەم کارە شێتانەیەم لێدەکەی، تەنها دەتوانم بڵێم دەست کورتی و بەدبەختی و نەداری بووە کە بڕیارێکی وەهای بە من و مێردەکەم داوە، ئێستاش هەردووکمان پەشیمانین بەڵام چ سوودێکی هەیە خۆ تازە کۆرپەی جوانمان زیندوونابێتەوە، ئێمە بەڵێنمان بەخوای

خۆمانداوه ئەگەر جارێکی دیکه ببینەوه خاوەن منداڵێکی دیکه له ڕۆحمان زیاتر خۆشبوێت و بۆ پەروەردەو بەخێوکردنی باشترین شێوه هەڵبژێرین،" سوهەیلای تەمەن سی وپێنج ساڵه که سیمای غەمگینی دڵشکاوتر پیشانی دەدا بێدەنگ بوو، دۆسیەی مەرگی کۆرپەی بێگوناه تەواوبوو سوهەیلاو ڕەزاش بۆ لێکۆڵینەوەی یاسایی نێردران و منیش به بێدەنگی له پەنجەرەی ژوورەکەم گوێم بۆ دەنگی پێی بەهار له کۆڵان و شەقام هەڵخستبوو، بێ ئارامانه چاوەڕوانی هاتنی ئەو ژنه کامڵ و میهرەبانه بووم تاکو له دۆسیەی منداڵه ساواکه که بەرەو بەهەشت فڕیبوو، ئاگاداری بکەمەوه، لەوانەیه ئێستا قسه گەرم و گوڕەکانی ئەم دایکه دڵسۆزه زیاد لەهەر شتێکی دیکه هێمنم بکاتەوه،ئەو قسانەی که بۆنی ورۆژانی عەشق به ژیان دەبەخشن .

# عەشقێك كە باڵای لە ئاگر بوو

لەیەکێ لە ڕۆژە هەورین و تەماوییەکانی پاییز، لەسەر دەستی خەڵکانی لادێی نزیکی شار هەواڵ بە ئاسایش درابوو کە بەهۆی دزەی گازو ڕوودانی تەقینەوەیەکی تاڕاددەیەك بەهێز،کوڕە گەورەی خانەوادەیەکی کوشتووەو کارەساتێکی بەژان قەوماوە، بێ دوواکەوتن لەگەڵ تاقمێ لە کارمەندان بەرەو ناونیشانەکەی مەبەستمان بوو بەڕێکەوتین، خەڵکی لادێکە لەبەردەم شوێنی ڕووداوەکە کۆببوونەوە کە خانوویەکی خۆش و قەشەنگ بوو، لەبارەی تەقینەوەکەوە قسەیان دەکرد، تەواوی شووشەکانی دەرگاو دیواری ماڵەکە شکاوو ڕەش و دووکەڵاوی ببوون، بە زەحمەت بەناو خەڵکەکەدا تێپەڕین و کەوتینە توێژینەوە لە دیمەنی تاوانەکە، تا ئەوکاتەی یەکێ لە خەڵکەکە خاوەن ماڵی بە ئێمە ناساند، کە پیاوێکی قەڵەوو نزیکەی شەست و پێنج ساڵ بوو لە سووچێکدا کەوتبوو دەگریا،چەند کەسێکیش بە دەورییەوە بوون و دڵنەوایيان دەکرد و هەوڵیاندەدا ئارامی بکەنەوە، بەڵام پیرەمێرد بەسەرو چاوی خۆیدا دەکێشاو سات بە سات بێ ئۆقرەتر دەبوو، کاتێ دیتم قسەکردن لەگەڵی بێ سوودەو هێزی تێدانیە، بە دووای یەکێکی دیکەدا گەڕام و توانیم لەگەڵ فەرەیدونی زاوای گەورەی خانەوادە کە پیاوێکی نزیکەی چل ساڵەی بە ڕوکەش لەسەرەخۆ بوو ئاشنابم، کارمەندی بانق بوو سێزدە ساڵ بوو ببووە ئەندامێ لەخانەوادەکە، لەگشت ئەندامانی دیکەی خانەوادەکە زیاتر ئارام و لەسەرەخۆتر پیشانی دەدا و ئامادەبوو هەر زانیارییەك کە پێویستمان بێ بۆمان ڕوونبکاتەوە .

- ئەوەی ڕاستی بێ من دوواهەمین کەسم لە ڕووداوەکە ئاگاداربوومەتەوە، ئەمڕۆ هاوسەرەکەم بۆ دیتنی دایکی هاتبوو، بە گریان و لاڵانەوە بۆی گێڕامەوە کە نزیکەی کاتژمێر یانزەی پێش نیوەڕۆ دەنگی تەقینەوەیەکی بەهێز لە چێشتخانە بڵندبووەو سەرەڕای کاولکردنی ماڵەکە، بەداخەوە بووەتە هۆی مردنی فرامرز، برای هاوسەرم کە هەر بیست و یەك ساڵ دەبێ و ئەو وەختە لە چێشتخانەکە بووە، هەڵبەتە گومانی ئێمە لەم ڕووداوە تاڵە ئەوەیە کە هۆکەی بۆ دزەی گازو

ئەگەری داگیرساندنی کارەبای چیشتخانە دەگەڕێنینەوە، کاتێ پرسیارم لە نەبوونی تەرمی فرامرز لە شوێنی ڕووداوەکە کرد،فەرەیدون وەڵامی دامەوە:

- یەکەمین کارێ کە دراوسێکان کردیان گواستنەوەی ئەو بوو بۆ نەخۆشخانە، بەو ئومێدەی نەمرێت، بەڵام بەداخەوە هەر لەسەرەتای ڕووداوەکە پزیشکان ڕایانگەیاندووە لەکاتی تەقینەوەکە فرامرز دەسبەجێ گیانی لەدەستداوە، لەم بەینەدا دەنگی هاوارو قیژەیەکی بەرز لە ئاسمانی قەرەباڵغی پڕ دەنگە دەنگی ماڵەکە سەرنجی ڕاکێشام، منیش بۆ دۆزینەوەی خاوەنی دەنگەکە بەرەو حەوشە ڕۆیشتم، کچێکی گەنجم لەتەنیشت پیاوێکی گەنجەوە دیت کە هەوڵیدەدا هێمنی بکاتەوە، تلی دەدا و جەرگبڕانە دەیقیژاند و دەموچاوی خۆی دەڕنیەوە، منیش لە بارەیەوە پرسیارم لە فەرەیدون کرد و ئەمیش گووتی:

- شەهلا، کچی سێیەمی خانەوادەیە و بچووکترین خوشکی هاوسەرمە کە تازە شووی کردووە و لەگەڵ مێردەکەی کە ئەو پیاوە گەنجەیە بۆ شار ڕۆیشتوون، هەر لەو کاتەدا کارمەندێ بۆ پێشەوە هات و ئەو زانیاریانەی کە بەدەستی هێنابوو پێی گووتم:

- جەنابی ئەفسەر! ئەوەی ئێمە لە ڕەوتی توێژینەوەکە بەدەستمان هێناوە، گشتی پارچە تەلێکی کارەبا و چەند ساچمەیەك و لەتە پلاستیکێکی نیوە سووتاوو برێك زەڕوەرەقە کە پێدەچێ هیچ پەیوەندییەکی بە ڕووداوی تەقینەوەکەوە نەبێ وە لەلایەکی دیکەوە توێژینەوەکانمان ئەوە پیشاندەدەن کە دوگمەی ئاگر و گازەکە لە کاتی ڕووداوەکە بەتەواوی داخراون و پێناچێ هیچ دزەکردنێکی گاز لە ئارادابووبێ، هەموو ئەمانە پیشاندەری ئەوەن تەقینەوەکە بەهۆی دزەی گازەوە ڕووی نەداوە و هۆیەکی دیکەی لەپشتە! بۆچوونی کارناسانی بەڕێوەبەرێتی گازیش ئەم لێکۆڵینەوەی کارمەندانیان پەسەندکرد، بۆیە بڕیاری لێپرسینەوەمان لەگەڵ دراوسێ و ئاشنایانی خانەوادەی کوژراودا، بەڵام ئەنجامی بەدەستهاتوو هێندە دڵخۆشکەر نەبوو، خەڵکەکەش زۆر باسی چاکی و ناوبانگی ئەو خانەوادەیەیان دەکرد و گومانیان لە کەسێکی دیاریکراو نەبوو.

لەکاتێکدا بۆ دۆزینەوەی سەرەداوێ لە ڕووداوەکە بۆ قووڵایی بیرکردنەوە چووبووم و لە حەوشە پیاسەم دەکرد، قسەکانی مابەینی دووکەس سەرنجیان ڕاکێشام، دوو کوڕی گەنج لەژێر سێبەری درەختێکی نزیکی من وەستابوون و تەماشای جموجۆڵی خەڵکەکەیان دەکرد، خەریکبوو لەبارەی ڕوودانی کارەساتەکەوە پێکەوە دەدووان:

- دەڵێم مەجید ناکا هەموو ئەم کارانە لە ژێر سەری فەرهاد بن؟!

- چیە وا فەرهادت کەوتۆتەوە بیر؟!

- هەر کە شەهلا خان و مێردەکەی بۆ ناو ماڵەوە چوون، ڕووداوێکم کەوتەوە بیر کە فەرهاد عاشقی شەهلا ببوو، لەیادتە چەندەی خۆشدەویست، ئامادەبوو بۆ هاوسەرگیری لەگەڵی هەموو کارێ بکات؟

- ئێ باشە، ئەمانە چ پەیوەندییەکیان بە ڕوودانی تەقینەوەکەوە هەیە؟! هەموو دەڵێن گازی ماڵەوە دزەی کردووە بۆیە ئەمە قەوماوە، کەس نابینم باسی فەرهاد بکا.

- ئەی بابە، مەجید گیان چەند ساویلکەی؟! ئەگەر تۆ فەرهاد ناناسی، ئەوا من لە منداڵییەوە لەگەڵ وی گەورەبووم و ڕەوشت و ڕەفتاری باش دەناسم، فەرهاد کەسێکی قین لە دڵ و لەخۆباییە، ئەگەر بیەوێ کارێ بکات و شتێ بەدەست بهێنێ، ئەوا خۆی بە ئاوو ئاگر دادەدا تا بە ئامانجی بگات، هەر لەبارەی مەسەلەی عاشق بوونەکەیەوە هەموو جار دەیگووت: " یا شەهلا دەخوازم یا بەڵایەك بەسەر ئەو خانەوادەیەدا دەهێنم کە تاهەتایە بیریان نەچێتەوە،،،،"

لەوەی کە سەرە داوێکم دەستکەوتبوو دەمتوانی بەدوویدا بچم زۆر خۆشحاڵ بووم و بەبێ خۆدوواخستن داوام لەم دوو گەنجە کرد بۆ لام بێن، ئەوانیش کە بێئاگا بوون بە دڵەکوتێ و نیگەرانیەوە بۆ بەردەمم هاتن و هەر لە سەرەتاوە بە دەنگێکی لەرزۆکەوە ڕایانگەیاند ئاگایان لە هیچ شتێ نیە؛ بە ڕوویەکی خۆشەوە هەوڵمدا لەو شتەی کە ئاگادارن درێژە بە قسەکانیان بدەن و گووتم:

من دەزانم ئێوە بێ گوناهن، بەڵام چەند ساتێ پێش ئێستا گوێم لە قسەو باستان بوو کە وردبوومەوە لە قسەکانتان لەبارەی فەرهاد ناوێکەوە قسەتان دەکرد، جا دەمەوێ زیاتر بزانم ڕەنگە ئەمە بتوانێ بە ئەنجامم بگەیەنێ، فرامرزی خوایخۆشبوو، کە خەڵکی لادێکەتان بوو حەیفە خوێنی بەفیڕۆ بڕوات، مەجید و مەنسور چەند ساتێ بێدەنگ بوون و تەماشایەکی یەکیان کرد کە نیشانەی ڕازیبوونیان بۆ هاوکاری کردنم دەگەیاند،بۆیە مەنسور هەناسەیەکی تازەی هەڵکێشاو گووتی:

- من و فەرهاد لە منداڵیەوە پێکەوە گەورەبووین، ئەو منداڵێکی چاپوك و زرنگ بوو، بەڵام لە خوێندن و قوتابخانە بێزاربوو هەر بۆیەش بەزۆر توانی تا پۆلی سێیەم وانە بخوێنێ، پاش ئەوە، خەریکی کێڵگەو باغەکانیان بوو، کەچی من توانیم تا پلەی دیبلۆم بخوێنم، لەگەڵ ئەوەش هیچ کامێکمان نەماندەویست بەهۆی ئەم مەسەلانەوە پەیوەندی هاوڕێیەتیمان بپچڕێنین، ئەو سەردەمە بەسەرچوو تا ئەو کاتەی فەرهاد خزمەتی سەربازییەکەی تەواوکردو بڕیاری ژن هێنانی دا، عاشقی شەهلای کچی سێیەمی حاجی سەلمان بوو کە نە من و نە خانەوادەکەشی بڕوامان پێکرد بوو، یەکەمیان لەبەرئەوەی فەرهاد چوار ساڵ لە شەهلا بچووکتربوو، دووەمیشیان بەپێی ئەوەی من ماڵی حاجی سەلمانم ناسیبوو خانەوادەیەکی دەوڵەمەندو خوێندەوار بوون و دڵنیابووم شەهلای نادەنێ، هەر بۆیە ئامۆژگاری فەرهادم کرد کە کۆتایی بەم عەشقە کاڵفامیەی بێنێ، بەڵام ئەو کەسێکی لاسارو خۆویست بوو ئامادە نەبوو هەتا بیر لە قسەکانیشم بکاتەوە، وە خانەوادەکەشی هاوڕانەبوون لەگەڵی، بەڵام فەرهاد ناچاریکردن بۆ داخوازی شەهلا بڕۆن، هەڵبەتە وەڵامی شەهلا و ماڵەوەشیان ئاشکرابوو کە چیە، کەچی فەرهاد وازی نەهێناو بەردەوام پەیام و خەڵکی دەنارد تاشەهلا ڕازیبکەن، بەڵام شەهلا هیچ هەستێکی بۆی نەبوو، ئەم ڕەفتارە ساردەی ئەو فەرهاد زۆر توڕە دەکات، یەك دوو ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕی، ئێستا ئیدی هەموو خەڵکی دەزانن فەرهاد بەڕەڵایەو هی ئەوە نیە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێ، وە لەلایەن ماڵی

شەهلاوەش لەژێر هیچ هەلومەرجێك بەم مەسەلەیە ڕازی نەبوون و نەهاتنە ژێر بار، تەنانەت فەرهاد چەندین جاریش پێشی بە باوك و دایكی شەهلا گرتبوو، جا بە زمان لووسی بێ یا هەڕەشە یاخود هەر ڕێگایەكی دیكە داوای لێكردوون بەم هاوسەرگیریە ڕازی بن، بەجۆرێ كە هەتا جارێك حاجی سەلمان لەپێشچاوی خەڵكی شەپازللەیەكی تێ سرەواندووە و گریاندوویەتی، كەس نازانێ مەسەلە چی بوو كە فەرهاد دەستی لەم پێداگریەی هەڵگرت و ماوەیەك بزربوو، دیاربوو بۆ كارێ بەرەو شار چووبوو، لەم بەینەدا سەروچاوی سیاوش ناوێ كە لە خزمانی دووری دایكی شەهلا بوو لە شاردا دەژیا پەیدابوو، هەموو شتێ زۆر خێرا ڕوویداو شەهلا زۆر زوو شووی بە سیاوش كردو چەند مانگێ دوواتریش لە مەراسیمێكی شكۆداردا ئاهەنگی بوكێنی لەگەڵ كردو بۆ شار چوو، وەك ڕۆژی ڕووناك دیاربوو ئەم هەموو پەلەپەلیە لە ترسی فەرهادبوو كە نەبا پەیدابێتەوەو ئاگرێ هەڵگیرسێنێ، لە دووای ئەم ڕووداوانە بوو سەروكەللەی فەرهاد دووبارە پەیدابۆوە، بەلأم ئەو ئیدی مرۆڤەكەی پێشوو نەبوو، بانگەشەی ئەوەی دەكرد لەم مەسەلەی عەشق و عەشقبازییە دەستی سووتاوەو تێگەیشتووە هەڵە بووە، هەتا لە بیستنی هەواڵی شووكردنی شەهلاش خۆشحاڵ بوو هیوای بەختەوەری بۆ خواستووە، ئەم وا لەناكاو گۆڕانە چاوەڕوان نەكراوەی بووە هۆی ئەوەی من و خانەوادەكەی ئارام بین و مەسەلەكە بە بنبەست بزانین و بە ئاسوودەیی هەناسەیەك هەڵبكێشین، ئێستا ماوەیەك دەبێ پەیوەندیمان وەكو جاران گەرم و گوڕ نیە، مەنسور كە گەیشتە ئێرە بێدەنگ بوو.

پرسیم:

- لەبەرچی واهەستدەكەی ئێستا پەیوەندیتان ساردبووە؟ پێتوایە هۆكارەكەی دەزانی؟

مەنسور سەری باداو بە دەنگێكی تێكەڵ لە دوودڵی و گومانەوە گووتی:

- تەواو نازانم چیە، بەلأم ماوەیەك بوو فەرهاد بەینی لەگەڵ فرامرز زۆر خۆش بوو.

- باشه ئەی بۆچی هۆکاری ئەم پەیوەندیەت لە فەرهاد نەپرسی؟

- ئاخر پێموابوو ئەو هەر دەیەوێ بەیەکجاری بەم نزیکبوونەوەیە تەواوی خراپیەکانی لەم چەند ساڵەی بەسەر خانەوادەی شەهلای هێنابوو، کاڵ بکاتەوە، چەند ساتێك بۆ قووڵایی بیرکردنەوە چووم و قسەکانی مەنسورم لەگەڵ کارەساتەکەی ڕوویدابوو لێکدایەوە و تەواوی نیشانەکانم لە خەیاڵم تاووتوێ کرد، بێگومان بووم کە تاوانباری یەکەمی ئەم ڕووداوە فەرهادە و پێویستە بە زووترین کات ئاگاداری بکەمەوە،هەر بۆ ئەم مەبەستە بە پێکەنینێکی تێکەڵ بە سوپاسەوە گووتم:

- قسەکانت کۆمەکی زۆریان پێکردم، تەنها جارێکی دیکە ماندووت دەکەمەوە لەوەی ماڵی باوکی فەرهادم پێ پیشان بدەی لە کوێیە؟ دەتوانی ڕێنماییم بکەی؟

- بەڵێ بێگومان، بەڵام منیش تکایەکم لێتان هەیە جەنابی ئەفسەر! ئەگەر فەرهاد دەستی لەم تەقینەوەیەدا بوو توانیتان دەسگیری بکەن، بەهیچ شێوەیەك ناوی من و مەجید نەبەن بە ئەرك نەبێ، چونکە هەم پەیوەندی هاوڕێیەتی چەندین ساڵەمان تێك دەچێ، هەمیش ئەگەر هەستبکات لەم مەسەلەیە هاوکاریمان کردوون، ئەوا بێدەنگ نابێ و هەڵبەتە تۆڵەیەکی قورس لە من یا خانەوادەکەم دەکاتەوە، منیش بەڵێنم پێدا بەهیچ جۆرێ ناویان نەبەم، ئینجا بەو ناونیشانەی لێم وەرگرت بۆ ماڵی باوکی فەرهاد ڕۆیشتم، بەڵام فەرهاد لەماڵ نەبوو، باوکی کە بە پیاوێکی ساویلکە دەچوو،بە دیتنی کارمەندانی پۆلیس حەپەساو ویستی دەرگا دابخات، بەڵام باش بوو فەرەیدون فریامان کەوت و پیرەمێردی ڕازیکرد تا هاوکاریمان بکات، لەگەڵ هەموو ئەمانە تەنها لە وەڵامی پرسیارمان گووتی فەرهاد چەند ڕۆژێکە بۆ شار گەڕاوەتەوەو ئیدی هیچ ئاگای لێی نیە و بێ وەستان دەرگای داخست، ئێستا ئێمە تیامابووین لە شارێکی گەورەو کاکی بە کاکی چوزانین فەرهاد لە چ کونێك خۆی شاردۆتەوە، دیسان مەنسور و مەجید کۆمەکیان کردینەوە، مەجید گووتی:

- مامم شوفێری پاسێکە کە خەڵکی لادێ بۆ شار دەباو دەگەڕێتەوە، ڕەنگە ئەو بتوانێ هاوکاریتان بکات، بێ دوواکەوتن پەیوەندیمان بە مامی مەجیدەوە کردو داوای ڕێنماییمان لێکرد، لەو کاتەدا ئەو لە ڕێگای گەڕانەوە بوو بۆ لادێ، بەقسەی خۆی چەندین جار فەرهادی لە خوارەوەی یەکێ لە گۆڕەپانەکانی شار دابەزاندووە وڕێگای ڕۆیشتنی دیتبوو دەیتوانی کۆمەکمان بکات، بە ڕێنماییەکانی مامی میهرەبانی مەجید و هاوکارییەکانی فەرەیدونی زاوای گەورەی حاجی سەلمان و پشکنینە هەست پێکراوو هەست پێنەکراوەکان، سەرەنجام توانیمان فەرهاد لە خانوویەکی تەواو نەکراو کە خەریکی کرێکاری بوو دەسگیربکەین و بۆ بەڕێوەبەرایەتی دەزگای هۆشیاری بیگوازینەوە، فەرهاد سەرەتا بە هێمنیەکی تەواوەوە خۆی بێ ئاگا لە قەومانی ئەم کارەساتە پیشاندا و بۆ کوشتنی فرامرزیش حەسرەت و ئەفسوسی خۆی دەربڕی، بەڵام بە لێکۆڵینەوە هونەرییەکان دانی بە تاوانەکەی دانا:

((کاتێ لە خواستنی شەهلا نائومێدبووم و دیتم خۆیی و خانەوادەکەی بچووکترین نرخم بۆ دانانێن و هەتا ئامادەنین ڕێگام بۆ ماڵەکەشیان بدەن، کەوتمە بیری تۆڵە، تۆڵە لە هەموو ئەو سوکایەتی و ڕیسواییانەی لەم چەند ساڵەی ڕابردوو لەبەر خاتری عەشقی شەهلا پێمکراوە و بەرگەم گرتوون، تۆڵەی ئەو زللەیەی باوکی شەهلا لەبەرچاوی دەرو دراوسێ لە پەناگوێی دام و زۆر پێی شکامەوە، فەرهاد کەمێك بێدەنگ بوو، چاوانی تەڕی لە هەوای باراناوی دەرەوە بڕی و بەردەوام بۆوە:

- ماوەیەك بۆ شار ڕۆیشتم تا عەشق و خۆشەویستیم لەبیربچێتەوە، لەیەکێ لە باخچە گشتیەکان ئاشنای کەسێکی هەڵکار بووم و لە درێژەی پەیوەندیم لەگەڵی فێری شێوازی دروستکردنی ماددەی تەقێنەرەوە بووم، بۆیە زۆر زوو پلانێکم دارشت و بۆ لادێ گەڕامەوە، بەڵام خۆزگە نەگەڕابامەوە، وەختێ لە خەڵکی گوندم بیست کە شەهلا شووی کردووە و بۆ هەمیشە چووەتە شار، دنیام لەبەرچاو تاریك و وێران بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵمدا بەسەرخۆمدا زاڵ بم و بیر لە جێبەجێ کردنی پلانەکەم بکەمەوە، لە قۆناغی یەکەم هەوڵمدا فرامرزی برا بچووکی شەهلا

وەك هاورِێ لەخۆم نزیك بكەمەوە بەڵام ئەمە هەر وا ئاسان نەبوو، چونكە ئەو هەمیشە هەوڵیدەدا لێم دووركەوێتەوە، بەڵام من وازم نەهێناو دووبارە بە زمانی لووس و نەرم بەدووایدا چوومەوەو وام پیشاندەدا لەكارەكانی ڕابردووم زۆر پەشیمانم، سەرەنجام دووای چەند هەفتەیەك توانیم متمانەی فرامرز بەرامبەر خۆم بەدەست بێنم، هەر ئەوەندە متمانەیەش بەس بوو تا لە دەرفەتێكی گونجاودا كلیلی ماڵەوەیانی لێ بدزم و كلیلێكی وەكو ئەم لەسەری كۆپی بكەمەوە،شەوی ڕووداوەكە دەمزانی خانەوادەی شەهلا بۆ بەشداریكردن لە مەراسیمی گێڕانەوەی بەسەرهاتی پیاوچاكانی ئایین بۆ ماڵی یەكێ لە خەڵكی دێیەكە ڕۆیشتوون، بۆ ماڵەوەیان چووم و بە پارێزەوە بەرەو چێشتخانە ڕۆیشتم، ئەو ئامێرەی پارێزگاری لە بەفرگرەكە دەكرد لێم كردەوەو یەكێكی وەكو ویم لە جێگاكەی داناو هەموو ناوەكەیم بەتاڵ كردو لەباتیان بە شارەزاییەكی تەواوەوە ماددەیەكی بەهێزی تەقینەوەم دروست كرد، چونكە شێوەكەی لە ڕواڵەتدا هەروەكو خۆی بوو دڵنیابووم كەس شكی پێنەدەكرد، دڵخۆش و كامەران لە ماڵی حاجی سەلمان هاتمەدەرو كاتژمێرێك دووای ئەوە تەقینەوەكە ڕوویداو منیش بێ دوواكەوتن هەر هەمان شەو بۆ شار گەڕامەوە، بەڵام پێم وانەبوو ئەوەندە زوو ئاشكرابم و بگیرێم، ئایا كەسێ منی تاوانبار كردووە؟!

لەجیاتی وەڵام بۆ پرسیارەكەی، هەناسەیەكی تازەم هەڵكێشاو گووتم:

- ئێستا كە تەقینەوەكە ڕوویداوە و فرامرز بەبێ هیچ تاوانێ بە ئاگری تۆڵەی تۆ سووتاوەو بووە بە خۆڵەمێش، پرسیارێكم لێت هەیە، بۆچی هیچ كاتێ بیرت لەوە نەكردەوە كە عەشقی تۆ بۆ شەهلا عەشقێكی كاڵفام و گەمژانەیە و تۆو ئەو جیاوازیتان لە زەویەوە تا ئاسمانە ها؟ باشتر نەبوو لەجێی ئەو پێداگرییە بێ مانایەت كە بووە مایەی ڕیسوایی خۆشت، عاقڵانە بڕیارتدابا تا نەجەرگی ئەوان بسووتێنی نە خۆشت بەدەستی خۆت بكوژیت؟! دڵنیابە بەم كارەت ئاییندەی خۆت وێران كردو زیندان یا،،،،،یا ڕەنگە سێدارە چاوەڕوانت بێ، فەرهاد پێكەنینێكی تاڵی بۆ كردم و هیچی نەگووت، پێدەچوو بیر لە ڕۆژانی هەتاوی گەنجێتی بكاتەوە كە وا بڕیاربوو لە پشت شیشەكانی زیندان ساردو هەورین بن .

# دەستە چەپەڵەکان

بەیانیەکی دڵگیری یەکێ لە ڕۆژەکانی سەرەتای هاوینە و هەوا هێشتا فێنکایەتی خۆشی شەوی پێشووی هەر لەگەڵدایە، هەتا ئێستا ئاگری گەرما تیشکە سووتێنەرەکانی بەسەر شاردا بڵاونەکردۆتەوە کە بە یەکەی مەڵبەندە خێراکانی پۆلیسی۱۱۰.

ڕادەگەیەنرێت ئاگرێك بەربۆتە یەکێ لە گەڕەکەکانی باشوری شار، ئێمەش بێ خۆدوواخستن لەگەڵ ژمارەیەك لە کارمەندانی پۆلیس بەرەو شوێنەکە بەڕێدەکەوین، بەهۆی نزیکی ڕێگاکەوە زۆر زوو بەشوێنی مەبەست دەگەین و بەرەو ڕووی کارمەندانی ئاگرکوژێنەوە دەبینەوە کە وادیاربوو پێش ئێمە گەیشتبوونە جێ و لە هەوڵی ئەوەدابوون ئەو ئاگرەی لە جانەوەرێکی زەبەلاحی سوور دەچوو بکوژێننەوە، دەتگووت مەستانە قاقا پێدەکەنێ و نەعرەتە لێدەدا و لەگەڵ هەر نەعرەتەیەکیش قاقای دڕندانەی زیاتر بڵێسەی بە ئاسماندا دەڕوات، دەرگاو دیواری ماڵ ڕەش دەکات و بێ ئەوەی هیچ بپارێزێ هەموو شتێ قووت دەدات و دەیکاتە خۆڵەمێش، خەڵکێکی زۆر لە گەڕەك و شەقامەکانی دەوروبەر لێی کۆببوونەوەو بە نیگەرانیەوە تەماشای ئەم دیمەنە دڵڕوشێنەیان دەکردو هەریەکەیان بۆچوونێکی جیاوازی لەبارەیەوە هەبوو؛ هەندێکیشیان هەوڵیاندەدا یارمەتی کارمەندانی پۆلیس و ئاگرکوژێنەوە بدەن بۆ ئەوەی هەرچی زووترە دایمرکێننەوە، بەمەبەستی هەنگاونانی بەپەلە و گەیشتن بە ڕاستی و دروستی ئەوەی کە ئایا هیچ کەسێ یا کەسانێ لە ناوەوەی ئەم ماڵە گرتێبەربووەدا هەیە یا نا ! چەند کەسێ لە خەڵکەکە وادیاربوو نیشتەجێی هەمان گەڕەکن، گوتیان ئەوەی لەم ماڵەدا دەژی تەنها پیرەژنێکی نزیکەی حەفتا ساڵەیە بەناوی ((ئەفسانە)) کە ماوەیەکی زۆرە تووشی نەخۆشی پووکانەوەی جومگەکانی لەش بووە و هەربۆیە کەمتر لە ماڵەکەی دەهاتەدەرو زۆرترین کاتەکانی بە تەنهایی بەسەردەبرد، هەر لەوکاتەدا یەك دوو کەس لە کارمەندانی ئازای ئاگرکوژێنەوە بە کەل و پەلی پێویست و بێ دوواکەوتن بەنێو دووکەڵ و ئاگردا تێدەپەڕن و بۆ ناو ماڵەکە دەچن

تا بەهەر جۆرێ بێ و ئەگەر پیرێژن لە ماڵەکەیدابێ ڕزگاری لەمەرگ بکەن، هەموو بێ ئارامانە چاوەڕێی کارمەندانیان دەکرد تا سەرکەوتووانە لەگەڵ پیرێژنەکە بێنەدەر، لەم ماوەیەدا من لێکۆڵینەوەکانم ئەنجام دەدا و دەبینم ئەفسانە خاوەنی هیچ منداڵێ نیەو مێردەکەشی پێنج ساڵ لەمەوپێش مردووە، پەیوەندی دۆستایەتی پیرێژنیش لاوازبووە و بۆ کارە گرینگەکانی وەکو کڕین نەبوایە لەماڵ نەدەچووە دەرەوە و تەنها خزم و خوێشانی نزیکی هاموشۆی ماڵەکەیان کردووە، دەنگی دروود دۆعای خەڵك و هات و هاواری کارمەندانی ئاگرکوژێنەوە ئەوەمان پێدەڵێن کە دوو کارمەندی گیان لەسەر دەست بۆ دەربازکردنی ڕۆحی ئەفسانە سەرکەوتوو بوون، بەڵام کاتێ بۆ سۆراغیان دەڕۆم،بە نیگەرانیەوە پەی بەوەدەبەم ئەو پیرێژنە هەناسە هەڵناکێشێ، بەشێ لە جەستەو جلەکانی سووتاوەو سێبەری بازنەی خەرمانەیەك لە مەرگ بەدەوری ڕوخساری بە دووکەڵ ڕەشبووی هێڵی کێشاوە، پزیشکی یاوەرمان بێ وەستان دەکەوێتە پشکنینی جەستەی ئەفسانە، چەند ساتێ دواتر هەواڵی مردنیمان پێڕادەگەیەنێ بەهۆی قووڵی برینەکانیەوە کە زۆر بەخراپی لەناوەوە سووتاوە، هەموو بە داخ و حەسرەتەوە سەریان با دەدەن و دوعای خوالێخۆشبوونی بۆ دەکەن، تەرمەکەی بۆ پزیشکی یاسایی دەگوێزرێتەوەو ئینجا بە هەوڵی ئاگرکوژێنەوەکان دواجار ئاگرەکە خامۆش دەبێ، لەگەڵ گروپێکی کارمەندانی هۆشیاری بە وردی دەکەوینە توێژینەوە لە دیمەنی کارەساتەکە، ماڵەکەی ئەفسانە گەورەو کۆنە شێوەی ناوەوەو دەرەوەی لەسەر داب و نەریتی کۆن دروستکرابوو، لەگەڵ ئەوەی ئاگرەکە هەموو شتێکی لەناوبردبوو، بەڵام گشت جوانکاری ناو ژوورەکان ئەوەیان پیشاندەدا کە سەروەت و سامانی خاوەنی بەساڵاچووی ماڵەکەیە، یەکێ لە کارمەندان سەرکەوتووانە لە کاتی گەڕان و پشکنین هەگبەیەکی بەتاڵی کۆنەی ڕەنگاوڕەنگی جوانی لە سووچێکی میوانخانەکەدا دۆزییەوە، کە پێدەچوو هەگبەی خشڵ و ئاڵتوونەکانی ئەفسانەبێ و تا ئاستێکی باشیش لە بڵێسەکانی ئاگر سەلامەت دەرچووبوو، کەچی سەیرەکە لێرەیە هەرچەندی ئەم ماڵەمان سەرەوبن

کرد زێڕو ئاڵتونمان نەدیتەوە، لەلایەکی دیکەوە وەختێ تەرمی ئەفسانەمان بۆ پزیشکی یاسایی گواستەوە هیچ زێڕو ئاڵتونێ بە دەست و گەردنیەوە نەدەبینرا، ئەمەش بۆ خۆی گومانێ بوو کە ڕەنگە زێڕەکانی پیرێژن دزرابێ و بەتاڵان چووبێ، بەڵام ئەم کارە دەبێ چ وەختێ ئەنجام درابێ؟! ئەگەر گومانمان بۆ کاتی ئاگرکەوتنەوەکە بچێ، ئەوا بە گەمارۆدانی توندی شوێنەکە بەهۆی کارمەندان و قەرەباڵغیەکی زۆری خەڵکەکە زەحمەتە یەکێ لەنێو ئەم حەشاماتەدا توانیبێتی دزی بکات و کەسیش نەیدیتبێ، لەلایەکی دیکەوە دەبێ سەرنجی ئەم خاڵەش بدەین ئەوە کێیە ترسی سووتان لەنێو ئاگر بە گیان دەکڕێ و لەبەر خاتری چەند پارچە ئاڵتونێ، ڕۆحی کە زیاتر لەهەموو شتێ بەنرخترە دەیخاتە مەترسیەوە؟! بۆیە دزینی ئاڵتونەکان هەر دەبێ پێش ڕوودانی ئاگرکەوتنەوەکە ئەنجام درابێ، بڕیاردەدەین لەسەر ئەم مەسەلەیە هەڵوەستەیێ بکەین و بووەستین، هەر لەوکاتەدا کۆمەڵە پرسیارێکی جۆراوجۆر لەبارەی قەومانی ئەم کارەساتەوە مێشکمیان بەخۆیانەوە خەریك کردبوو، یەکێ لە هاوکارانم بانگم دەکا،کاتێ بۆ لای دەڕۆم دەبینم گۆچانێکی تا ڕاددەیەك ئەستور لە سووچێکی باغی پشتەوەی خانووەکە دۆزیوەتەوە،ئینجا ئاماژە بۆ بەشی سەرەوەی گۆچانەکە دەکاو دەڵێت:

" بێ زەحمەت وردتر تەماشایکە جەنابی ئەفسەر! تۆش پێتوانیە بوونی ئەم پەڵانە بەسەریەوە ڕووداوێکی لە پشت بێ؟!"

قسەکەی ڕاست بوو، توێژێکی تۆخی خوێن سەرەوەی گۆچانەکەی داپۆشیبوو چەند تاڵە موویەکی ژنانەشی پێوەبوو، خۆشحاڵ بە دۆزینەوەی سەرەداوێکی وەها گرینگ فەرماندەدەم لەلایەن تاقمی پشکنینەوە گۆچانەکە بەرەو تاقیگای تاوان ڕەوانە بکەن و زیاتر لە بەڕێوەبردنی کارەکانیان وردبنەوە، ئێستا لەوە دڵنیابوومەوە کە پیرێژنی قوڕبەسەر کوژراوەو زێڕو ئاڵتونەکانیشی پێش ئاگرکەوتنەوەکە واتە هەر لە وەختی کوشتنەکە لەسەردەستی بکوژ یا بکوژانەوە دزراون و ئەم سووتانە ئەنقەست و ساختەیە تەنها شانۆگەرییەکی زیرەکانە بووە بۆ شاردنەوەی نهێنی تاوانەکە، بەدوواداچوونی تیمی دەزگای هۆشیاری لەبارەی

سووتانی ماڵی پیرێژن هەر بەردەوامە، ئەنجامی پشکنین و تاقیکردنەوەکانی پزیشکی یاسایی، پێی وایە کوشتنی ئەفسانە ئەنقەست بووە چونکە گروپی خوێنەکەی لەکاتی بەراووردکردن لەگەڵ پەڵە خوێنە وشکەکانی سەر گۆچانەکە و تاڵە مووە جێماوەکانی سەری وەك یەك و هەمان شت بووە، لێپرسینەوە هونەرییەکان لە خزم و خوێشانی کوژراو بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی بە ((جاسم)) ناوێك دەگەین کە توێژینەوەکانی پێشووی ئەوە پیشاندەدەن ناوبراو ماوەیەك بەهۆی شەڕو پەشێوی نانەوەو تێکدانی باری ئاسایی گەڕەك لەزیندانی بەسەربردووەو لەنێو خزم و کەسانیشی دا ئەوەندە خۆشەویست و لەبەردڵان نیە،ڕۆژی کارەساتەکە چەند کەسێ لە دراوسێیانی ئەفسانە جاسمیان بینیوە لە دەوروبەری ماڵی پیرێژن خولاوەتەوەو وایان هاتۆتە بەرچاو کە بارودۆخەکە هەڵدەسەنگێنێ، کاتێ پەیوەندی بە شوێنی ژیانی جاسمەوە دەکەین، خاوەن ماڵەکەی دەڵێ نزیکەی دوو هەفتەیە ماڵی چۆڵکردووەو شتومەکەکانی بەرەو جێگایەکی نادیار ڕاپێچ کردووە، بۆیە ئێمەش لەڕووی ڕەووشت و ڕابردوویەوە لە دراوسێ و دۆستانی نزیکی دەپرسین و پەی بەو خاڵە دەبەین کە هۆگری بە ماددەی سڕکەریش پەیداکردووەو بۆ فەرامۆشکردنی ڕابردووی تاڵی خۆی کەڵکی لێوەرگرتوون، ئێستا بە دڵنیاییەکی زیاترەوە دەتوانین دەربارەی دەست تێدابوونی جاسم لە ڕووداوی کوشتنی ئەفسانە بکۆڵینەوە، توێژینەوەو شوێنهەڵگرییە زانراوو نەزانراوەکانی پۆلیسی هۆشیاری دوواجار بە ئەنجام دەگات و سەرکەوتوو دەبین و جاسم لە ماڵی یەکێ لە هاوڕێیانی دەسگیردەکەین و بۆ بەڕێوەبەرایەتی دەبەین، وەك بڵێی چاوەڕوانی ڕۆژێکی وەهای دەکرد چونکە بێ هیچ بەرهەڵستیەك خۆی بەدەستەوە دەداو لە کاتی لێپرسینەوە دان بە کوشتنی پیرێژن و دزینی پارەو زێڕو گەوهەرەکانی دادەنێت:

- بەڵێ من کوشتم لەبەرئەوەی پێویستیم بە پارە بوو! چەند مانگێك نابێ لە زیندان ئازاد بووم، سەرەتا بە کارەکانی وەکو کرێکاری و دەستگێڕی خەرجی ژیانم دابین دەکرد، بەڵام ڕۆژێ لەپڕ لەم ڕاکە ڕاکە بێهودەیەو دەستکەوتنی پارە

کەمە ماندوو بووم و بڕیارمدا ژیانم ڕێکخەمەوە، بۆ ئەم کارەش پێویستیم بە سەروەت و سامانێکی باش هەبوو دەشمزانی وا بە ئاسانی دەستم ناکەوێ، بۆیە چارەیەکم نەبوو جگە لەوەی کە بە ڕێگایەکی خراپ و هەڵە دەبوو پێی بگەم، ئەمجارە وا بە خەیاڵمدا هات دزی لە یەکێ لە خزمانی دەوڵەمەندم بکەم، دووای گەڕان و بیرکردنەوە ئەفسانەم کەوتەوە بیر، ئاخرمن هەمیشەخەیاڵاوی بیرمدەکردەوەو مەبەستم بوو ژن بێنم و سامانێ کۆبکەمەوە چونکە ئێستاکە تەمەنم لە سی ساڵی ڕەت بووە، تەنها پەیوەندی منیش بەو خزمایەتیەکی دووری لەگەڵ دایکمدا هەبوو، بەدرێژایی ژیانمان ڕەنگە لە ژماردنی پەنجەکانی دەستێ تێنەپەڕێ هەر ئەوەندە یەکترمان دیوە، بەڵام دەمزانی تەنهایەو موڵك و ماڵێکی زۆری لە مێردی خوالێخۆشبووی بە میرات بۆ ماوەتەوە، وەختێ بەراوردی ژیانی خۆم لەگەڵ ژیانی ئەفسانە دەکرد ئەو پیرێژنێکی تەنهایەو بە سەرمایەیەکی زۆرەوە دەژی و منی قوڕبەسەریش لە چ بارودۆخێك دام، ڕقم دەبۆوەو ئێرەییم پێ دەبرد، ئەوەبوو پلانێکی وردم گەڵاڵە کردو چەند ڕۆژێ ماڵەکەیم خستە ژێر چاودێرییەوە، لەم ماوەیەدا تێگەیشتبووم هاموشۆ بۆ ماڵی ئەفسانە زۆر کەمەو گەلێك ڕۆژان ئەو هەر بەتەنهایە، ئەمەش یارمەتیەکی زۆری نەخشەکەی دەدام، دوواجار دەرفەتێکی گونجاوم بۆ هاتە پێش، بەیانی ڕۆژی ڕووداوەکە لەسەر دیوارەوە خۆم فڕێدایە نێو ماڵەکەیی و بە سۆراغیەوە چووم، قوڕبەسەرە بەدیتنی ناکاوی پیاوێکی تاڕاددەیەك نەناس و بێگانە لەنێو ماڵەکەیدا زۆر ترسابوو، ئەوەندە پەشۆکابوو بەزەییم پێیداهاتەوە، بە زمانێکی شیرینەوە پێمگووت تەنها دەمەوێ کەمێ لە سەروەتەکەی بدزم و کارم بە خۆیی و ژیانیەوە نیە، جا باشترە بێ ترس و هات و هاوار هاوکاریم بکەی! بەڵام ئەو تازە منی ناسیبوو، دەستی بە هاوارو قیژە کرد، منیش ترساوویبێچارە ببووم، بێ خۆ دوواخستن پەلامارم داو ویستم هێمنی بکەمەوە، کەچی ئەو هەر بێدەنگ نەدەبوو دەیویست پەیوەندی بە پۆلیسەوە بکات، ئەوە بوو کە شەیتانی جادوگەری خەیاڵم دەستی بە یارییەکانی خۆی کردەوە، کاتێ یەکەمین گۆچانم بەتوندی لەسەری دا ناڵەیەکی کردو کەوتە سەر زەوی، کەچی لەپڕ بەزەییم پێیداهاتەوە، چونکە هەرچۆنێ بێ لەجێی دایکم

بوو ڕێزگرتنی پێویست بوو، بەلاّم بۆنی حەزبزوێنی پارەو پول دەنگی ناوەوەی ویژدانمی کپ و سست کردبوو،ئەفسانە هەولّیدا هەستێتەوە، بەلاّم ئەمجارە توندترو کاریگەرتر لێمدایەوە،بۆیە توانای هیچی دیکەی نەماو بۆ هەمیشە لە هەناسەدان کەوت، خەیالّم لەبارەیەوە ئارام بوو، ئینجا دەستم بە گەڕان کردو سەرکەوتووبووم هەگبەی زێڕو گەوهەرەکانیم پشکنی و گشتیم هەلّگرت و بەخۆو بە گۆچانەوە لەو مالّە نهێنی ئامێزە ڕامکرد، بەلاّم هێشتا نەچووبوومە دەر کە سەرنجی ئەوەمدا پاشماوەی پەنجەم بەسەر هەموو شتەکانی مالّەکە جێماوە و ڕەنگە ببێتە ژانەسەر بۆم، دیسان شەیتانی نەعلەتی بۆ ژێر پێستم چۆوەو لە فیلمە تەلەفزیۆنی و سینەماییەکان دیتبووم کاتێك تاوانباران لە تاوانێکەوە دەگلێن بۆ ونکردن و بزرکردنی پاشماوەی بەجێماو ئاگر لە هەموو شتێك بەردەدەن، وەختێك کە هاتمەوە هۆش خۆم مالّەکە خەریك بوو لەناو ئاگردا دەسوتا، ئەم کارە تەنها ڕێگە چارە بوو لەوکاتە کە بەخەیالّمدا هات، پاش ئەوە لەوێ دوورکەوتمەوەو ئالّتونەکانم لە جێیەك شاردەوەو چاوەڕێی دەرفەتێك بووم تا لافاوەکان بنیشنەوەو بە خەیالّێکی ئارامەوە بیانفرۆشم و بە خەونی شیرینم بگەم و برێك لە پارە دزراوەکانیش خەرج بکەم، بەلاّم بێئاگا بووم لەوەی خوێنی ئەو پیرێژنە بێ گوناه ناسرێتەوەو دواجار ڕۆژێك هەر دێت داوێنم دەگرێت، ئێستاکەش هیچ قسەیەکم بۆ بەرگری کردن لە خۆم نیە، من تاوانبارم و هەر بەم دەستە چەپەلاّنەم گیانی مرۆڤێکم کێشاوەو پێویستە سزا بدرێم، نەفرەت لە تلیاك کە ژیانی تەفروتونا کردم و هەزاران داخ و پەژارە کە خەونی ژیانی من خەونێکی تەڕو شێدار بوو، جاسم بۆ پشت شیشە پۆلاّیینەکانی زیندان گوازرایەوە تا لە خەلّوەتی شەوانی تەنهایی خۆیدا بیر لەم پرسیارە بکاتەوە کە ئایا لەڕاستیدا بەڕشتنی خوێنی پیرێژنێکی بێ پەناو تەنها دەبێت کۆشکێکی زێڕین دروست کرێت و بەتاوانێك کە ئەنجامی داوە ژیانی دەستخۆشی چ ئایندەیەکی لێدەکات، بەلاّم بەداخەوە ئەو گەلێك دوور ڕێگای ژیانی دۆزیەوە.

# خەزانی خۆشەویستی

سەرەتای کاتەکانی بەیانی یەکێ لە ڕۆژەکانی ساردی زستان، بە ئاسایش ڕادەگەیەنرێ کە لە یەکێ لە گەڕەکەکانی باشووری شار، ڕوداوێکی کوشتن قەوماوەو پێویستە هەرچی زووترە پەیوەندی بە شوێنی کارەساتەکەوە بکەین، لەگەڵ تیمێکی کارمەندانی هاوکارم بەرەو ناونیشانی دیاریکراو بەڕێدەکەوین، یەکەمین سەرمای بەیانی ناخۆشە و وەك ئەوەیە گازت لێبگرێ، بۆ ئەوەی کەللەسەرت بسمێت و خەو لە چاوانت بزڕێنێ، هێشتا دەسپێکی ڕۆژەو جموجۆڵی کەس لەشاردا بەرچاو نەدەکەوت و هەر ئەم کارەش ڕێگای بۆ هەموار کردبووین و وایکردبوو زووتر بەشوێنی مەبەست بگەین، چەند ساتێ دوواتر، لەبەردەمماڵێکی گەورەو کۆندا دەوەستین و پاش جێگیرکردنی هێزەکان لە جێگا پێویستەکاندا، بۆ ناو ماڵەکە دەچین، لەحەوشەیەکی تاڕاددەیەك گەورەو پڕ درەخت هیچ شتێکی نائاسایی نەدەبینرا، دووای چوونە ناوەوە بینیمان خانووەکە شێوەیەکی کۆن و بەنەخش و نیگاری هەیە، لەیەکێ لە ژوورەکان ڕووبەڕووی تەرمی پیرەمێردێکی نزیکەی حەفتا ساڵە دەبینەوە کە بە پشتاکەوتووەو دەست وپێی بەجۆرێکی ناشیانە بە گوریس بەستراوەتەوە، شل بوونی پەتەکەو گرێیەکەی بەجۆرێك بوو هەموو کەسێ لەهەر تەمەن و ساڵێکدابێ دەتوانێ بە کەمێ هەوڵ و تەقەللا خۆی ڕزگار بکات، بەسەر دەموچاوی پڕ چرچ و لۆچی کوژراو پاشماوەی برین و زامە سادەکان و چەند دڵۆپە خوێنێکی وشکبۆوە دەبینرا، ئەمەش ئەوەی پیشاندەدا کە کوژراو لەگەڵ بکوژ یا بکوژان کەمێك دەسەویەخە بۆتەوە،ساردبوونی لەشی ئەوەی پێدەگووتین کە چەندین کاتژمێرە مردووە، بەڵام هەر کە بە پارێزەوە هەڵاوگێڕمان دەکرد سەرنجی ئاوساوییەکی شین هەڵگەڕاوو نائاساییمان لە پشتەسەری دا، بەڕێنمایی کارمەندان بۆ ژوورە گەورەو بەسەریەکادراوەکە دەڕۆم کە ژنێکی پیر لەوێدا و لەسەر کورسیەك دانیشتووەو بە هێمنی دەگریا، سیمای غەمگین و تێکچووی تەمەنی زیاتر پیشاندەدا، جلێکی ئاسایی پۆشیبوو، هەرچەند ساتێ جارێك بە دەستە لەرزۆك و ڕەق و تەقەکانی فرمێسکەکانی دەسڕیەوەو

دەستی بە ورتەورتەکان دەکرد، کە لە هەر بێوەژنێکی دیکەی چاوەڕونکراو دەچوو، دەیگووت:

- ئەی خوایە بەدبەخت و قوڕبەسەر بووم، ناپیاوانە مێردەکەیان لێ کوشتم، یاخوا ڕۆژی خۆش بەچاوی خۆیان نەبینن وەها بەم دووا دووایی تەمەنە ماڵیان کاولکردم، خۆزگە منیشیان دەکوشت، لەکوێی ئەسغەراغا؟ بۆچی تەنیا جێت هێشتم و ڕۆیشتی؟ وەرە دەستم بگرەو لەگەڵ خۆتم ببە!

کارمەندان لە هەوڵ و کۆششی دۆزینەوەی شوێن پێیەکی بکوژ بوون، بەڵام ئا لەو ساتەدا جگە لە پیرێژنێکی پشت چەماوە هیچ کەسی دیکە نەیدەتوانی کۆمەکمان بکات، بە پەرداخێك قەنداغەوە بۆ لای دەڕۆم و ئەمیش چەند خولەکێ ئارام دەگرێت، ئینجا داوای لێدەکەم هەرچی ڕوویداوە بۆم بگێڕێتەوە، پیرێژن فرمێسکەکانی دەسڕێتەوە، چەند ساتێ لە خاڵێکی نادیار ڕادەمێنێ، وەك بڵێی لە ڕوونکردنەوەی قسەکانی شك و دوودڵی هەیە، بەڵام دوواتر زاری هەڵدێنێ و بە دەنگێکی گیراوو لەرزۆکەوە دەڵێت:

- ئەگەر هەڵە نەبم نزیکەی کاتژمێر دوو یا سێی نیوە شەو بوو کە بە دەنگێك لەخەو ڕاپەڕیم، سەرەتا زۆر گوێم پێنەدا، بەڵام وەختێ دەنگەکەم دووبارە بیستەوە، لەسەر جێگاکەم دانیشتم و سەرنجی سێبەرەکانی ناو هۆڵەکەمدا، زۆر ترسام، بەپەلە ئەسغەراغای مێردم بەئاگاهێناو لەبن گوێی گووتم، ئەسغەر هەستە، وابزانم دز هاتۆتە ماڵەکەمانەوە، بەڵام ئەو هێشتا لە پرخەی خەودابوو، هەربەمجۆرە خەریکبوو حاڵیم دەکرد کە چی ڕوویداوە، بینیم بۆ ناو ژوورەکەمان هاتن، هەتا بواری هات و هاواریکیشیان نەدایِن، دەسەوبەجێ دەست و قاچیان بەستین و جێگای پارەو زێڕیان لێ پرسین، مێردەکەم زۆر تووڕەببوو، دەستی بە جنێوو قسەی ناشیرین کرد و دوواجار هەڕەشەی ئەوەشی لێکردن کە هەواڵ بە پۆلیس دەدات، کەچی من بەڕاستی ترسابووم، شوێنی ئاڵتونەکانم پێگووتن، دوو کەسیان بۆ دزینی زێڕو شتە گرانبەهاکانی ماڵەکەمان چوون و کۆیان دەکردنەوە، یەکێکیشیان کە بەهێزتربوو ئاگای لە ئێمەبوو، مێردەکەم چونکە زۆر تووڕەببوو

دەستی بە هاوار هاوار کرد، دزەکان لێی بێتاقەت ببوون و بە تورەییەوە هێرشیان کردە سەرو بە شەق و کۆڵەمست کەوتنە سەری و هەوڵیاندا دەنگی ببڕن، کەچی ئەو بێدەنگ نەدەبوو، هەر هاواری دەکردو داوای یارمەتی دەکرد، تا ئەوکاتەی هەر ئەو دزەی چاودێری ئێمەی دەکرد و گەلێك تورەببوو، شەقێکی توندی لە مێردەکەمداو فرێیدا ئەو سەرەوە و هەڕەشەی ئەوەی لێکرد ئەگەر چیدی هاوار بکات بەلآیەکی بەسەر دێنێ، بەلآم چی،،،،من ئەوە زیاتر لە چل ساڵە لەگەڵ ئەسغەر دەژیم و باش دەمناسی و دەمزانی لەو جۆرە کەسانە نیە کە وا بە ئاسانی جڵەو بۆ زۆر بلێیەکانی خۆی شلکات، هەر بۆیە بە گریان و پاڕانەوە داوام لێکرد بێدەنگ بێ، کەچی ئەو گوێی بە من و دزەکان نەداو بەرزتر لە پێشوو هاواری دەکردو داوای کۆمەکی دەکرد و زۆریشی جنێوی سووك و بێمانا دا، منیش لە بەردەوامبوونی ئەم بارودۆخە دەترسام و بێتاقەت ببووم ئەمجارەش لە دزەکان پاڕامەوە کە مێردەکەم حاڵەتی ناتەواوی و تورەیی مێشکی لەگەڵدایە چاترە ئیشەکانی خۆیان بکەن و بڕۆن، کەچی دوواجار ئەو شتەی لێی دەترسام هەر ڕوویدا، هەر ئەو پیاوەی هەڕەشەی لە مێردەکەم کردبوو، هیچ چاری نەماو لەناکاو پەلاماری دا،،،،،

پیرێژن ناوی (فروزان) ە و نزیکەی شەست و دوو ساڵ بوو، حەوت یا هەشت ساڵ لە مێردی خوالێخۆشبووی بچووکتربوو، کە دەگاتە ئێرە تورەییەکەی دەشکێنێ و دەموچاوی تەڕ دەبێ و بە ئاه و ناڵەو گریانەوە درێژە بە قسەکانی دەداتەوە:

- ئیدی خۆشم نازانم چی ڕوویدا،کاتێ بینیم مێردەکەم لە جووڵە کەوتبوو هیچ دەنگێکی لێوە نەدەهات، زراوم چوو، دزەکان ئیشی خۆیان تەواوکردو بارگەوبنەی خۆیان پێچایەوەو هەلآتن، منیش بەهەرشێوەیەك بوو گوریسەکەم لەدەست و قاچم کردەوەو بۆ لای مێردەکەم ڕامکرد، کەچی هەرچەندی بانگم کردو ڕامتەکاند گوێم لە هیچ وەلآمێك نەبوو،تا بەباشی سەرنجمدا،،،،کە مردووە !

- ئێوە دەم وچاوی دزەکانتان دیت؟ هیچ کامێکتان نەدەناسی؟ فروزان بەگریانەوە سەری با دەداو دەڵێت:

- دەموچاویان بەتەواوی داپۆشیبوو.

- ئەی باشە دەزانی لە چ ڕێگایەکەوە بۆ ناو ماڵەکەتان هاتبوون؟

- ئەوەی ڕاستی بێ مێردەکەم خۆراکی پێویستی ڕۆژانەی مرۆڤی دەفرۆشت، دوکانەکەشی بە ماڵەکەوە نووسابوو، ڕەنگە لەوێوە هاتبن، لەبەرئەوەی ڕێگا هەیە، پاشان دووبارە دەست بە گریان و ناڵە دەکاتەوە، یەکێ لە هاوکارانم کە گوێی لەتەواوی قسەکانی فروزان بوو،پەلم دەگرێت و بۆ سووچێکم دەباو بە ئارامی دەڵێ:

- جەنابی ئەفسەر ئەوەی ڕاستی بێ من شکم لە دروستی قسەکانی ئەم ژنە هەیە، چونکە کاتێ بەرەوڕووی مان بۆوە ئەو شتێکی دیکەی بە ئێمە گووت، گووتی لەوانەیە دزەکان شارەزابووبن و کلیلی دەرگای ماڵەکەیان پێبووبێ، هەستناکەی ئەمە جێی گومان بێت؟

تەماشایەکی فروزان دەکەم، لەکاتێ فرمێسك دەڕێژێ و ناڵە ناڵ دەکات و تیلە چاوێ دەگرێتە دەوروبەری، نیگای ترساوو لەرزۆکە و جاربەجار بێدەنگ دەبێ و هاموشۆی کارمەندان و بەرپرسانی ئاسایش دیقەت دەداو ئەو کاتەش زامی دڵی دەکولێتەوە دەست بە گریان و ناڵە دەکاتەوە، لە هەڵسوکەوتی ناتوانرێ هیچ جۆرە گومانێك ببینرێ، هەر لەو کاتەدا یەکێ لە کارمەندان سندووقۆکەیەکی کۆن و بە نەخش و نیگارم بۆ دێنێ و دەڵێت:

- جەنابی ئەفسەر، ئەمەم لە ژێرزەمینی ماڵەکەدا دۆزییەوە و خۆتان بفەرموون سەرنجی بدەن!

ئینجا دەرگای سندووقۆکەکە دەکاتەوە، بریسکەی خرخاڵ و ملوانکەو گشت زێڕو موتوموروەکانی ناوەوەی خەریکە چاوم کوێر دەکەن، لە بنەوە تەماشایەکی فروزان دەکەم، بەدیتنی سندووقەکە ڕەنگی پەڕی و ئاهو ناڵەی نەما، ترس و تۆقینی ئاوێتە بە دڵەکوتێ لە تیلەی نیگای دەباری، وەك بڵێی ئەم سندوقە

بچووکە کۆنە ڕازی نەگووتراوو شاراوەی بۆ ئاشکرا کردووە، هەر لەو کاتەی سندووقەکەم بەدەستەوەیە فەرمان بە هاوکارانم دەدەم، دیسان درێژە بە پشکنین و لێکۆڵینەوەکانیان بدەن تاکو پاشماوەیێ لە بەڵگەی تاوانی بکوژ یا بکوژان بدۆزنەوە، کاتێ هاوکارانم دوور دەکەونەوە،سندووقە بچووکەکە لەبەرچاوانی ترساوو ماتی فروزان سەروبن دەکەم، کاتێ دەبینم دووبارە بە سەرپۆشەکەی ڕوخساری دادەپۆشێ و دەنگی گریانی بەرزدەبێتەوە، بڕیاردەدەم لە دەرفەتێکی گونجاودا جارێکی دیکە لێ بپێچینەوەی لەگەڵ بکەمەوە، دە ڕۆژ پاش ئەو ڕووداوە، خەریکی لێکدانەوەو شیکردنەوەی مەسەلەی کوشتنی ئەسغەراغابووین، توێژینەوەکان لەگەڵ بۆچوونی دراوسێکانیان ئەوە پیشاندەدەن: تائێستا کە لەبیریانە هەمیشە نێوانی فروزان و مێردەکەی بەدرێژایی ژیانی هاوبەشیان شەڕو هەرای بەردەوام هەبووە، لەگەڵ ئەوەی کە نزیکەی ئەوە بۆ چل و پێنج ساڵ دەچێ بەیەکەوە دەژین و خاوەنی سێ منداڵن و هەموویان بۆ ماڵ و مێردی خۆیان ناردوون، کەچی ئەم ناکۆکی و دەمەقاڵێیەیان هەروەکو جاران بووە،گوایە شەوی ڕووداوەکەش هەر خەریکی دەمەدەم بوون و دراوسێکان تا درەنگانی شەوێ گوێیان لە هەراو هۆریاو حەوت و هەشتی ئەوان بووە، لەلایەکی دیکەوە، توێژینەوەی کارمەندان بۆ دۆزینەوەی شوێن پێی دزەکان لە گۆشەو کەناری ماڵەکە بە هیچ ئەنجامێ نەگەیشتبوو، هەموو ئەمانە دەبوونە جێی ئەوەی کە گومان لە ڕاستی قسەکانی فروزان بکەین و وەك تاوانباری یەکەم بیخەینە ژێر چاودێرییەوە.

بڕیار دەدەین دووای دە ڕۆژ فروزان ئاگادارکەینەوەو جارێکی دیکەو بێ ئەملاوئەولا ڕاستی ڕووداوەکەمان بۆ بگێڕێتەوە، هەڵبەتە لەم ماوەیە دۆسیەی منداڵانی خانەوادەکەش دەخەینە ژێرچاودێری و لێپرسینەوەوە، بێگومان ئەوانیش ئاماژە بە ناکۆکی و شەڕەدەمی بەردەوامی نێوان دایك و باوکیان دەکەن، هەر لەو دالغەو خەیاڵانەدا بووم کە دەرگای ژوورەکەم دەکرێتەوەو بە ڕێنمایی کارمەندانی پۆلیس فروزان دێتە ژوورەوە،سەراپا ڕەشپۆشە، باڵای پتر چەمیوەتەوە، بەرەو

ڕووم دادەنیشێ و چاوم لێدەبڕێت، نازانم غەمی بێ ئامان و شاراوەی قووڵی چاوانی حەسرەتباری پیرێژن چۆن چۆنی ڕاڤە بکەم.

تەنها پرسیارێ خەیاڵم ئازاردەدا کە: " ئایا ئەمە ڕێی تێدەچێ ئەم پیرێژنە غەماوی و تازیەدارە دەستی لە مردنی مێردەکەیدا هەبێ؟ " هەوڵدەدەم بە دەنگێکی ئارام و بێ پێشەکی بۆ ناو بابەتەکەم برۆم، بە درێژایی ئەم ماوەیە فروزان بێدەنگەو چاوی لە چاوم بڕیوە، سەرەنجام داوای لێدەکەم جارێکی دیکە و بەسەرنجی زیاترەوە ڕووداوی کوشتنی مێردەکەیم بۆ بگێڕێتەوە، پیرێژن وەك بڵێی لەم هەموو پرسیارو وەڵامانە ماندووبووە، بۆیە بە دەنگێکی گلەیی ئامێزەوە دەڵێت:

ـ ئەرێ من دەبێ چەند جار ئەم ڕووداوەتان بۆ بگێڕمەوە؟ پێشتر گووتم،چەند دزێکی لەخوا نەترس نیوەشەو هاتن و مێردی قوربەسەرمیان کوشت، ئێستا ئێوە چاوەڕێن چی تازەتان پێبڵێم؟ باوەڕبکەن زامی دڵم بەسوێیەو دیمەنی لینگەژەنەکانی ئەسغەر ساتێ چیە لەبەرچاوم لاناچن، بیرێك لە پیرێژنێکی نەخۆش وپەککەوتەی وەك من بکەنەوە، دەبێ ئەم هەموو ڕێگایە ببڕم و قسە دووبارەکانتان بۆ بڵێمەوە.

بە ڕوویەکی خۆشەوە دەڵێم:

ـ قسەکانت ڕاستن دایە گیان! بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە گومانمان لە یەك دوو کەس هەبوو کە،،،،،

فروزان لە خەیاڵی ڕاکردنی ئەم گێچەڵەیە بۆیە خێرا دەڵێت:

ـ هەڵبەتەگومانتان لە ئیبراهیمی کوڕی کاك ڕەزای بەرگدرووە،وەنیە؟ منیش پێموابوو ئەمە کاری ئەوبێ! ئەو شەوە توانیم کەمێ لە دەموچاوی ببینم، بەڵام تا ئەمڕۆ دڵنیا نەبووم، شك و گومان پتر ڕیشەی لە ناخما دادەکوتا، کەچی بەسەرخۆم نەهێناو گووتم:

- بەلاًم من هێشتاکە نەمگووتووە شکم لەکێیە! لەنێو قسەکاندا بیرمە جارێکیان پێتگووتین دزەکان سەروچاویان بەتەواوی داپۆشیبوو بەهیچ جۆرێ نەتدەتوانی بیانناسی! ئەی باشە لەکوێوە زانیت یەکێکیان ئیبراهیم بووە؟

پیرێژن بە ئاشکرا شڵەژانی پێوە دیاربوو بە لاڵە پەتیی دەیگووت:

- ڕاستیەکەی،،،،ئەو کاتەی کە خەریکبوو بەسەربانداا هەڵدەگەڕان تا ڕاکەن، لەپڕ کەمێك دەموچاوی یەکێکیانم دیت کە زۆر بە کاك ئیبراهیم دەچوو.

بە پارێزو هێمنیەوە قسەکەی پێدەبڕم:

- بەلاًم، لێکۆڵینەوەکانمان ئەوە دەردەخەن سەربانەکەتان بە کۆتایی هۆڵەوە بەسراوەتەوە و لە ناوەوەش قوفڵ بووە، تۆش لەگەڵ ئەسغەراغای خوالێخۆشبوو بەگوێرەی قسەکانی خۆت لە ژوورێکی دیکە دەست و قاچتان بەسترابۆوە، لێرە دوو پرسیاری گرینگ دێنە پێشەوە، گریمان ئەوان لەرێگای سەربانەکەوە ڕایانکرد وەك دەڵێی، ئەی ئێوە ئەوکاتە نەتاندەتوانی تەنانەت لەناو هۆڵەکەدا بیانبینن، چ پێویست دەکات لەوەختی پێداهەڵگەڕان لە دوواهەمین پلیکانە بیانبینن، ئەی چۆن تەنها ڕوخساری یەکێکیانت بینی؟ هەتا ئەگەر دزەکان لەم ڕێگایەشەوە ڕاکەن ئەی باشە کێ پاش ڕۆیشتنیان دەرگای داخستووەو قوفڵی کردووە؟ ئێوە بەجۆرێ بەستراونەتەوە نەخۆت و نە مێردەکەشت نەتاندەتوانی ئەم کارە بکەن، جەنابتان لە قسەکانی پێشوو گووتتان دزەکان هەموو ئاڵتوونەکانیان لەگەڵ خۆیان برد،باشە ئەگەر وایە ئەو سندووقە بچووکە پڕ لە زێڕو گەوهەرە لەو ژێر زەمینەدا چیدەکرد؟! ناکا دزە ئازیزەکان بەزەییان پێتان داهاتبێتەوەو بە ئەنقەست لەژێر زەمینەکەیان دانابێ؟! بارودۆخی ناو ماڵەکەشتان وەها نەبووە کە هاتنی دزی پێوە دیاربێ، بەڵکو تەنها ئەو ژوورەی تۆو مێردە قوربەسەرەکەت لێی خەوتبوون کەمێ بەسەریەکا درابوو، ئەمیش بەئاشکرا دیاربوو شانۆگەرییە! هەروەها ئەو شەوە دراوسێکانتان دەنگی هات و هاوارو شەڕە دەنوکی ئێوەیان گوێ لێبووە، بەلاًم نەهاوار، نە کۆمەك! یادز هاتووەیان نەبیستووە! دوواییش شەڕەچەقەی نێوان تۆو مێردەکەشتیان وادیارە بەلاوە ئاسایی بووە! کەچی ئەم

دەمەقاڵیە لەپڕ خامۆشدەبێ و نزیکەی پاش کاتژمێرێ، هاوارو قیژە یەك بەدووای یەکەکانی ئێوە ئەوان بۆ نێو ماڵەکەتان ڕادەکێشێ ئەوکاتەش تۆ لەپشت سەری مێردەکەت دەبینن! بۆیە بەم ئەنجامە دەگەین کە ڕووداوی هاتنی دز یا دزەکان بۆ ناو ماڵەکەتان داستانێکی هەڵبەسراوو درۆیە ئێوە بۆ سەرلێشێواندنی ئێمە دروستتان کردووەو مەبەستتانە هەڵمانخڵەتێنن، ئەمەش هەربۆخۆی بە تاوان لەقەڵەم دەدرێت، ئێستا بەم ڕوونکردنەوانە قسەیەکتان بۆ گووتن هەیە؟

فروزان بەدرێژایی ئەم ماوەیە هێمنی ڕوخساری خۆی پاراستبوو، کەچی من درکم بە لەرزینی بێ ئامانی جەستەی لاوازو دەستە ڕەق و تەقەکانی و ئاشوب و جەنجاڵی ناخی دەکرد، بەترس و نیگەرانیەوە خۆی ڕێك دەخاتەوەو بە دەنگێکی پڕ گلەییەوە دەڵێت:

- باشە مەبەستان لەم قسانە چیە؟ وادەزانن درۆم لەگەڵ کردوون و بە قسەی خۆتان ویستوومە فریوتاندەم؟

سەرم وەك نیشانەیەك بۆ بەڵێ با دەدەم.

- بەڵێ فروزان خانم! من خەریکە بەم ئەنجامە دەگەم کە تۆ دەستت لە کوشتنی مێردەکەت دا هەیە!

ئەم قسەیەی دووایيم وەك کوتکێکی قورس کە بەسەر جەستەی لاوازو بێ تینی فروزانی دا بکێشم وابوو، سەری بەتوندی بادەدا و لە کاتێ هەوڵ دەدات ئاسایی ڕەفتار بکات، بە دەنگێکی بەرزەوە دەڵێت:

- نا، نا! ئەم تاوانە گەورەیەچۆن دەوێرن بەسەرمندا بهێنن کە لە جێگای دایکتانم؟ باش بیربکەنەوە پیرێژنێکی شەست و سێ ساڵەی وەکو من کە ناتوانم هەتا بە ڕێگاشدا برۆم، چۆن دەتوانم ئەسغەراغا کە پیاوی ماڵەکەم بوو بکوژم؟ ئەم تۆمەت دانە پاڵەم بەهیچ جۆرێ قبوڵ نیە، جا ڕێزی خۆتان بگرن؟

- بزانە فروزان خانم! ڕێزی جەنابتان پارێزراوەو بەندە بەهیچ جۆرێ بێ ڕێزی بەرامبەرت نەکردووە! بەڵام ئەگەر تۆ لە جێگای ئێمە بوویتایە و هیچ پاشماوەو شوێن پێیەکی دزت نەدۆزیبایەوەو جێ پەنجەی تۆ بەسەر جەستەی کوژراوو

گوریسی پێچراوی لەشی بەجێمابێ و لەوە دڵنیابینەوە کە هی تۆیە بە چ ئەنجامێ دەگەیشتی؟ ئەگەر خۆتان سەرنجتاندابێ تاکو ئێستا سێ گێڕانەوەی جیاوازو لێك دوورتان لەبارەی ئەم ڕووداوەوە بە من یا هاوکارم گووتوە، ئەم لەیەك دوورییەی قسەکانت هەر خۆی بە ئاشکرا دیارە کە درۆیە،ئێستا بە کامە قسەتان باوەڕ بکەین؟ ئەگەر بەڕاشکاوی دانی پێدابنێیت و بێ کەم و زیاد ڕاستیەکەمان بۆ بگێڕیتەوە، ئەوا تاوانەکەت سووکتر دەبێ وە من بەڵێنیشتان پێدەدەم هەوڵ و کۆششم بۆ سووککردنی تاوانەکەتان لە ڕێگای یاساییەوە بخەمە کار، ئێستا ئامادەی هاوکاریمان بکەی؟

لێرەدا دووا ئەڵقەی بەرگری فروزان دەشکێت و خەرمانەیەك لە گوناه ڕووی ماندوو پڕ چرچ و لۆچی دادەپۆشێت.

- ئاخر چۆن بڵێم؟ من هەرگیز نەمدەویست ئەم ڕووداوە بقەومێ،،،

دەستدەکا بە گریانێکی سووتێنەر، چەند خولەکێ دوواتر،بەچاوانی غەمبارو سیمایەکی غەمگین و تێکشکاو چیرۆکی پڕ غەمی ژیانی دەگێڕێتەوە:

- هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە کە بە زۆری دایك و باوکم شووم بە ئەسغەراغا کردووە، زانیم هیچ هەست و خۆشەویستیەکم بۆی نیە، لە زۆر ڕووەوە پێچەوانەی من بوو، زۆری خۆشدەویستم و هەوڵی دەدا بەهەر شێوەیەك بێ دڵی من بەدەست بێنێ و وام لێبکا خۆشم بوێ، دیاری گرانبەهای بۆ دەکڕیم، هەر مانگەو سەفەرێکی بۆ مەشهەد یا قوم یا هەر جێگایەکی دیکەی گەشت و گوزار پێدەکردم، کەچی بەداخەوە خۆشەویستی نابێ بەزۆر بخرێتە دڵی مرۆڤەوە، هەرچەندجاری ئەو قوربەسەرە دەگەیشتە من دەستەو سینە لەبەردەمم دەچەمایەوەو ڕاست دەبۆوە، ڕۆژبە ڕۆژ بەرەو ڕووی زیاتری بێ میهری و خۆشەویستی من دەبۆوە، کاتێ دووەمین منداڵمان بوو، دوواجار لە ڕەفتارە ساردەکانم ماندوو بوو بە هات و هاوار بەڵێن و خۆشەویستی چەند ساڵەی ئەویش هەڵوەشاندەوە و هەموو ڕۆژ دەستی بە بێ ڕەووشتی دەکرد، وام هەستدەکرد کەسێکی دیکەیە، بە تێپەڕینی ڕۆژگار تێگەیشتم کە چەند ژنێکی دیکەشی بۆ ماوەی کاتی هێنابوو، کە ئەمەم بیست

وەك ئەوە وابوو لەسەربان بەرمدەنەوە، بەڵام بەڵگەیەکم نەدەدیت تا بە دووی مەسەلەکەدا بچم، هیچ خۆشەویستیەکمان لەنێواندا نەبوو، تا کاتێ منداڵەکانمان لەخەم دەرچوون و بە خۆشیەوە بەرەو ماڵ و حاڵی خۆیان چوون، ئێمە هەروەکو خۆمان بووین و بچووکترین بیانوو وای لێدەکردین بەسەر یەکتردا هاواربکەین و مێشکی یەکدی ببەین، منداڵەکانمان هەموو خوێندەواربوون، چەندین جار ئامۆژگارییان دەکردین کە ئەم جۆرە ڕەفتارانە لەگەڵ ساڵ و تەمەنتان ناگونجێن و جوان نیە بۆ ئێوە، ئەگەر نەوەکانتان ئەم شەڕو هەرایەتان ببینن ئەوانیش لێتان فێردەبن،،،،بەڵام کوا گوێ بۆ بیستن؟! هەر خەریکی ئەوەبووین کەمتەرخەمی و بیانوو بخەینە ئەستۆی یەکەوەو ئەوەندە هۆش و هەستەمان نەبوو کە ئەم شەڕە دەنوك و چەقە چەقەیە خۆشی و شادی هەمیشەیی لە ژیانمان دەبات و ئابڕوومان لەبەردەمی دراوسێکانیش دەچێت! ئەم بارودۆخە هەروامایەوە تا ئەو شەوە تاڵ و تاریکە هات،،،،

ئەو شەوە ڕەنگە ئەوە یەکەمین جاربێ دووای هاوسەرگیریمان بەجووتە لەسەر یەك سفرە دابنیشین، ئەسغەر  پێدەچوو دڵی خۆشبێ بۆیە دەیویست گاڵتەم لەگەڵ بکاو بمهێنێتە پێکەنین، بەڵام نەفرەت لەو لەخۆبایی بوونە بێمانایەی من کە ڕێگرم دەبوو لەوەی ڕوویەکی خۆشی پێ نیشان بدەم! تەواو لەبیرم نیە چی بوو کە وایکرد باس بێتە سەر ژیانی ڕابردوومان و منیش کەوتمە تانە لێدانی: " بڕۆ ئەم گاڵتانە لەگەڵ ژنەکانی دیکەت بکە! " ئەسغەراغا چاوەڕوانی قسەیەکی وەهای نەدەکرد لێم، ئاگری لە چاوی دەباری و هاواریکردو گووتی: " ئەم هەموو ساڵە بێ ڕێزی و بێ ڕەوشتیت بەرامبەرم کرد نوقەم لێوە نەهات، ئێستاکە چۆن ڕووتدێ تۆمەتێکی وەهام بخەیتە پاڵ؟! " بەکورتی،،،دووبارە کەوتینەوە شەڕەچەقەی خۆمان و سات بە سات دەنگمان بەرزتر دەبۆوە، وا گەرم داهاتبووین ئاگامان لە تێپەڕینی کات نەمابوو، کەچی،،،،

خوا لە ئەسغەراغا خۆشبێ، من ژنێکی زۆر خراپ بووم بۆی، ئەویش لەم شەڕو ناکۆکیانە ماندوو ببوو هەوڵی دەدا ئارامم بکاتەوە، کەچی من هەر نەمدەبڕیەوە،

لە ساتێکدا نەمزانی چی قەوما، بە هەموو هێزی خۆم پاڵێکم بۆ دوواوە پێوەنا و قیژاندم: " برۆ ونبە! چیدی نامەوێ بتبینم!" ئەویش هێزی تێدا نەمابوو سەری بە دیوار کەوت، هاوارێکی توندی لە قووڵایی ڕۆحیەوە کرد، ئەمە منی ترساند،کەچی بێ ئەوەی بگەڕێمەوە سەری بۆ سەر جێگای خەوم ڕۆیشتم، چەند ساتێ تێپەڕی و ئارام بوومەوە، بینیم ئەسغەر هیچ دەنگێکی لێوە نەدەهات، کەمێ نیگەران بووم و بە سۆراغیەوە چووم، بەڵام خوایە کەس نەیبینێ،،،،سەرنجمدا هەر لەم گۆڕە بێ جووڵە کەوتووە، ڕەنگی دەموچاوی وەك مردووان سپی بووە، ئیدی بەڕاستی ترسام و شڵەژام، بۆ لای ڕامکردو چەند جارێك بانگم کرد و ڕامتەکاند، لێی پاڕامەوە کە قسەیەك بکات،بەڵام بەداخەوە نە جووڵەیەك نە ئاماژەیەك هیچم نەدیت، هێشتاش نەمدەویست باوەڕ بکەم کە مردووە! کەچی کاتێ گوێم بە دڵیەوە نا هیچ ترپەیەکم نەبیست، ئینجا دەستم لەسەر دەمی دانا هەستم بە گەرمی هیچ هەناسەیەك نەکرد، ئەوکاتە تێگەیشتم چ قوڕێکم بەسەرمدا کردووە! بۆ هەتایە چاوانی لێکنابوو، بۆ چەند ساتێك مات و ئەبڵەق بووم،نەمدەزانی کە دەبێ چیبکەم، بەڵام نەفرەت لە شەیتان کە هەر لەم کاتانە بۆ سۆراغی مرۆڤ دێت، یەکێ لە ناخمدا دەیگووت، ئێستا کە ئەمە ڕوویداوە دەبێ شانۆگەرییەك ڕێکخەی تا کەس گومانی بۆ ئەوە نەچێ تۆ کوشتووتە! پێویستە کارێك بکەی تا هەموو باوەڕ بکەن لەم بەینەدا تۆ بێ گوناهی! هەر ماوەیەکە ئەمیش بەسەردەچێ و تەواو دەبێ، تۆش ئەو وەختە دەتوانی ئەو تەمەنەی ماوتە بەبێ شەپۆهەراو ئارام بەسەر ببەیت! یەکەم شتێ کە بە خەیاڵمدا هات پلانی دزی بوو، ئیدی خۆم دووانەخست، بەپەلە بۆ زێڕو ئاڵتوونەکانم چووم، هەموو ئەوانەی ئەسغەری خوالێخۆشبوو بۆی کڕیبووم! لەناو ئەو سندووقۆکەیەم دانان کە بینیتان، ئینجا بردم و لە سووچێکی ژێر زەمینەکە شاردمنەوە تا لە دەرفەتێکدا دووبارە بچمەوە سەریان، دووایی دوو گوریسی پتەوو قایمم لە ژێر زەمین هێنایەدەر، یەکێکیان گەورەتربوو لە دەوری باڵایی وئەویدیکەشیان لە قاچیەوەم پێچاو گرێمدا، تا ئاستێ خۆم زانیم پەتەکانم شل بەستووە، بەڵام لەو

ساته قورسانه خەیاڵم لەوە زیاتر بڕی نەدەکرد، دەست و دڵم توند توند دەلەرزی و خەریکبوو لە ترسان هەناسەبڕکە دەبووم! لەدووای ئەم کارە بۆ هەمان ژوور چوومەوە کە شەڕمان لێکردبوو، هەموویم بەسەر یەکادا، وەختێ لە هەموو شتێ دڵنیابوومەوە کە هیچ کەسێ باوەڕ ناکات پیرێژنێکی وەکو من بە کاری کوشتن هەستابێ، دەستم بە هاوار هاوار کرد و دراوسێکانم بەئاگا هێنایەوە، ئەوەی لە ڕووداوەکەش ماوە خۆتان دەیزانن! !

فروزان بێدەنگ دەبێ، چاوانی لە فرمێسک تەڕبووەو نیگای لە بەرامبەری بڕیوە، پێدەچوو بیر لە ساڵانی خۆڵەمێشی ژیانی هاوبەشی بکاتەوە کە چۆن بەفیڕۆ چووە و بەم ڕاستیە شووم و تاڵە کۆتایی هاتووە، ڕەنگە هێشتاش دیمەنی لاشەی بێ گیانی مێردەکەی هەر لەبەرچاوبێ، ڕەنگە،،،ڕەنگە هێشتا باوەڕی بە مەرگی هاوبەشی ساڵانی تاڵ و شیرینی تەمەنی نەکردبێ، مەرگێ کە نەیویستووە بە دەستی ئەو ئەنجام بدرێ، نەمدەزانێ چی بڵێم و چ کاردانەوەیەك پیشاندەم، لە خەیاڵمدا بەدووای وشەی هێمنکەرەوەو دڵنەوایی دا دەگەڕام، بەڵام کاتێ چاوم بەم پیرێژنە پشت چەماوە دەکەوت کە وەك کەشتیەکی تێکشکاوو بێچارە لە تۆفاندا دەمبینی ڕێگای هەموو جۆرە قسەیەکی بەڕوومدا دادەخست، تەنها بەسەرچوونی ڕۆژگار دەیتوانی وام لێبکا بڕوا بەم داستانە غەمگینە بکەم، ئەم هەموو ساڵە شەڕو لێك تێنەگەیشتنە، ئەم هەموو ڕۆژە تاریکەی پشت هەورە ڕەشەکانی بەدگومانی، ئەم هەموو کاتە بێ مەیلی و دڵ مردوویی و غەمگینیە بەهۆی هەست پێنەکردنی یەکتر دەبێ چۆن باوەڕ بکرێ؟!

زمانم لە زاردا دەخولایەوە تا هەموو ئەم پرسیارانە لە فروزان بپرسم، بەڵام تەنها ئەم دوو قسەیەم لە دەمدا هاتەدەر:

- ئاخر بۆچی فروزان خانم؟! بۆچی دایە گیان ئێوە بۆچی؟!

فروزان لە بێدەنگیەکی ئازاردەر سەری داگرت و ناڵە دەکات، لەجێی خۆم هەڵدەستم و لە پەنجەرەوە چاو لە ئاسمانی هەورین و دڵگیری زستان دەبڕم، چەند ساتێ دوواتر بروسکەیەك لێدەداو دەنگ و گرمەی لە بۆشایی ئاسماندا

زایەڵەی دێ، دڵۆپەکانی باران هاوشێوەی پەنجە بە تواناکانی هونەرمەندێکی شارەزا بەسەر شووشەدا دەخلیسکێن و سەدای باران گوێیەکان دەلاوێنێتەوە، بەڵام ڕەنگە ئەم سەمفۆنیا خۆشە بۆ فروزان پڕیشکێ بێ تا ڕق و کینەی بکاتەوە، دەنگی گریانی بەرزدەبێتەوەو دڵم دێنێتە ژان، وای بەباش دەزانم تەنها لەبەر باران جێی بێڵم تا غەمی گەیشتنی خەزانی ژیانی بێ خۆشەویستی لەگەڵ دڵۆپە پاکەکانی باران و فرمێسکی دڵنەوایی ئیدی بۆ هیچ کەسێ دووبارە نەبێتەوە، بۆ هیچ کەسێ!!

# ژیاننامەی نووسەر

حاجی غولامرەزا ئیسماعیلی (ئەفسەری خانەنشینی پۆلیس) یەکێکە لە وەرزشکارو ڕاهێنەرو شارەزاو نوسەران و گیان لەسەردەستانی پارێزگای کرمان، پاڵەوانی پێشووی بۆکسێن و سەرپەرشتیاری فەرمی فیدراسیۆنی کۆماری ئیسلامی ئێران بووە لە بەشەکانی بۆکس ـ خۆپارێزی لە کەسی بەرامبەرو هندبال*، چەندین دەیەی تەمەنی وەك ڕاهێنەری وەرزش لەسەر ئاستی کرمان بەسەربردووەو چالاکی بەرچاوی بۆ پەروەردەکردنی نەوەی تازەی کۆمەڵگا هەبووە، ساڵانەش وەك سەرۆکی گرووپە وەرزشیەکانی باسکتبۆڵ، هندباڵ و بۆکسی شاری زرند و بەڕێوەبەری یانەی فەرهەنگی وەرزشی زرند ئەرکی خۆم بەجێهێناوە، لە چاپەمەنیەکانی وڵاتدا هەمیشە بەرهەمم بڵاوکردۆتەوە بۆ نموونە لە ژێر ناونیشانی داستانە پۆلیسیەکانی تاوان لە ڕۆژنامەکانی ٧ ڕۆژی ژیان (خوێندنەوەی دۆسیەیەکی تاوان) گۆڤاری ڕێگای ژیان (داستانی درێژی خەڵکی ئەمڕۆ) گۆڤاری گەنجانی ئەمڕۆ (عیبرەت) و ڕۆژنامەی (امین جامعە) و ئاسمانی کرمان و، دوو بەرگ لە کتێبەکانی داستانی (پۆلیسی تاوان) بە ناوی (مکافات) و (ئەمشەو زاوایەك دەمرێت) بە چاپ گەیشتووەو شێوازی ناسکی زمانەکەی وایکردووە هەوادارانێکی زۆری هەبێ و ئێستاش بەرگی سێیەمی کتێبی پۆلیسی تاوان (بکوژان دەگریەن ) بەچاپ گەیشتووەو بەم زووانە بەرگی چوارەمی کتێبی پۆلیسی تاوان (غروب عاگفەها) لەلایەن هەمان نووسەرەوە لە ئایندەدا بڵاودەبێتەوە،

*هندبال: یارییەکی وەك فوتبۆڵە بەدەست تۆپەکە دەهاوێن،